# بنەماکانی کۆمەڵناسی

**مەنسوور وسووقی**

(ئەندامی لیژنەی زانستی زانکۆی تاران)

**عەلی ئەکبەر نیک خولق**

(ئەندامی لیژنەی زانستی زانکۆی ئازادی ئیسلام)

**وەرگێڕانی**

**سیروان محەمەد حاجی**

**هەولێر - ٢٠١٣**

ئەم كتێبە وەرگێڕدراوی ئەمەی خوارەوەیە:

**مبانی جامعەشناسی**

منصور وثوقي (عضو هيئت علمی دانشگاه تهران)

علی اكبر نيك خلق (عضو هيئت علمی دانشگاه آزاد اسلامی)

چاپ هفدهم ـ تهران ١٣٨٦

**خانەی موكريانی بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە**

- **بنەماكانی كۆمەڵناسی**
- مەنسوور وسووقی ـ عەلی ئەكبەر نیك خەڵق
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: سیروان محەمەد حاجی
- نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر
- بەرگ: جێگر عەبدولجەبار
- نرخ: (4000) دینار
- چاپی یەكەم: 2013
- تیراژ: 1000 دانە
- چاپخانە: چاپخانەی موكریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردنی (168) ساڵی (2013)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی كتێب (726)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

**پێشەکی** .................................................................................... **7**
**بەشی یەکەم ـ** مێژوویی کۆمەڵناسی .................................................................13
**بەشی دووەم ـ** کۆمەڵناسی وەك زانستێك ..........................................................51
**بەشی سێیەم ـ** کۆمەڵگەی مرۆیی.....................................................................67
**بەشی چوارەم ـ** کۆمەڵگەی مرۆیی ...................................................................81
**بەشی چوارەم ـ** دوایین باس (کۆتایی) ...............................................................81
**بەشی پێنجەم ـ** میتۆدەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا ...........................................97
**بەشی شەشەم ـ کولتوور** ..............................................................................125
**بەشی حەوتەم ـ دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان**.......................................................159
**بەشی هەشتەم ـ گرووپە کۆمەڵایەتییەکان** .........................................................171
**بەشی نۆیەم ـ خێزان و خزمایەتی** ..................................................................187
**بەشی دەیەم ـ بەهاکان و نۆرەکان و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی** ....................................211
**بەشی یازدەیەم ـ رۆڵ و پێگەی کۆمەڵایەتی** .......................................................225
**بەشی دوازدەیەم ـ بزاوتی کۆمەڵایەتی** ..............................................................237
**بەشی سێزدەیەم ـ توێژبەندی و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان** .................................249
**بەشی چواردەیەم ـ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان** .................................................271

## پێشەکی:

ئەو کتێبەی ئێستا لەبەر دەستتان دایە، بەرهەمی هەوڵ و کۆششێکە کە لە ماوەی ساڵانێکی دوورودرێژی کاری توێژینەوە و وانەوتنەوە لە بواری کۆمەڵناسیدا دراوە و ئامانج ئەوەیە کە بتوانین کتێبێك وەك بنەمای خوێندنی زانکۆیی لەم لقە زانستییەدا پێشکەش خوێندکارانی ئازیز بکەین.

لەو کاتەوە کە یەکەمین کتێبی کۆمەڵناسی لەژێر ناوی علم الاجتماع ( کۆمەڵناسی) لە ساڵی ١٣٢٢ی هەتاوی لە لایەن خوالێخۆشبوو دوکتۆر یەحیا مەهدەوی لە ئێران بڵاوکرایەوە، هەتا ئێستا کتێبی جۆراوجۆر لە بواری کۆمەڵناسیدا چاپ و بڵاوکراونەتەوە کە هەر یەکێکیان لە ئاشناکردنی خوێندکاران بەم زانستە نوێیە و پەرەپێدانیدا بایەخی تایبەت بە خۆیان هەبووە، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم هەنگاوانە لەگەڵ ئەوەی کە فرە و فرەچەشنن، بەڵام نەیانتوانیوە پێویستیی کەسانێك کە هۆگرییان بە وەدەسهێنانی زانیاریی لە بواری زانستی کۆمەڵناسیدا هەیە، پڕ بکەنەوە و لە درێژەدانی کار و زیادکردنی زانیارییەکانیاندا هاندەر و ڕێ نیشاندەریان بن.

لەم پێشەکییەدا دەرفەتی ئەوە نییە کە لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی هەر کام لەم کتێبانە لێك بدەینەوە، بەڵام ئەوەی کە لە ماوەی ساڵانێك وتنەوەی بنەماکانی کۆمەڵناسی لێی ئاگادار بووینەوە ئەوەیە کە زۆرجار خوێندکارانی ئەم بابەتە بە تایبەت خوێندکارانی بەشەکانی غەیری زانستە کۆمەڵایەتییەکان کە ناچار بە خوێندنی وانەی بنەماکانی کۆمەڵناسیین، نارەزایەتی خۆیان لە نەبوونی کتێبی زانکۆیی گشتگیر، ڕێکوپێك و ئاسان و بێ پەراوێزی ناڕوون و لێڵ دەربڕیوە.

وادێتە بەرچاو کە خوێندکارانی لقە زانستییەکانی دیکە لەم بوارەدا زیاتر تووشی ناڕوونی و کێشە دەبنەوە هەتا خوێندکارانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، چونکە ئەوان لە تەواوی ماوەی

قۆناغی چوارساڵەی بەکالۆریۆسدا ( کارگێڕی، ژمێریاری، دەروونناسی و ...) تەنیا لە ڕێگەی خوێندنی بابەتی بنەماکانی کۆمەڵناسی ئاشنای پێناسە، چەمك، سنوور و لق و ناوەڕۆکی ئەم زانستە بەربڵاوە دەبن. لە حاڵێکدا خوێندکارانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە ماوەی ئەم چوارساڵەدا، زۆر بابەتی وەك: تیۆرییەکان، میتۆدەکانی توێژینەوە، کۆمەڵناسیی چینەکان و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان، کۆمەڵناسیی خێزان، کۆمەڵناسیی گوندنشینی و لقەکانی دیکەی کۆمەڵناسی دەخوێنن هەر بۆیە ئەگەر لە ماوەی خوێندنی بابەتی بنەماکانی کۆمەڵناسییش شارەزای زۆر چەمکی پەیوەندیدار بە بنەماکانی کۆمەڵناسی نەبن، لە ماوەی ئەم چوار ساڵەدا دەتوانن شارەزایی پێویست بەدەست بێنن.

دیارە لێرەدا مەبەست قسەکردن لەسەر بەرنامەی زانکۆیی و ئەمە کە چ دانراوە و چ دانەنراوە نییە، بەڵکوو تەنیا کارێك کە لەدەست ئێمە دێت، ئەوەیە کە لانیکەم لەژێر ناونیشانی بنەماکانی کۆمەڵناسیدا بابەتگەلێك بگونجێنین کە خوێندکارانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە گشتی و خوێندکارانی لقە زانستییەکانی دیکە ئاشنای زانستی کۆمەڵناسی، پەیام و گرینگییەکەی بن و بۆ خوێندنەوەی هەمەلایەنە و بنەڕەتی تر هۆگریی و حەزی زیاتر بجوڵقێنێ.

بابەتەکانی ئەم کتێبە لە ١٤ بەشدا ڕێك خراون. لە بەشی یەکەمدا لەژێر ناونیشانی مێژووی کۆمەڵناسی، سەرەتا قسە لەسەر هزرە کۆمەڵایەتییەکانی پێش کۆمەڵناسی بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکان، قۆناغەکانی شارسازی، عەقڵانییەت، فەلسەفەی مێژوو و بەدوای ئەویشدا بەستێنە کۆمەڵایەتییەکانی پەیدابوونی کۆمەڵناسی وەك زانستێك و سەرەنجام پانتایی ئەم لقە زانستییە دەکرێ.

لە بەشی دووەمدا کۆمەڵناسی وەك زانستێك باسی لێوە دەکرێ، سەرەتا خوێندنەوە و لێکدانەوە بۆ چەند پێناسەیەك لەم زانستە دەکرێ و سەرەنجام پێناسەیەکی تەواو و گشتگیر لەم زانستە دەخرێتەڕوو. دوای ئەویش قسە لەسەر دیاردەی کۆمەڵایەتی و تایبەتمەندییەکانی دەکرێ و لە کۆتاییشدا باسی دابەشکردنی کۆمەڵناسی لە باری ئامانج، شێواز، بابەت و سنووری توێژینەوەی دەکەین.

بەشی سێیەمی کۆمەڵناسی بۆ باس لە پەیوەندیی کۆمەڵناسی و زانستەکانی دیکە تەرخان کراوە.

کۆمەڵگە کە کۆمەڵە پەیوەندییەکی مرۆییە، یەکێك لە بابەتە گرینگەکانی ئەم کتێبەیە کە لە بەشی چوارەمدا باسی دەکرێ. لەم بوارەدا سەرەتا پێناسەیەك لە کۆمەڵگەی مرۆیی دەخرێتەڕوو، دوای ئەویش ماهییەت و ئاخێزگەی کۆمەڵگە و سەرەنجام تیۆرییەکانی کۆمەڵناسان لەمەڕ جۆرەکانی کۆمەڵگە تاوتوێ دەکرێن.

هەرچەند میتۆدەکانی توێژینەوەی کۆمەڵناسی بابەتی کتێبێکی جیاوازن، لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا وێڕای باسکردنی ڕێگاکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا، قۆناغەکانی توێژینەوە، چۆنییەتی ڕێکخستنی فیشەکانی توێژینەوە لە دیراساتە تیۆرییەکان، دیاریکردنی کێشە، ڕێکوپێك کردنی گەلاڵەی توێژینەوەکە و خستنەڕووی گریمانە، میتۆدەکانی توێژینەوە و پۆلێنکردن و ڕوونکردنەوەی زانستی قسە کراوە و خوێندکاران دەتوانن بۆ کاری توێژینەوەی پراکتیکی کە بە مەبەستی تەکمیل کردنی هەندێك لە بابەتە تیۆرییەکان ئەنجام دەدرێن سوودی لێ وەرگرن و هەروەها لە ئامادەکردنی نامیلکەی خوێندندا پەنای بۆ بەرن.

یەکێك لە گرنگترین بابەتەکانی کتێبەکە کولتوورە. دەربارەی گرینگیی کولتوور دەگوترێ کە کولتوور بۆ ئینسان وەك ئاو بۆ ماسی وایە. کاتێك ئاو لە ماسی ببڕن، ماسی دەمرێ. هەر بەم شێوەیە ئەگەر کولتوور لە مرۆڤ بستێنرێتەوە، مرۆڤ ناتوانێ درێژە بە ژیانی خۆی بدات. کولتوور لە تایبەتمەندییەکانی ژیانی مرۆییە و خاڵی جیاوازیی ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵە. ئاژەڵەکان بێ کولتوورن بەڵام مرۆڤی بێ‌کولتوور بوونی نییە. لە باسی کولتووردا، سەرەتا قسە لەسەر زاراوەی کولتوور و پەرەسەندنی ماناکەی و دواتر کۆمەڵناسیی کولتوور لە لایەنی جۆراوجۆر: وەسفی، مێژوویی، نۆرمی، دەروونناسی، پێکهاتەیی و ژێنێتیکیی کولتوور بە خستنەڕووی نموونەی جۆراوجۆر کراوە. بە دوای ئەمەدا کولتوور خاڵی جیاکەرەوەی ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ، تایبەتمەندییەکانی کولتوور، کولتووری ماددی و نامادی، وەرگرتنی کولتوور، دواکەتنی کولتووری، وردە کولتوور، ڕێژەیی کولتووری، ئێتنۆسەنتەریزم و ... تاوتوێ و شرۆڤە دەکرێن.

دامەزراوەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵە پەیوەندییەکی ڕێکوپێك و بەردەوامە کە لە لایەن کەسانێکەوە کە بەرعۆدەیانن ئەنجام دەدرێ و بۆ کەسانی دیکە دەگوازرێتەوە و لە درێژەی زەمەندا بەردەوام دەبن. لەم بەشەدا باس لە دامەزراوە بە واتا کۆمەڵناسییەکەی، دامەزراوە سەرەکی و لاوەکییەکان و تایبەتمەندییەکانیان، پێکهاتە و ئەرکی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و گرینگیی دامەزراوە کراوە.

بەشی هەشتەم بۆ باس لە گرووپە کۆمەڵایەتییەکان تەرخان کراوە کە سەرەتا لە چۆنییەتی پێکهاتنی گرووپی کۆمەڵایەتی، پێناسەی گرووپی کۆمەڵایەتی و جیاوازی لەگەڵ شێوەگرووپ، جۆرەکانی گرووپی کۆمەڵایەتی، گرووپی سەرەتایی بە تایبەتمەندییەکانی کە لەسەر بنەمای پەیوەندیی سۆزداریی نێوان تاکەکانی گرووپە و گرووپی دووەمین کە پەیوەندیی نێوان تاکەکانی وشك، فەرمی و حیسابکراوە، تاوتوێ دەکرێن. لەم بەشەدا هەروەها قسە لەسەر گرووپی ژێدەر و گرووپی گوشار کە لە گرووپە کۆمەڵایەتی ـ سیاسییەکان لە کۆمەڵگە ئەمڕۆییەکاندا دێنە ئەژمار، کراوە.

خێزان و خزمایەتی لەو بابەتە گرینگانەن کە لە کۆمەڵناسی و ئەنترۆپۆلۆژیادا باسیان لێوە دەکرێ. خێزان یەکێك لە دامەزراوە سەرەکییەکان و بەجێی خانەکانی ئۆرگانیزمی کۆمەڵگەیە. گرینگیدانی کۆمەڵناسان بە کۆمەڵگە لەم بارەوە بایەخدارە کە ئەمڕۆکە بە هۆی گۆڕانگارییە کۆمەڵایەتییەکان، خێزانەکان تووشی ئاڵوگۆڕیی توندی خەسارناسانە بوونەتەوە بەتایبەت لە کۆمەڵە ڕۆژئاواییەکان لەگەڵ ئەوەی کە لە لایەن حکومەتەکانەوە گرینگیی زۆری پێدەدرێ، خەریکی لێك هەڵوەشانە. باسی خێزان بە خستنەڕووی پێناسەیەك لە خێزان دەست پێدەکا و بەدوای ئەوەشدا باسی ئاخێزگەی خێزان، پەرەسەندن و گۆڕانکارییەکانی، جۆرەکانی خێزان و خزمایەتی لە جیهانی ئەمڕۆییدا و ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە ئەرکەکانی خێزاندا پێك هاتووە و هەروەها خێزان لە شار، خێزان لە گوند تاوتوێ دەکرێن و باسیان لێوە دەکرێت.

لە بەشی دەیەمی کتێبەکەدا قسە لەسەر بەهاکان، نۆرمەکان و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی کراوە. دیراسەکردنی بەها کۆمەڵایەتییەکان بە تایبەت لەم ڕوانگەوە کە لە جیهانی ئێستاماندا گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتووە، بایەخی زۆری هەیە. ئەمڕۆکە تەنانەت لە خێزانیشدا، بەهاکان تووشی دژوازی و دژبەیەکین. بەهاکانی دایك و باوکەکان لە زۆر بابەتدا لەگەل منالەکانیان جیاوازن. هەر بەم شێوەیە ڕیزبەندی نۆرمەکانیش تووشی گۆڕان بۆتەوە. لە کۆمەڵگەکانی لە حاڵی گۆڕاندا کە بواری خەسارناسانە دێتە کایەوە، جاری وایە دەبینرێ کە دژەنۆرمەکان بە نۆرم لەقەڵەم دەدرێن و تاکە ناشایستەکان پاداشت وەردەگرن و سەرەنجام لە کۆتایی ئەم بەشەدا، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی کە وەك هێزی مەعنەوی لە کۆمەڵگەدایە، تاکەکان لە ڕێگەی پاراستن و جێبەجێکردنی نۆرمەکۆمەڵایەتییەکان کۆنترۆڵ دەکات. لەم بەشەدا هەروەها باسی جۆرەکانی نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکان و هێنانەوەی چەند نموونەیەك دەکرێ.

له بەشی یازدەیەمدا باس لە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و پێگەی کۆمەڵایەتی دەکەین و وێڕای پێناسەی ڕۆل و پێگەی کۆمەڵایەتی، جۆرەکانی ڕۆل و پێگەی کۆمەڵایەتی، هەروەها دژبەیەکی و دژایەتی ڕۆڵەکان لە کۆمەڵگە و خێزان و ئەو کاریگەرییانەی کەلەسەر کۆمەڵگە و خێزانی دایدەنێن، باسیان لێدەکرێ. بزاوتی کۆمەڵایەتی واتە گواستنەوەی تاك لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ پێگەیەکی دیکە یەکێك لە بابەتە سەرنجڕاکێشەکانی ناو کتێبەکەیە کە بەشی دوازدەیەمی بۆ تەرخان کراوە. لەم بەشەدا وێڕای پێناسەی بزاوتی کۆمەڵایەتی، جۆرەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی، پێوەرەکان و تایبەتمەندییەکانی ڕوون دەکرێنەوە و باسی کۆمەڵگەی کاستی کە بزاوتی کۆمەڵایەتی تێیدا مەیسەر نابێت و کۆمەڵگەی فیۆدالی و دەرەبەگی کە بزاوتی کۆمەڵایەتی تێیاندا دژوارە و کۆمەڵگە ئەمڕۆییەکان کە بە هۆی گۆڕانکارییە پێکهاتییەکان بزاوتی کۆمەڵایەتی زیاتر تێیاندا دێتەئاراوە، قسەیان لەسەر دەکرێ.

له بەشی سێزدەیەمدا چینی کۆمەڵایەتی، تایبەتمەندییەکانی توێژبەندیی کۆمەڵایەتی و بیروڕای کۆمەڵناسان دەربارەی چینەکان و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان تاوتوێ و شرۆڤە دەکرێن.

بەشی چواردەیەمی کتێبەکە تایبەتە بە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، کە بابەتێکە بە تایبەت لەم ڕوانگەوە کە کۆمەڵگەی ئێمە ئێستاکە لەبەردەم گۆڕانکارییە خێراکانی کۆمەڵایەتی دایە، جێگەی بایەخ و گرینگی پێدانە. لەم بەشەدا قسە لەسەر گۆڕانی کۆمەڵایەتی، فاکتەرە کاریگەرەکان لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان و هەروەها ڕای بیرمەندانی کۆمەڵایەتی و... لەم بارەوە دەکەین.

له نووسین و ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا هەوڵمان داوە کە چەمکەکانی کۆمەڵناسی بە سادەیی باس بکرێن و بۆ تێگەیشتنی دروستی چەمکەکان لە نموونەگەلی سادەی پەیوەندیدار بە کۆمەڵگەی ئێران کە لەبەرچاوی هەمووان دایە، کەڵك وەرگیراوە. هیوادارم کە بە بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە پێویستیی خوێندکارانمان لەم بوارەدا دابین کردبێت.

**مەنسوور وسووقی ـ عەلی ئەکبەر نیك خولق**

# بەشی یەکەم

## مێژووی کۆمەڵناسی:

ئەو شوێنەوارانەی کە لە سەردەمانی ڕابردووی ژیانی مرۆڤ بەجێماون، دەرخەری ئەوەن کە مرۆڤ بەردەوام گرینگیی بە ڕێکوپێکیی کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان داوە و بۆ باشترکردنی ڕەوشی ژیانی خۆی لە باری ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و دادوەری کاری بۆ دانان و دارشتنی یاساکان کردووە.

گاستۆن بۆتۆل (Gaston Bauthoul) کۆمەڵناسی هاوچەرخی فەڕەنسی دەڵێ: " لە هەر کۆمەڵێکدا جۆرە کۆمەڵناسییەکی شاراوە کە زۆر بە دەگمەن سەرنجی بۆ دەدەرێ، بوونی هەیە. ئەم زانستە تەنانەت لە ڕێکخستنی سەرەتاییترین و ناشارستانیترین و بەرتەسکترین گرووپە مرۆییەکانیش بە شێوەی شاراوە گونجێنراوە، وەك ئەوەی بنەماکان و یاسا و ڕێساکانی ڕێکخستنی خێزانی و کۆمەڵایەتی هەر کۆمەڵگەیەك کەم تا زۆر سەرچاوەگرتوو لە ژمارەیەك بنەما و چەمکە ئاشکرا و بەڵگە نەویستەکانە".[(١)]

بە درێژایی مێژوو، بیرمەندان و ڕیفۆرمیستە کۆمەڵایەتییەکان کە لە بەڕێوەبردنی کاروبار و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەدا بەرپرسایەتی و ڕۆڵیان هە بووە یان دەرحەق بە مەسەلە و بابەتە کۆمەڵایەتییەکان هۆگرییان نیشان داوە، بە پێی کات و شوێن توێژینەوەیان لەسەر بارودۆخ و ڕەوشی کۆمەڵایەتی کردووە و بە مەبەستی باش بوونی هەلومەرجی ژیان و باشترکردنی ڕەوتی کاروبارەکانی کۆمەڵگە چەند تیۆرییەکیان خستۆتەڕوو و چەند یاسا و ڕێسایەکیشیان داناوە.

نووسراوەکانی مێژوونووسانی یۆنانی دەربارەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی ڕۆژهەڵاتی کۆن، پێشاندەری ئەوەیە کە بیروباوەڕە ئایینییەکان جێگەیەکی تایبەتییان لە ژیانی خەڵکی ئەو ناوچەیە لە جیهان هەبووە. هێرۆدۆت (Herodote) ( ٤٢٠ ـ ٤٨٦ پ.ز) مێژوونووسی یۆنانی کە لە دەوروبەری سەدەی پێنجەمی پێش زایین لەژیاندا بووە و بە باوکی مێژوو دەناسرێ، هەندێك زانیاری دەداتە ئێمە کە بێجگە لە گرینگیی مێژوویی، لە باری کۆمەڵناسیش شیاوی بایەخ پێدانن. ئەم مێژوونووسە گەورەیە کە بە "ڕێبوار (موسافیر)ی گەورە" بەناوبانگە، لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی" مێژووی شەڕەکانی یۆنانییەکان و ئێرانییەکان"دا لەبارەی ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەکانی ئەو سەردەمە بەتایبەت یۆنانییەکان زانیاریگەلێك دەداتە دەست کە بە سەرچاوەیەکی گرینك و بەنرخ بۆ مێژوونووسە نوێیەکان دێنە ئەژمار.

هێرۆدت ئەوە دەردەخا کە بیروباوەڕی ئایینیی میسرییەکان بە چ شێوەیەك کاریگەریی لەسەر ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی ئەوان داناوە. هیرارکییەتی (پلەبەندی) خواکان هاوشێوەی هیرارکییەتی کۆمەڵایەتی و ژیانی دوای مەرگیش درێژەی ژیانی سەر زەوییە. بەم هۆیەوە بەشێکی زۆر لە چالاکییە فکری و کردەییەکانیان لە ڕێگەی دروستکردنی جیهانی دیکە بەکار هێنراوە. دروستکردنی مەزار و ئارامگەی تایبەت و ئامادەکردن و دابینکردنی خواردن و جلوبەرگ و مۆمیایی کردنی مردووەکان نموونەیەك لەم جۆرە کارانەیە.(٢) هێرۆدۆت دەنووسێ کە میسرییەکان لە کولتووری یۆنانی بێزارن و بە سووکی لێیان دەڕوانن. ناوبراو هەروەها لەبارەی هۆزە تورانییەکانیشی نووسیوە کە ئەوانیش لە قبوولکردنی دابوڕەسمەکانی بێگانە بە تایبەت یۆنانییەکان خۆ بەدوور دەگرن و لە بەرامبەریشدا فارسەکان بە خەڵکێکی نوێخواز دەزانێ کە دابونەریت و ڕێوڕەسمەکان و کولتووری بێگانە بە ئاسانی وەردەگرن و بەدەستی دێنن.

بەرهەمی بەناوبانگی توسیدید (٣٩٥ــ ٤٦٠ پ.ز) بە ناوی " مێژووی شەڕەکانی پێلۆپۆنیز (Peloponnese) " کە لایەنی مێژوویی هەیە، لە باری کۆمەڵناسی و فەلسەفەی مێژوو و گرینگیدان بە بارودۆخی ئەو سەردەم بەها و بایەخێکی زۆری هەیە.(٣)

لەنێو بیرمەندە یۆنانییەکان ئەفلاتوون (٤٢٩ ـ ٣٤٧ پ.ز) یەکەم کەسێکە کە لە کتێبی کۆماریدا بە شێوەیەکی تەواوتر و ڕێکوپێکتر قسەی لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵگە کردووە. ناوبراو لە مێشکی خۆیدا شارێکی خەیاڵی (یۆتۆپیا) یان "مەدینەی فازیلە" دروست دەکات کە تێیدا دادپەروەری و ئاشتی و یەکسانی جێگیرە و ئاواتەکانی ئینسان تێیدا وەدی دێن.

ناوبراو سیتە (Cite)(٤) یان هەمان شارە خەیاڵییەکە بەو شێوەیەك کە پەسندی دەکات و دەبێ ببێ، وەسف دەکا و هەوڵ دەدا کە کۆمەڵگە ئارمانییەکە بەو شێوەیە کە دەبێ هەبێ نیشان بدات نەك بەو شێوەیەی کە هەیە.

ئەفلاتوون بۆ پێشگرتن لە نارێکوپێکیی و بێدیسیپلینی، گەڕانەوە بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی کۆنی یۆنان پێشنیار دەکات. ئەو شارە خەیاڵییەی کە وێنەی دەکیشێ، لەسەر بنەمای حکومەتی ئاریستۆکراتی و سەربازیی ئیسپارتەیە. بە بۆچوونی ئەو ئاڵوگۆڕەکانی نێوان شارەکان دەبێ سنووردار بێ، بۆ خۆدوورگرتن لە ناهاوسەنگیی ئابووری و سیاسی، حەشیمەتی دانیشتووی شار نابێ لە ژمارەیەکی دیاریکراو تێپەڕ بکات. ژمارەی دانیشتووانی شاری خەیاڵی بە ٥٠٤٠ کەس دیاری کراوە کە هەمیشە دەبێ جێگیر بێ. وادێتە بەرچاو کە باوەڕی ئەفلاتوون بە جادووی وشەکان و ژمارەپەرستی فیساگۆرسی هۆکاری دیاریکرانی ئەم ژمارەیە بێ. چونکە لە ئایینی فیساغۆرس ژمارە حەوت خاوەن هێزێکی سەرسوڕهێنەرە بۆ نموونە: ٥٠٤٠ ٧×٦×٥×٤×٣×٢×١

بۆ پاراستن و جێگیربوونی حەشیمەت و پڕکردنەوەی بۆشاییەك کە بە هۆی شەڕ، نەخۆشی و ڕووداوەکانی دیکە دێتە پێشەوە، دەبێ ژمارەی هاوسەرگیرییەکانیش دیاری بکرێ و تەنانەت پێی لەوەش زیاتر درێژ کردووە و بە بۆچوونی ئەو کەسانێك کە لە دەرەوەی ئاست و تەمەن و مەرجە یاساییەکان منداڵیان ببێ، دەبێ سزا بدرێن و دوور بخرێنەوە.(٥) لە ڕوانگەی ئەفلاتوونەوە ئەگەر دابەشکردنی کار لە نێو چینەکۆمەڵایەتییەکان بە دروستی جێبەجێ بکرێ، دادپەروەری کە بناغەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، دێتە ئاراوە. کەوایە مرۆڤ توانای گۆڕینی کۆمەڵگە و جێگیرکردنی دادپەروەری هەیە.

ئەفلاتوون خێزان ڕەت دەکاتەوە و دەڵێ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکان دەبی لە لایەن دەوڵەتەوە ئەنجام بدرێ. مەدینەی فازیلەی ئەفلاتوون لە سێ چین پێك دێت. چینی حوکمڕانان (لیژنەی دەسەڵاتدار)، چینی شەڕکەران و چینی پیشەوەران. ئەندامانی چینی حوکمڕان دەبێ هەموو شتێك بزانن واتە فەیلەسووف بن و لە هەبوونی هەر چەشنە پیشەیەك خۆ دوور بگرن و کاریان بە پارە و پووڵ نەبێ و خەریکی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شارەکە بن. (٦)

ئەرەستۆ ( ٣٢٢ـ٣٨٤ پ.ز) خاوەن واقیع بینییەکەی زیاترە. ناوبراو سەرەتا ڕێکخراوی سیاسی و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی شارەکانی یۆنان دیراسە دەکات و ئەوجار وەك ئەفلاتوونی

مامۆستای، وێنەی کۆمەڵگەیەکی هەرەباش و نموونە دەکێشێتەوە و لە هەموو شارەکانی بە باشتر دەزانێ.

ئەرەستۆ خێزان بە بنەمای کۆمەڵگە دەزانێ و بۆچوونی ئەفلاتوون سەبارەت بە هەڵوەشانەوەی خیزان ڕەت دەکاتەوە. (٧)

بەراوردکردنی شێوازی کاری ئەفلاتوون و ئەرەستۆ تا ڕادەیەکی زۆر جیاوازی نێوان بیرکردنەوە کۆمەڵایەتییەکان و کۆمەڵناسی ڕوون دەکاتەوە. ئەفلاتوون، لەسەر بنەمای هزرە گشتییەکان و ئازاد لە تاقیکاری لەبارەی بەها و ئارمانجە مرۆییەکان شارێك دروست دەکات کە بە بۆچوونی ناوبراو ئامانج و ئاواتە مرۆییەکان تێیدا دەستەبەر دەبن.

ئەرەستۆ بە پەیڕەوی کردن لە شێوازێکی تەواو پێچەوانە، خەریکی تاوتوێکردنێکی وردی شێوەی پێکهاتنی شارە جیاوازەکانی جیهانی یۆنانی ئەو سەردەم و دیاریکردنی جۆرە گشتییەکانی دەبێ و بەم شێوەیە هەوڵ دەدات لە قووڵایی ناوەرۆکی ئەم شارانە تێبگات، ئەوکات بۆ جۆری بیرکردنەوەی ئەخلاقیی کە هزری ئەفلاتوونی بەخۆیەوە خەریك کردووە، دەگەڕێتەوە و دەڵێ: " پێکهاتە و ڕێکخستنی شاری ئەسینا بە بۆچوونی ئەو لە هەموویان باشترە."

لەڕاستیدا ئەرەستۆ بە پێچەوانەی ئەفلاتوون، سەرەتا بە تاوتوێ و وەسفکردنی واقعییەتەکانی سیستەمە سیاسییەکان، بە ئاکام دەگات و شێوازی کارەکەی لە کۆمەڵناسیی ئەمڕۆیی نزیکە.

دوای کۆمەڵگە ئارمانییەکانی ئەفلاتۆن و ئەرەستۆ، کتێبی مەدینەی ئیلاهی یان شاری خودا لە نوسینی سێنت ئاگۆستین (٣٥٤ـ ٤٢٠.ز)ـە(٨) کە لە سەردەمی دەسبەسەرداگرتنی ڕۆم لە لایەن هۆزە نیوە وەحشییەکانی ئورووپا، نووسراوە. ڕووخان و وێرانبوونی وڵاتێك کە بۆ ماوەی چەند سەدە پایتەختی جیهان دەهاتە ئەژمار، کاریگەرییەکی قووڵی لە نووسینیدا هەبووە. "شاری خودا" تێکەڵاوێکە لە تەواوی شارستانییەتی ڕۆژگاری کۆن بە ڕوانینێکی گشتی بۆ مێژووی ڕۆم کە نووسینەکەی لە ساڵی ٤١٢ هەتا ٤٢٦ی زایینی درێژەی کێشاوە و دوایین بەرهەمی نووسەرێکی ڕۆمییە.

"شاری خودا" بە پردی نێوان شێوازی بیرکردنەوەی یۆنان و ڕۆمای کۆن و شێوازی بیرکردنەوەی نوێ دەزانن، لەم ڕووەوە تێکەڵاوێك لە شارستانییەتی سەردەمی کەونارا و شێوازی

بیرکردنەوە و شارستانییەتی مەسیحییەت لەخۆ دەگرێ و لە هەمان کاتدا جۆری گۆڕانکاریی لە یەکەمەوە بۆ دووهەم دەردەخا هەر بۆیە گرینگترین بەرهەمی سەدەکانی ناوەڕاستە. (٩)

سێنت ئاگۆستین و بۆسۆئە، وتاربێژی بەناوبانگی فەڕانسە، هەردووکیان پێیان وابوو کە مرۆڤ ژیانی خۆی لەو جێگەیەوە دەست پێکردووە کە لە بەختەوەری بەهەشتی نزیك بووە، بەڵام دابەزینی ئەو لەم جیهانە و لە گوناحدا دەبێتە هۆی ئەوەکە لەماوەی ژیانیدا تێبکۆشێ و بەخشین و کەرەمی بوێ و لە ماوەی جوولەیەکدا کە سەرجەم سەرپۆشێکی بە ناوی خواستی ئیلاهی هەیە، ژیانی هاوبەشی خۆی درێژە پێبدا بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بە بەختەوەری هەمیشەیی بگات. ئەم فەلسەفەیە لەسەر بنەمای حیکمەتی ئیلاهی و ویستی خوایی و فاکتەرە میتافیزیکییەکانە، واتە یاساگەلێك کە لە یاساکانی مێژووی ژیانی مرۆڤ سەرچاوە ناگرن، بەڵکوو سەرچاوەکەی لە شوێنێکی دیکەوەیە. ئەم باسە بۆ ماوەیەکی زۆر فەیلەسوفەکانی لە تەواوی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەخۆیەوە خەریك کردبوو.

لە سەدەی ٧ی زایینییەوە بیرمەندە ئیسلامییەکان دەستیان بە توێژینەوەگەلێکی زۆر پڕبەها لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا کرد کە لە نێو ئەو بیرمەندانەدا ئەبونەسری فاڕابی، ئەبووڕیحانی بیرونی و ئیبن خەلدوون خاوەن ناووبانگی زیاتر و گرینگی و بایەخی زۆرترن.

ئەبوونەسری فاڕابی لە ساڵی ٢٥٩ی کۆچی لە گوندی وەسیج چاوی بە ژیان هەڵێناوە. ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد وەك مامۆستای خۆیان قبووڵیان کردووە و نازناوی "مامۆستای دووەم"یان پێبەخشیوە. یەکێك لە نووسەرەکان لەم بارەوە دەنووسێ:" ئەم نازناوە بۆیە گرینگ و مانادارە چونکە مامۆستای یەکەم ئەرەستۆیە. وادیارە موسوڵمانان بۆیە نازناوی مامۆستای یەکەمیان داوەتە ئەرەستۆ، چونکە باسەکانی لۆژیك و بابەتەکانی کە پرش‌وبڵاو بوون، کۆی کردوونەتەوە و پوختەی کردوون و بناغەکەی قاییم کردووە و وەك سەرچاوەی زانستی لێکردووە. لەمەڕ نازناوی مامۆستای دووەمیش پاساوی لەم جۆرە خراونەتەڕوو و دەتوانرێ هەموو ئەو قسانە بەم شێوەیە کورت بکرێنەوە کە فاڕابی گرینگییەکی زۆری بە زانستی لۆژیك و بە تایبەت بە بەڵگەهێنانەوە و زانستی بەڵگەهێنانەوە داوە و بەرهەمە لۆژیکییەکانی، بە گشتی بیروڕا فەلسەفییەکانی و بە تایبەت بەرهەمەکانی ئەرەستۆی کە وەرگێڕدرابوون، کۆ کردۆتەوە و پوختە و ڕێکوپێکی کردوون و بە شێوازی خۆی شرۆڤەی کردوون و لەسەری نووسیون.

بەرهەمەکانی فاڕابی دەتوانرێ بە دوو دەستە دابەش بکرێن:

١ـ ئەو شرۆڤە و شیکردنەوانەی کە لەسەر وانەکانی ئەرەستۆ نووسیویەتی.

۲ـ ئەو کتێبانەی کە خۆی نووسیونی و ئامادەی کردوون.

لەو کتێبانەی کە فاراِبی خۆی نووسیونی، دەتوانین ئاماژە بکەین بە: " ألجمع بين رأيي الحكيمين"، "تحصيل السعاده"، آراء اهل مدينه فاضـله، السياسات المدنيّه"، احصـا العلـوم، عيون المسائل و اغراض مابعد الطبيعةی ئەرەستۆ.

فاراِبی بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی لە دوو کتـێبی " آراء اهـل مدينـه فاضـله"و "السياسات المدنيّه" نووسیوەتەوە. ناوبراو لە خستنەڕووی کۆمەڵگە ئارمانییەکەی خۆی لەژێر کاریگەریی یۆتۆپیاکەی ئەفلاتوون دابووە و وەك ئەو خەریکی بەراوردکردنی کۆمەڵگـە لەگـەڵ جەستەی ئینسان بووە.

فاراِبی یۆتۆپیاکەی خۆی چوواندوە بە: " جەستەیەك کە ئەندامەکانی تەواو بـن نـەك هـەر جەستەیەك، چونکە مەدینە جاهیلییەکانیش بە شـێوەی جەسـتەن و ئەندامـەکانی بـە یـەکتر بەستراوەن. واتە جەستەیەك کە هەر ئەندامێکی بـۆ مانـەوە و بـەردەوام بـوونی جەسـتە کـار بکات، ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێ، بە هەمان شێوەی کە ئەندامەکانی جەستە جۆراوجـۆرن و هەر یەکێکیان دەبێ ئەرکێك وەئەستۆ بگرن، هەندێکیان بە سروشـت لـە هەنـدێکی دیکـەیان باشترن و ئەندامێك فەرماندەر و سەرۆکی هەمووانە کە دڵـە و ئەندامـەکانی دیکـە لـە بـاری پلەوە جیاوازن، ئەندامەکانی دیکەش بۆ سەر ئەندامە سەرەکی و لاوەکییەکان دابەش دەبن کە دیارە وەك سەرۆکی پلە دووهەم دێنە ئەژمار کە هەریـەکێکیان هێـز و یاریـدەدەر و دەسـت و پێوەندی خۆیان هەیە بەڵام هەموو ئەم سەرۆکانە، دەبێ لـەژێر فـەرمانی دڵدا بـن و وەشـوێن ئامانجی ئەو بکەون و دواتر سەرۆکەکانی پلە سـێهەم. سـەرۆکی یەکـەمی جەسـتە کـە دڵـە، کامڵترین و هۆشیارترین ئەندامی جەستەیە و یەکەمین شـت کـە لـە گیـان و قـاڵبی مرۆڤـدا دروست دەبێ، هەر ئەوە.

لە مەدینەی فازیلەشدا پێویستە سەرۆکی یەکەم و خاوەن فەرمان هەبێ کـە بەرپرسـایەتی گشت کۆمەڵگە و سەرۆکەکانی پلە یەکەم و دووهەم و سێهەم هەتا کەسانی ئاسایی بەدەسـتی ئەو بێ و هەموویان دەبێ پێڕەوی لە بڕیارەکانی ئەو بکەن و بە هەمان شێوە کە دڵ لەسەرووی هەموو ئەندامەکانە، سەرۆکی یەکەمی شارەکەش دەبێ لەسەرووی هەموو تاکەکان بێ.

لێرەدا فاراِبی سیستمەکان واتە سیستەمی بەرزی بـەراورد کـردووە. لەلایـەك سیسـتەمی جەستەی مرۆڤی لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵگـە، و لەلایـەکی دیکـەوە هـەردوو سیسـتەمەکەی

لەگەڵ سیستەمی خولّقاندن کە هۆکاری سەرەکی گشت عەقڵەکان و ئەجرامی سەماوی ( خۆر، ئەستێرە، مانگ و ... کە لە ئاسمانن) و سەرەنجام شتە سروشتییەکانە، هاوئاهەنگ کردووە.

بەم پێیە سەرۆکی یەکەمی مەدینەی فازیلە دەبێ هەڵگری چەند خسڵەت و تایبەتمەندییەك بێ کە لە گشت تاکەکانی دیکە جیای بکاتەوە و بتوانێ وەك دڵ لەجەستەی مرۆڤدا بێ، یان لە جێگەی عەقڵی یەکەم بێ یان عەقڵی چالاك کە چاوەدێر و گەورەتر لە گشت جیهانی سروشتە. لێرەدا، فاراِبی حیکمەتی ( فەلسەفە) بە مەرجی سەرەکی سەرۆکایەتی یەکەمی مەدینەی فازیلە زانیوە و ئەمە خاڵی هاوبەشی نێوان ئەرەستۆ و ئەفلاتوونە. (١٠)

فاراِبی لە بەرامبەر مەدینەی فازیلە ئاماژەی بە مەدینەی جاهیلە کردووە کە خۆی چەند شاری وەك مەدینەی فاسقە ( شاری بەدرەوشتان، شاری سۆزانییەکان)، مەدینەی مبتذلة ( شاری بێنرخان) و مەدینەی ضالە ( شاری سەرلێشێواوان) لەخۆ دەگرێت. ئەم شارانە هەر یەکێکیان بە جۆرێك تووشی پشێوی و نارێکوپێکین و تەنیا شارە نموونەییەکە ( مەدینەی فازیلە) لەگەڵ سیستەمە سروشتییەکان و دەزگای خولّقان و سرشتی مرۆڤدا هاورێك و یەکسانە.

## جۆرەکانی کۆمەڵ:

فاراِبی لە کتێبی" السیاسات المدنیّە"، باسی هەموو جۆرەکانی کۆمەڵە مرۆییەکانی کردووە و بە شێوەیەکی گشتی سێ جۆر کۆمەڵگەی دەستنیشان کردووە: گەورە، ناوەند و بچووك.

کۆمەڵی گەورە ئەو کۆمەڵەیە کە لە گەل و نەتەوەی زۆر پێك هاتووە کە هەموویان یارمەتی و یاریدەی یەکتر دەکەن.

کۆمەڵی ناوەند بریتییە لە کۆبوونەوەی نەتەوەیەك.

کۆمەڵی بچووکیش ئەو کۆمەڵەیە کە لە شارێکدا بێت.

ئەم سێ جۆرە کۆمەڵە، کۆمەڵی تەواون. کەوایە شار یەکەمین پلەی پێگەیشتوویی مرۆیی لە ژینگەی کۆمەڵایەتیدایە و بەڵام کۆمەڵەکان لە گوندەکان و گەرەك و کۆڵان و ماڵەکاندا کۆمەڵێکی ناتەواون. ئەوەی کە لە هەموویان ناتەواوترە، کۆبوونەوە لە ماڵێکدایە کە بەشێك لە کۆمەڵی کۆڵانێك بوو و کۆبونەوە لە کۆڵان، بەشێك لە کۆمەڵی گەرەك و گەرەك بەشێك لە کۆمەڵی مەدەنی بوو. کۆمەڵەکان لە گەرەك و گوندەکان هەردووکیان لەبەر شار بوو. بێجگە لەوەیکە جیاوازی نێوان ئەم

دووانە ئەوەیە کە گەڕەکان بەشەکانی شارن بـەڵام گونـدەکان خزمـەتکاری شـارن و کۆمـەڵی مـەدەنی بەشێك لە نەتەوە بوو و نەتەوە بەسەر شارەکاندا دابەش دەبێـت. کۆمەڵـە مرۆییـە تـەواوەکان بەسـەر نەتەوەکاندا دابەش دەبن و هەر نەتەوەیەك بە دووباری سروشتیدا لە نەتەوەکانی دیکـە جیـا دەبێتـەوە، یەکێکیان بە شێوەی خولّقانی سروشتی و ئەوەی دیکە بـە جەوهـەری سروشـتی و هـەروەها بـە هـۆی دیاردەیەکی سێهەمی کە دانراوە نـەك سروشـتی، کـە دیـارە ئـەویش دەسـتێوەردانێکە لـە کاروبـارە سروشتییەکان و ئەویش بریتییە لە زمانی قسەکردنی ئەوان، زمانێـك کـە قسـەی پێدەکـەن. کەوایـە بەشێك لە نەتەوەکان گەورە، بەشـێکی دیکـەیان بچـووك و هۆکـاری سروشـتی یەکـەم لـە جیـاوازی نەتەوەکان لەم کاروبارانەدا ئەو شتانە بوون کە ..."(١١)

## دادپەروەری لە یۆتۆپیا (مەدینەی فازیلە)ی فاڕابیدا:

لە ڕوانگەی فاڕابی لەلای خەڵکی کۆمەڵگە نموونەییەکان، دادپەروەری بە واتای " ئەوەیـە کە هەموویان بە بەختەوەی و پێگەیشتوویی زیاتری خۆیان بگەن، هەموویان بژین، هـەموویان درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن، شەڕ و کێشە نەمێنێ، هـەر ئەنـدامیك ئـەرکی خـۆی جێبـەجێ بکات، سەرەنجام هەموو ئەندامەکان بە ساغی دەمێننەوە و درێـژە بـە مـان و ژیـانی خۆیـان دەدەدەن. هەموویان پێڕەوی لە ڕێبەرێك بکەن و ئەو ڕێبەرەش لەژێر دەسەڵاتی ئیرادە و عەقڵی خۆیدا بێ و زانا و تێگەیشتوو و ڕازاوە بە ئەخلاقی جوان بێ، هیچ ئەنـدامێك لـە ئەنـدامانی کۆمەڵگە دەسدرێژی بۆ سەر ماف و ئەرکەکانی کەسێکی دیکـە نـەکات. خـەڵکی مەدینـەی فازیلە دەڵێن: دادپەروەری ئەمەیە کە هەموو تاکەکان درێـژە بـە ژیـانی خۆیـان بـدەن و لـەم حوکمەدا پێڕەوی بڕیاری عەقڵ و هێزی ئاخاوتن و دەربڕین بکەن. خەڵکی شـاری بەدڕەوشـتان (مدینە فاسقە) دەڵێن: "الحق لمن غلب" بە هەمان شـێوە بناغـەی بوونـەوەرە سرووشـتییەکان لەسەر دژایەتی و دوژمنایەتییە و هەر بوونـەوەرێك لەگـەڵ بوونـەوەرەکانی دیکـە لـە شـەڕ و ململانێ دایە و خوازیاری وەلانان و لەناوبردنی بوونەوەرەکانی دیکەیە. لە جیهانی مرۆییشـدا دادپەروەری بەم شێوەیەیە کە بە هەموو جۆرە فرتوفێڵ و دەستدرێژی و ساختەکارییەك کەسانی تر لەناو ببات بۆ ئەوەی خۆی بە زیندوویی بمێنێتەوە یان هەمووان بکاتـە کارەکـەر و کۆیلـەی خۆی بۆ ئەوەی لە ژیان و مانەوەی ئەودا بەسوود بن.(١٢)

بێجگە لە بابەتەکانی سەرەوە، لە بواری کۆمەڵەکانیشدا فاڕابی بۆچوونگەلێکی لـە بـارەی دادپەروەری، پێکەوەژیانی ئاشتییانە، بەڵێن و پەیمانەکان، مرۆڤدۆستی و ... هەیە کە بە دوور و درێژی لە کتێبی ( آراء اهل مدینه فاضله) باسی کردووە.

ئەبووڕیحانی بیرونی ( ٤٤٠ ـ ٣٦٢ کۆچی مانگی ) یەکێکی دیکە لە بیرمەندە گەورەکانی ئێرانە کە هاوزەمان لەگەڵ سەدەکانی ناوەڕاست یەکێك لە پتەوترین و تۆکمەترین شـێوازەکانی توێژینەوەی بۆ ناسینی کۆمەڵە مرۆییەکان بەکار هێنـا. هەرچـەند ناوبـانگی لـە ماتماتیـك و ئەستێرەناسی دایە، بەڵام لە بوارە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکانیشـدا گرینگییـەکی زۆری هەیـە. بەرهەمە بەناوبانگەکەی " تحقیق ماللهند"ـە کە بەشێوازێکی بابەتییانە و ڕاسـتەوخۆ ژیـانی کۆمەڵایەتی و ئابووری، دابونەریت، زمان، ئایین و نەریتەکانی خەڵکی هیند تاوتووێ کردووە و نووسیویەتی. ناوبراو ماوەی ١٥ساڵ لـە وڵاتـی هینـد ژیـانی بەسـەر بـردووە و لـە ڕێگـەی بەشداریی لە ژیانی خەڵك و تێڕامانی ڕاستەوخۆ دەستی بە کۆکردنەوەی زانیارییە پێویستەکان کردووە.

کتێبی "تحقیق ماللهند" لە دەوروبەری ساڵی ٤٢٢ی ك.م نووسراوە. ئەم بەرهەمە گرینگە ناسێنەری زانست و کولتوور و داب‌ونەریتەکانی وڵاتی هیندوستانە کە ئەبووڕیحان لـە ڕێگـەی توێژینـەوە خسـتوویەتەڕوو و لەگـەڵ وڵاتـانی دیکـە بـەراوردی کـردووە. شـێوازی ئـەو لـەم توێژینەوەیـەدا هـەر ئـەو شـێوازەیە کـە کۆمەڵناسـان و ئەنترۆپۆلۆژییـەکانی ئـەمڕۆیی لـە توێژینەوەکانیاندا بەکاریان دێنن. (١٣)

عەبدوڕڕەحمانی ئیبن خەلدوون کە بە "ئیبن خەلدوون" ناسـراوە، لـە سـاڵی ٧٣٢ی کۆچـی بەرامبەر بە ١٣٣٢ی زایینی لە تونیس لەدایك بووە. ناوبراو هەم وەك دامەزرێنەری فەلسەفەی مێژوو و هەم وەك دەسپێکەری توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بە پشت بەستن بە پەیوەندییە هۆ و بەرهۆییەکان، ناسراوە کـە بۆچـوونەکانی خـۆی لـە کتێبێکـدا کـە بـە "مقدمـە" ناوبـانگی دەرکردووە، کۆ کردۆتەوە کە هەم شێوازێکی نوێی مێژوونووسی تێدا خسـتۆتەڕوو و هـەم ئـەو بابەتانـەی کـە ئەمڕۆکـە لـە لقـە جۆراوجۆرەکـانی کۆمەڵناسـی و بەشـەکانی تـری زانسـتە کۆمەڵایەتییـــەکان جێگـــەی هەڵســـەنگاندن و بـــاس و توێژینـــەوەی زانایـــانی بـــواری زانستەکۆمەڵایەتییەکانن، تێیدا خراوەتەڕوو. ڕەخنەیەك کـە ئـەو لـە مێژوونوسـانی پێشـووی دەگرێ، بە باشی پانتایی ڕوانین و بیرکردنەوەی ناوبراو لە کەسانی پێش خـۆی جیـا دەکاتـەوە. ئەو لەم بارەوە دەنووسێ: " بەڵام دواتر، مێژوو یەکێك لە شێوازە باوەکانی نێو هەموو نەتـەوە

و ڕەگەزەکانە کە لە پێناویدا چەندین سەفەر و گەڕان دەکرێ، هەم خەڵکی ڕەشۆکی و بێناوونیشان حەزیان لە ناسین و تێگەیشتنییەتی و هەم پاشا و گەورەپیاوان مەیلی ناسینیان هەیە و لە تێگەیشتنیدا زانایان و نەزانان یەکسانن، ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا چەند قسەوباسێك زیاتر نییە لە بارەی ڕۆژگار و دەوڵەتەکانی پێشوو و سەربوردەی سەدە سەرەتاییەکان، کە خەڵك وتەکانیان پێدەڕازێننەوە، بە گێڕانەوەیان کۆڕەکانیان گەرم دەکەن. دەوڵەتان دێن و دەرەتانی زێدەخوازی و وڵات ستێنی وەدەست دێنن و دەست بە ئاوەدانی دەکەن، هەتا ئەو کاتەی کە بانگی ئاوابوون و کۆتایی هاتنیان دەدرێ و کاتی ڕووخان و لەناوچوونیان دەگات. بەڵام لەناوەوەدا ئەندێشە و توێژینەوە لە بارەی ڕووداوەکان و سەرەتاکانیان و گەڕانی ورد بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکانیانە و زانستێکە لەبارەی چلۆنایەتی ڕووداوەکان و هۆکارە ڕاستەقینەکانیان، بەم هۆیەوە مێژوو لە فەلسەفە سەرچاوە دەگرێت و جێی خۆیەتی لە زانستەکانی ئەویش بێتە ئەژمار. مێژوونووسەکانی ئیسلام بە شێوەیەکی گشتگر هەواڵ و باسی ڕۆژانی ڕابردوویان کۆ کردۆتەوە و لە لاپەڕەکانی مێژوودا نووسیویانن و بە یادگار جێیان هێشتوون. بەڵام بەرماوخۆران، ئەو قسە و باسانەیان تێکەڵاوی فرتوفێڵە ناهەقەکان کردووە. سەبارەت بەوان تووشی گومان بوون یان تەزویریان کردوون و گێڕانەوەی لاوازیان تێکەڵاو کردووە و دروستیان کردوون و زۆر لە نەوەکانی دوای ئەوانیش پێڕەوییان لێ کردوون و بەهەمان شێوە کە ئەو قسە و باسانەیان بیستووە، بۆ ئێمەیان جێهێشتوون بێئەوەی کە لە هۆکارەکانی ڕوودانی بەسەرهات و ڕووداوەکان ورد ببنەوە و هەواڵ و باسە ترەهات و پڕوپووچەکان بەلاوەبنێن.

بەڵێ! خەڵك قسە و باسەکانیان داڕشتوونەتەوە و بەرهەمی زۆریان لەدوای خۆیان جێهێشتووە و مێژووی نەتەوەکانی سەرانسەری جیهانیان کۆ کردۆتەوە بەڵام ئەوانەیکە بە باشی ناوبانگیان دەرکردووە و وەك پێشەوا دەرکەوتوون و کتێبەکانی پێشینیانیان تاوتوێ کردووە و لە بەرهەمەکانی خۆیاندا بەکاریان هێناون، تاقمێکی کەمن و لە قامکەکانی دەست تێناپەڕن، وەك ئیبن ئیسحاقی، تەبەری، ئیبن کەلبی و محەمەد کوڕی عومەری واقدی و سەیفی کوڕی عومەری ئەسەدی و مەسعوودی و چەند ناودارێکی دیکە کە لە گشت مێژوونووسەکاندا جیاوازن...

ئیبن خەلدوون بە توندی ڕەخنەی لە ڕووداونووسیی پەتی گرتووە کە شێوازی زۆر لە مێژوونووسەکانی هاوسەردەمی ئەو بووە. ئەوان بە چەند لاساییکەرەوەیەك ناو دەبات کە

ڕووداوەکان بە شێوەیەکی زانستی و لە پێوەندییەکی هۆ و بەرهۆییدا تاوتوێ ناکەن: " ئەمجار دوای ئەوەکە ناوی ئەم گرووپەمان هێنا کەسانێك پەیدا بوون کە لە مشتێك لاساییکەرەوەی بیرکۆڵ و بێئاوەز زیاتر نین کە بە هەمان شێواز لاسایی گرووپی یەکەم دەکەنەوە و ئەوان بەسەرمەشقی خۆیان دەزانن و بەگشتی لەو گۆڕانکارییانەی کە ڕۆژگار هێناویەتە کایەوە و ئەو ئالوگۆڕانەی کە بەهۆی داوڕەسم و ڕێوشوێنەکانی نەتەوەکان و وەچەکان، هاتوونەتەئاراوە، بێئاگان. ئەم گرووپە بە لاساییکردنەوەی ئەو پێشینیانەی کە وەك ئۆلگوو و سەرمەشقی خۆیان سەیریان دەکەن، باس و هەواڵە دەم بە دەم هاتووەکان، بێکەم و زیاد و وەك خۆی، لە بابەت ڕووداوە مێژووییەکانی خۆیان دووپات دەکەنەوە و لە بیرهێنانەوەی بابەتەکانی پێوەندیدار بە وەچەکانی سەردەمی خۆیان تووشی بێخەبەری بوون و شرۆڤە و شیکردنەوەی ئەوانیان لەلا قورس و ئاستەمە و لە ئاکامدا ئەم جۆرە بابەتانە بەبێدەنگی دەهێڵنەوە..."

ناوبراو لە درێژەی ئەم بابەتەدا ئاماژە بە شێوازی دیراسەی خۆی دەکات و دەنووسێ:" ... لە نێو مەبەستە جۆراوجۆرەکاندا، شێوازێکی نوێ و میتۆدێکی داهێنەرانەم دۆزییەوە و چلۆنایەتییەکانی شارستانییەت و دواهاتە زاتییەکانی ئەوانەی لە کۆمەڵە مرۆییەکاندا ڕوو دەدەن، شی کردۆتەوە، بە شێوەیەك کە خوێنەر ئاشنای هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ڕووداوەکان بکات ..."(١٤)

ئیبن خەلدوون لە پێشەکی کتێبەکەیدا، لە پێوەندیی لەگەڵ ناو، ناوەرۆك و شێوازێك کە بەکاری هێناوە، دەڵێ: " بۆیە ناوی کتاب العبر ...م لێ ناوە و لە بارەی سەرەتای ڕەچەڵەك و دەوڵەتەکان و هاوسەردەمیی نەتەوە سەرەتاییەکان و هۆکارەکانی شۆڕش و لەناوچوونی نەتەوەکان، لە سەدەکانی ڕابردوو و ئەوەی کە لە کۆمەڵدا ڕووی داوە وەك: دەوڵەت و نەتەوە و شار و شوێنی کۆبوونەوەی چادرنشینەکان، بەرزی و نزمی و زیادی و کەمیی کۆمەڵەکان و زانست و، وەدەسهێنان و کۆکردنەوەی سامان و لەدەستدانی، چۆنییەتی لەناوچوون و بڵاوبوونی قەومەکان و دەوڵەتان و ژیانی کۆچەری و شارنشینی و ئەوەی کە ڕووی داوە و ئەوەی کە چاوەڕوان دەکرێت پێش بێت، درێغیم نەکردووە. بەڵکوو هەموویانم بە شێوەیەکی تەواو و گشتگر هێناوەتەوە و دەلیل و هۆکارەکانیانم ئاشکرا کردووە ... و دوای ئەوەکە هەوڵەکانم لە نووسینی ئەم کتێبەدا بە کۆتایی گەیاند و کردمە مۆمێکی داگیرساوی ڕێگەی بینەران و لەنێو زانستەکاندا، شێوە و شێوازەکەم ئاشکرا کرد و سنوورەکەی ئەوم لەنێو زانستەکاندا پەرە پێدا و

دیوارم بە چوار دەوریدا کێشا و لە زانستەکانی دیکەم جیا کردەوە و بناغەکەم دامەزراند، ئـەم یەك کتێبەم پێشکەشی کتێبخانەی خاوەندگارەکەمان، سەروەر و پێشەوا ... کرد.(١٥)

ئەوەی کە لە سەرەوە لە زمان ئیبن خەلدوون گێڕدراوەتەوە، نیشانەی بەها و بایەخێکە کـە شـیکردنەوەی ڕووداوەکـان و دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکان لـە ڕوانگەیـەکی مێژووییـەوە و بەشێوازێکی نوێ کە لەسەر بنەمای دۆزینەوەی پێوەندیی هۆکردیی بووە، بۆ ناوبراوی هەبووە. بەم هۆیەوە هەروەك دواتر دەبینین، ئبین خەلدوون لەباسکردنی گشت ئـەو ڕووداو و دیاردانـەی کە مێژوو باسی کردوون، هەوڵ بۆ خستنەڕووی جۆرێـك پێوەنـدیی هـۆ و هـۆکردیی دەدات و پێوەندیی لەنێوان دیاردەی جێگەی بـاس و دیـاردە کۆمەڵایـەتی یـان جوگرافییـەکانی دیکـە دادەمەزرێنێ. لەڕاستیدا ناوبانگی ناوبراویش لەوە دایە کە بـۆ یەکـەم جـار لـە پێوەندییـەکی هۆکردیـدا بـەدوای بەسـەرهاتە مێـژوویی و ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکانـدا گـەڕاوە و وەشـوێن دۆزینەوەی یاسایەکی گشتی، زاڵ بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەکان کەوتووە.

ئیبن خەلدوون لە بارەی دەوڵەتیش کە یەکێك لە دامەزراوە سەرەکییەکانە، بە درووردرێـژی باسی کردووە و دەرکەوتن و کەوتنی دەوڵەتەکانی لە قۆناغگەلی جیاجیادا تاوتوێ کردووە.:

قۆناغی یەکەم سەردەمی گەیشتن بە ئامـانج و داخـوازی و زاڵبـوون بەسـەر بـەرگریکار و دژبەر و بەدەستەوەگرتنی وڵات و وەرگرتنی لەدەستی دەوڵەتی پێشوویە. لەم قۆناغـەدا پاشـای وڵات لە بەدەسهێنانی گەورەیی و سەروەری و باج ستاندن و بەرگری لە نیشتمان و پاسـەوانی و پشتیوانیکردنی، پێشـەوا و پێشـڕەوی قـەومی خۆیـەتی و بـەهیچ جۆرێـك لـە بەرامبەریـدا فەرمانڕەوایەکی ڕەها نییە، چونکە ئەم کارە لەسەر بنەمای دەمارگیرییەکە کە بە هۆی ئەوەوە سەرکەوتن و زاڵبوون بەدەست هاتووە و ئەم دەمارگیرییەش لەو قۆناغـەدا ئێستا هەر جـێگیر و پایەدارە.

قۆناغی دووەم سەردەمی زۆرداری و سەرەڕۆیی (دەسەڵاتدارێتیی ڕەهـا) و زاڵبـوون بەسـەر عەشیرەت و پێش پێگرتنیـان لـە هەولـدان بـۆ بەشـداری و شـەریك بـوون لـە کاروبارەکـانی وڵاتدارییە و، سـەرۆکی وڵات لـەم قۆناغـەدا کـار بـۆ نزیککردنـەوەی پیـاوانی هەڵبـژاردە و بەکارگرتنی کەسانی دەست پەروەردە و خزمەتکار دەکات، بـە ژمـارەی ئـەو کەسـانەوە زیـاد دەکات بۆ ئەوەی مەیدانەکە لە خزم و کەسانی عەشیرەتەکەی خـۆی، ئەوانەیکـە لـە ڕەگـەزدا لەگەڵی هاوبەش و لە بەهرەوەرگرتن لە ماڵ و ساماندا، شەریك و هاوپشکی ئـەون، بەرتـەنگ بکاتـەوە. هـەر بۆیـە ئـەوان لـە وەئەسـتۆگۆتنی کاروبارەکـان دوور دەخاتـەوە و پـێش بـە

تێکـەڵاوبوونیان لـە کارەکانـدا دەگرێـت و لـە جێگـەی خۆیانـدا ڕایانـدەگرێ و دەرەتـانی پێشوەچوونیان پێنادات بۆ ئەوەی جڵەوی دەسـەڵاتداریّتی، تـەنیا لـە دەسـت خـۆی دابێـت و دەسەڵات لەدەست خۆی و بنەماڵە و خانەدانەکەیـدا بمێنێتـەوە و زۆرداریـی (دەسـەڵاتداریّتیی ڕەها) تایبەت بە خۆی بێت. هەر بۆیە دامەزرێنەری ئەم قۆناغەی دەوڵەت، بە هۆی بـەرگری و پێکدادان لەگەڵ حەریفەکان، دەبێ بەرگـەی هـەموو ئـەو ڕەنـج و کوێرەوەرییانـە بگرێـت کـە بناغەدانەرانی قۆناغی یەکەم لە بەدەسهێنانی ولاتدا کێشاویانە. تەنانەت کاری ئەو دژوارتـر و پڕزەحمەتترە، چونکە دامەزرێنەرانی یەکەم لەگەڵ بێگانەکان تووشی کێشـمەکێش و پێکـدادان بوون و تەواوی خزم و نزیکانی خۆیان لەم شەڕ و نەبـەردەدا یارمەتیـدەر و پشـتیوانیان بـوون. بەڵام سەرۆکی ولات لەم قۆناغەدا لەگەڵ نزیکانی خۆی خەریکی شەڕاشۆیی و تێکهەڵچـوونە و دووریان دەخاتەوە و هیچ کەس لەم بەربەرەکانییەدا یارمەتی ناکات بێجگە لە گرووپێکی کـەم لە کەسانێکی دوور ( یان بێگانە)، بۆیە دەستی داوەتە کارێکی قورس و دژوار.

قۆنـاغی سـێهەم قۆنـاغی ئاسـوودەیی و ئـارامیی پاشـای ولات و بەهرەمەنـدبوون و بەدەسهێنانی بەرهەم و ئاکامەکانی پاشایەتییە. ئەو ئاکامانەی کە سرشـتی مرۆڤـ پێیانـەوە بەسـتراوەتەوە و ئاواتیـان بـۆ دەخـوازێ، وەك وەدەسـهێنانی مـاڵ و سـامان و وەك یادگـار بەجێهێشتنی شوێنەواری دایمی و ناودەرکردن و ناوبانگخوازی. هەر بۆیە تەواوی هەوڵی خـۆی لە ڕێگەی کاروباری باج ئەسـتاندن و داهـات و دەرکـەوت و حسـێب کردنـی خەرجییـەکان و هاوسەنگی نێوانیان وەکـار دەخـات. زۆر کۆشـك و قەسـری جـوان و قـەڵای گـەورە و شـار و ئاوەدانی بەربلاو و پەرستگەی بەرز و گەورە دروسـت دەکـات و دیـاری و خـەڵاتی گـەورە بـە هەیئەتی نوێنەرایەتیی ئەشراف و نەتەوەکان و گەورەپیاو و سەرۆك عەشیرەتەکان دەبەخشـێ و خێر و خێرات لەنێو کەسانی نزیك خۆیدا بلاو دەکاتەوە.

بێجگە لەوەیکە لە باری ژیان و گوزەرانەوە بایەخ بە ژیان و حاڵی پەڕاوێزنشینان و دەسـت پەروەردە و خزمەتکارانی خۆی دەدات، سەرنجی ڕێکـوپێکیی سـوپاییەکانی خـۆی و موچـە و مەعاش پێدان لە هەر مانگێکدا لەڕووی ئینسافەوە، دەدات. بە شێوەیەك کە شـوێنەوارەکانی ئەم کارە لە وەزعـی جلوبـەرگ و چـەك و نیشـانە و ... هێزەکـانی سـوپا لـە ڕۆژی نمایشـی سەربازیدا دەردەکەوێت. ئەو کات دەوڵەتە نزیك و دۆستەکانی ستایشی دەکەن و شانازی پێـوە دەکەن و دەوڵەتانی شەڕکەر و دوژمنیش ترس و خۆفیان لێ دەنیشـێ. ئـەم سـەردەمە دوایـین قۆناغەکانی سـەرەڕۆیی و زۆرداری پاشـاکانی ولاتـە. چـونکە لـە هـەموو ئـەم قۆناغانـەدا،

سەربەخۆن و بەوەجیی و پلەوپایەی خۆیان ئاشکرا دەکەن و ڕێگەکان بـۆ نـەوەکانی داهـاتووی خۆیان خۆش دەکەن.

قۆناغی چوارەم قۆناغی خۆشحاڵی و ئاشـتیخوازییە و سـەرۆکی دەوڵـەت لـەم قۆناغـەدا، بەوەیکە ڕابردووەکانی دایانمەزراندووە، قەناعەت دەکات و لەگەڵ پاشـاکانی هاوتـەرازی خـۆی ڕێگەی ئاشتیخوازی دەگرێتەبەر و لە داب‌ونەریت و شێوەی پاشایەتیدا لاسای پێشینیانی خـۆی دەکاتەوە. هەنگاو بە هەنگاو پێ لە جێی کردەوەکـانی ئـەوان دادەنێـت و بـە باشـترین شـێوە پێڕەوییان لێ دەکات و بڕوا بەمە دێنێ کە ئەگەر هەنگاوێك لەلاسایی کردنەوەی ئـەوان زیـاتر هەڵبێنێتەوە، دەبێتە هۆی گەندەڵیی کارەکەی و درز دەکەوێتەوە ناو دەسـەڵاتدارییەکەیەوە و، لە دامەزراندنی کۆشکی سەروەری و گەورەییدا، ئەوان بە چاوساغ و ڕێنیشاندەر و چاوتیژتر لە خۆی دەزانێت.

قۆناغی پێنجەم سەردەمی هەڵەخەرجی و ماڵ بەفیڕۆدانە و سەرۆکی وڵات لەم قۆناغـەدا، هەموو ئەو شتانەی کە پێشینییەکانی کۆیان کردۆتەوە، لە ڕێگەی هەواوهەوەس و بەشینەوەی بەسەر خزم و کەسانی نزیك لە خۆی لە کۆڕ و بۆنەکانی خۆشگوزەرانیدا، بە فـیڕۆی دەدات و و هاوڕێ و هاوکاری خراپکار و نەشیاو هەڵدەبژێرێ کە ڕواڵەتێکی دزێو و ناشیرین و، دەروونێکی پڕ لە ڕق و کینەیان هەیە و ئەرك و کاری گەورە و گرینگ، کە لەدەستیان نایەت، بـەو جـۆرە کەسانە دەسپێرێت، کەسانێك کە زانیارییان لەسەر ئەو شتانە نییە کـە ئـەنجامیان دەدەن. لـە حاڵێکدا کە دەرحەق بە گەورەپیاوان و کەسـانی شـیاو و لێهـاتوو و خزمـەتکارانی پێشـینیان خراپە دەکات. بە شێوەیەك کە ڕقی لێ هەڵدەگرن و لە هاوکاری و یارمەتیدانی خـۆ دەبـوێرن. هەروەها بە هۆی خەرج کردنی مووچە و مانگانەی هێزی سوپا لەڕێگەی هەوەسبازیی خۆیـدا، ڕەوشی سەربازیی بەرەو لەنێوچوون دەڕوات. گرینگییەك بە کاروباری سوپاییەکانی نادات و لە حاڵ و وەزع و ڕێکوپێك کردنی کارەکانیان ناپرسێت. لە ئاکامدا بناغەیەك کە پێشـینییەکانی دایانڕشتووە، هەڵدەوەشێتەوە و گشت بینا و کۆشکە بـەرزەکانی وێـران دەبـن. لـەم قۆناغـەدا سروشتی ڕزیوی و پـیری ڕوو لـە دەوڵـەت دەکـات و نەخۆشـییەکی درێژخایـەن کـە خـۆ لـێ دەربازکردنی گەلێك دژوارە، بەسەریدا زاڵ دەبێت و سەرەنجام تێك دەڕووخێ.(١٦)

پێنج قۆناغەکەی ئیبن خەلدوون لـە دەرکـەوتن و پێشـکەوتن و ژێرکـەوتنی دەوڵەتەکانـدا چەندین سەدە دوای ئیبن خەلدوون لە بۆچوون و تیۆرییەکانی هەندێك لە بیرمەندانی ڕۆژئاواییدا دەتوانرێ ببینرێ. بـۆ نموونـە ئیشـپینگلێری ئـەڵمانی، لـە کتێبـە بەناوبانگەکـەی بـە نـاوی

"ڕووخانی شارستانییەتی ڕۆژئاوا"، پەرەسەندنی بازنەیی مێژوو بەو شێوەیەی کە ئیبن خەلدوون باسی کردووە، خستوویەتەڕوو. ناوبراو قۆناغەکانی گەشەی شارستانییەتی لەگەڵ گەشەی مرۆڤ بەراورد کردووە و لەگەڵ لەبەر یەکتری ڕاگرتوون. بەم شێوەیە کە هەر شارستانییەتێك، بەهار و هاوین و پاییزێکی تێپەڕ کردووە و لە کۆتاییدا بە زستان گەیشتووە.

## چەمکی دەمارگیری:

زاراوەی دەمارگیری چەندین جار لە نووسراوەکانی ئیبن خەلدووندا دووپات بۆتەوە. نووسەران و بیرمەندان، ئەم زاراوەیەیان کە لەڕاستیدا تەوەری سەرەکی قسە و بۆچوونەکانی ناوبراوە، بە شێوازی جیاجیا شرۆڤە کردووە. لە سەردەمی ئێستادا زۆربەی کۆمەڵناسان، زاراوەی "یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی"(Solidarite)ی دۆرکایمیان بۆ چەمکی دەمارگیری بەکار بردووە، بەڵام ئەگەر بمانهەوێ بە شێوەیەکی کراوەتر توێژینەوە لەسەر ئەم زاراوەیە بکەین و شرۆڤەی بکەین، پێویستە ئاماژە بەو توێژینەوە و لێکدانەوانە بکەین کە لەم بارەوە ئەنجام دراون.

یەکێك لەو توێژەرانەی کە باسی ئیبن خەلدوون و بە تایبەت چەمکی دەمارگیریی ناوبراوی کردووە، "لاکۆست"(Lacoste) نووسەری کتێبی "جیهان بینی ئیبن خەلدون"ـە. ناوبراو لەبارەی چەمکی دەمارگیری و ئەو پێناسە جۆراوجۆرانەی کە لە لایەن نووسەران خراونەتەڕوو، دەنووسێ:"لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی ڕاڤەکاران و شیکەرەوەکانی "دەمارگیری"ی ئیبن خەلدوون سەرنجی واتا قووڵەکەیان نەداوە. هەندێکیان دەمارگیرییان تەنیا لەسەر بنەمای بەشێك لە دەرەنجامە سیاسییە لێ وەدەسهاتووەکانی پێناسە کردووە. هەندێکی دیکە پێناسەگەلێکیان بۆ خستۆتەڕوو کە لەگەڵ ناوەرۆکی گشتیی کۆمەڵناسی هاوواتایە. تاقمێکی تر دەمارگیریان لەگەڵ ئەو بارودۆخ و پێویستیانەی کە بوونەتە هۆی گەشە و بەهێزبوونی، بە یەکێك زانیوە. بە کورتی بە ئەژماری ڕاڤەکاران و شیکەرەوەکانی ئیبن خەلدوون، پێناسەی دەمارگیریش کراوە. بێجگە لەمەش ژمارەیەك لەوان یەك لەدوای یەك قسەکانی یەکتریان دووپات کردۆتەوە. لەم بارەیەوە، هەڵسەنگاندن و ڕەخنەگرتن لەو بۆچوون و شیکردنەوە جۆراوجۆرانە و ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ ناوەرۆکی "مقدمە" خۆی دەتوانێ یارمەتیمان بکات بۆ ئەوەی وردەوردە مانای ئاڵۆزی دەمارگیری ڕوون بکرێتەوە. هەندێکیان کە دەمارگیریان لە سەر بنەمای دەرەنجامەکانی پێناسە کردووە، ئەم زاراوانەیان پێشنیار کردووە: " جووڵەکردنی

دەوڵەت"، "هێزی حەیاتیی قەومیێك" و ... لە ڕوانگەی ڕۆزنتاڵ، دەمارگیری "هێزی بزوێنەری دامەزراندنی دەوڵەتە". پێناسەگەلی وەك "نیشتمان پەرستی"، "هەستی نەتەوەیی"، بە تەواوی ناڕاستە. ئەوانە چەمکگەلی نوێ و گشتین کە لەگەڵ بارودۆخی ئەفریقای باکوور لە سەردەکانی ناوەڕاستدا، هەرگیز یەکتر ناخوێننەوە و ناگونجێن. لەو سەردەمدا نەتەوە بە واتای دروستی وشە بوونی نەبووە و دامەزراوە عەشیرەتییەکان بە بنەما دادەنران. بۆ پێناسەی دەمارگیری چەمکە گشتییەکانی کۆمەڵناسیش کەڵکیان لێ وەرگیراوە وەك "ڕوحی گشتی"، "هاوپێوەندیی کۆمەڵایەتی"، "هاوپێوەندیی گرووپی"، "ئیرادەی هاوبەش" و "هاوپێوەندیی بە واتا بەربڵاوەکەی".

بە بڕوای "توین بی" (Toynbee) دەمارگیری بریتییە لە: " پێکهاتەیەکی ڕووحانی کە گشت ئەندامە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی لێ دروست کراون". ئەم پێناسەیە ئەگەرچی زێدەڕۆیانەیە، بەڵام گرینگیی دەمارگیری بە ڕوونی نیشان دەدات. تاقمێکی دیکە لە توێژەران کە بە شێوەیەکی گشتی دەمارگیریان بە هاوواتای هاوکاری زانیوە، ویستوویانە بە شێوەیەکی وردتر ڕوونی بکەنەوە. هەر بۆیە، زاراوەگەلێکی وەك هاوکاری لەسەر بنەمای جەنگاوەری و ڕووحیەی جەنگاوەری و چەك هەڵگرییان پێشنیار کردووە...

ژمارەیەکیش دەمارگیریان بە ڕوحی گرووپی یان ڕووحی کۆمەڵ یان ڕوحی گشتی، هێزی نزیکایەتیی خوێنی، غروری نەتەوەیی و ڕەگەزی زانیوە.

بەڵام ئیبن خەلدوون لە واتایەکی بەربڵاوتردا، بەکاری هێناوە و بە گرینگترین هۆکاری ڕوونکردنەوەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانی دەزانی. لەسەریەك هاوبەشیی ئەندامانی دەوڵەت لە کارە جۆراوجۆرەکاندا و هاوبەرژەوەندیی و هاوفکری بوونیان، وەدیهێنەری دەمارگیرییە.

دیارە بنەمای هاوبەشێتی ئەندامانی دەوڵەت هاوبەشێتیی ڕێژەییە. پێوەندیی خزمایەتی بێجگە لە هەندێك بابەتی کەمدا نەبێ، لە مرۆڤدا شتێکی سروشتییە و پێویستییەکەی نیشاندانی غرووری نەتەوەیی دەرحەق بە نزیکانە، لە کاتێکدا کە زوڵمێکیان لێ دەکرێت یان تووشی مەترسی ببنەوە، چونکە ئەندامی هەر بنەماڵەیەك کاتێك ببینێ کە یەکێك لە نزیکەکانی زوڵمی لێدەکرێ یان لەلایەن کەسانێکەوە دوژمنایەتی و دژایەتی لەگەڵ دەکرێت، نزمی و داماوییەك لەخۆیدا هەست پێدەکات." (١٧)

ئیبن خەلدوون لەسەر دەمارگیری لە پێوەندیی لەگەڵ ژیانی کۆچەریدا نووسیویەتی: " ... بەڵام لە شارە بچووك و گەورەکاندا بڕیاربەدەستان و دەوڵەت پێش بە دەسدرێژی هەندێك بۆ سەر

هەندێکی دیکە دەگرن و لە ڕێگەی دانانی یاساکان بە شێوەیەك ژێردەستەکان ملکەچ دەکەن کە ناتوانن دەسدرێژی بکەنە سەر یەکتر یان زوڵم لە یەکتر بکەن و بە هۆی هێزی زۆری دەسەڵاتداریتیی پاشایەتی ڕێگەیان پێنادرێت زوڵم لە یەکتر بکەن، مەگەر ئەوەی کە ستەمکاری لە لایەن خودی دەسەڵاتدارەوە دەستی پێبکرێت. لە حاڵەتێکدا کە لە دەرەوەڕا دەسدرێژی بکرێتە سەر شار، ئەگەر بێخەبەر بن، یان دوژمن بیهەوێ شەو لە ناخافڵێدا هێرشیان بکاتەسەر، یان لە ڕۆژدا توانای خۆڕاگرییان نەبێت، ئەوکات دیوارە بەرزەکانی دەوری شارەکە، پێش بە دەسدرێژییەکە دەگرن. ئەگینا لە کاتی ئامادەیی و توانایی خۆڕاگریدا، سوپای دەوڵەت و بەرگریکاران و پاسەوانانی شار، پێش بە هێزی دوژمن دەگرن و دووری دەخەنەوە. بەڵام عەشیرەتە کۆچەرییەکان بە شێوەیەکی دیکە پێش بە دەسدرێژی دوژمن دەگرن. لە ناوخۆیاندا، گەورەکان و بڕیاربەدەستانی عەشیرەت، پێش بە دەسدرێژی تاکەکان بۆ سەر یەکتر دەگرن، چونکە هەموویان ڕێز و حورمەتێکی تایبەتیان بۆ گەورەکانی عەشیرەکە هەیە. ئەگەر لە دەرەوەڕا دوژمنانێك بیانهەوێ هێرشیان بکەنە سەر وڵاتی ئەوان و شوێنەکانیان لەدەست دەربێنن، بێجگە لە پاسەوانانی عەشیرەت، جەنگاوەران و لاوانێك کە لەنێو عەشیرەتدا بە ئازایەتی و شەڕکەری بەناوبانگن و بەردەوام پارێزگاری و بەرگری لە عەشیرەت لە ئەستۆی ئەوانە، دەست بە بەرگری دەکەن و دیاردەی بەرگری و داکۆکی لە عەشیرەت حاڵەتی هەبوون بەخۆوە ناگرێت، مەگەر کاتێك کە لەنێویاندا دەمارگیری هەبێت و هەموویان لە خێزانێك و لە پشتێك بن لەم ڕووەوە دەسەڵات و توانایی ئەوان هێز دەگرێت و ترسی ئەوان لە دڵی کەسانی دیکەدا جێدەگرێ." (١٨)

ئیبن خەلدوون پێی وایە دوای ئەوەکە کۆمەڵگەی عەشیرەتی، ببێتە کۆمەڵگەیەکی یەکجێنشینی و دەوڵەت دابمەزرێ و بناغەکەی پتەو و جێگیر بێ، هێزی دەمارگیری بەرەبەرە لە خەڵك دوور دەکەوێتەوە و بە جێگەی ئەو خۆشگوزەرانی، لەش گرانی و شکۆپەرستی دێنەکایەوە و لە ئاکامدا سستی و خاوی و بەتاڵبوونەوەی کۆمەڵگە لەو خسڵەت و تایبەتمەندییانەی کە تاکەکانی لە بەرامبەر دژواریی و ئاستەنگییەکانی ژیان خۆڕاگر کردبوو، بواری هەڵوەشانی کۆمەڵگە و ڕووخانی دەوڵەت دەستەبەر دەکات و ئەم جێگۆڕکێی عەشیرەتەکان و بوونیان بە کۆمەڵگە یەکجێنشینەکان، بەردەوام درێژە دەکێشێ و ئەوە هەر ئەو تیۆرییەیە کە وەك پرۆسەی گەشەسەندنی بازنەیی مێژوو ناوی دەبرێت.

سەرچاوەی دەمارگیری لەسەر بنەمای بیروڕاکانی ئیبن خەلدوون دەتوانرێ لە هۆکارگەلی جیاوازدا بدۆزرێتەوە کە ئێمە لیرەدا تەنیا ئاماژەیان پێدەکەین، ئەم هۆکارانە بریتین لە:

**١ـ سرشت**

**٢ـ ڕەگەز و ڕەسەن**

مەبەست لـە ڕەگـەز ( ڕەچـەڵەك)، هـەبوونی باوەگەورەیـەك و دوایـی هـاتنی خێزانێـك، گرووپێك یان قەومێك بە تاکەکەسێك، بێئەوەی کە خوێنیـان لەگـەڵ خـوێنی کەسـانی دیکـە تێکەڵاو ببێ.

بەڵام ڕەسەن ( ڕێز و گەورەیی) دەتوانرێ بریتی لە غروری بنەماڵەیی، قەومی، نەتەوەیی و یان میراتە ماددی و مەعنەوییەکان بزانرێ کە کەسایەتی و حورمـەت بـە هـەموو تاکـەکانی قەومێك دەبەخشێ.(١٩)

**٣ـ ئایین**

**٤ـ ژینگەی جوگرافی و جۆری گوزەران**

ئیبن خەلدوون لە پێوەندیی لەگەڵ گۆڕانکاریی کولتوورەکـان و وەرگـرتنی کولتـووریش لـە کتێبی خۆیدا باسی هێناوەتە گۆڕێ. ناوبراو لەم بارەوە دەڵێت: "... فەرمانڕەواکان و پاشاکان، هەرکات بەسەر دەوڵەتێکدا سەرکەون و جڵەوی کاروبارەکان بەدەستەوە بگـرن، ناچـارن داب و ڕەسم و خووخدەکانی ڕۆژگارانی پێش خۆیان قبووڵ بکەن و زۆرێـك لـەوان وەربگـرن و بێجگـە لەمەش عادەتەکانی وەچەی خۆشیان لەبیر نەکەن، هەر بۆیە لە داب و ڕەسـم و ڕێوشـوێنەکانی دەوڵەتی ئەواندا، هەندێك ناکۆکی لەگەڵ ڕێوشوێنەکانی وەچەی یەکەم دێتە پێشەوە و دووبـارە کاتێك کە دوای ئـەم دەوڵەتـە، دەوڵـەتێکی دیکـەش بێتـە سـەرکار و ڕێوشـوێنەکانی خـۆی تێکەڵاوی ڕێوشوێنەکانی ئەو دەوڵەتە بکات، جارێکی دیکەش هەندێك ناکۆکی دێتـە کایـەوە کە بـە بـەراورد لەگـەڵ دەوڵـەتی یەکـەم توونـدترە. ئـەوکات بەرەبـەرە ئـەم ناکۆکییانـە لـە دەوڵەتەکانی دواتردا هەروا درێژەی دەبێت هەتا سەرەنجام بە دژایەتی و ناسـازی دەگـات. بـەم پێیە کاتێك کە نەتەوەکان و وەچەکان بە درێژایی ڕۆژگار و سـەردەمەکان، لـە دەسـەڵاتداری و وڵاتداریدا بگۆڕێن، ناکۆکیی لە عادەتەکانیشدا هەروا بەردەوام دەبێت و هاتنەئارای ئەم جـۆرە چلۆنایەتیانە شتێکی حەتمییە."(٢٠)

بە کورتی لەسەر بنەمای ئەوەی کە لە تیۆرییەکانی ئـیبن خەلـدوون لـە پێوەنـدیی لەگـەڵ پرۆسەی گەشەسەندنی بازنەیی(سووڕانی) مێژوودا دێتـەدی، کاتێـك سەحرانشـینان بـە هـۆی هەبوونی دەمارگیریی زیاتر بەسەر یەکجێنشینان‌دا سەردەکەون و پێویستییەکانی دامەزرانـدنی دەوڵەتێکی نوێ دابین دەکەن، سـەرۆکەکانی عەشـیرەت عـادەت بـە زریقـە و بریقـەی شـار و

خووخدەی شارەوە دەگرن و بەرەبەرە، بوێری و ئازایەتی و بەزیبكوزاكوونی و گشت خسـڵەت و تایبەتمەندییە باشەكانی چادرنشینی جێگەی خۆیان بە ترس و دڵەخورپێ و سسـتی و ڕوحیـەی خۆپارێزی دەدەن و لە ئاكامدا دەمارگیرییەكەیان بـەرەو لاوازی دەچـێت و بـواری ئـەوە دێتـە كایەوە بۆ ئەوەی عەشیرەتێكی دیكە كە خاوەن دەمارگیری بەهێزتر و توندترە، بەسـەریاندا زاڵ بێت و دەوڵەتێك كە عـەشیرەتەكەی پێشوو جێگیر كردبوو، هەڵوەشێننەوە و دەوڵـەتێكی دیكـە دامەزرێنن و ئەم خولە زنجیرەییە و پشت سـەری یەكـە هـەروا درێـژەی دەبێـت. بـەم شـێوەیە دەمارگیری بە هێزی بزوێنەری عـەشیرەت و مەرجی سەرەكی دامەزرانی دەوڵەت لەنێو خـەڵكی سەرەتاییدا لەقەڵەم دەرێت.

لە سەردەمی ڕێنسانس (Renaissance) واتـە قۆنـاغی ژیانـەوەی زانسـتی، ئـەدەبی و سیاسیی ئەورووپا، هەندێك لە بیرمەندان بە لاساییكردنەوە لەفەیلەسووفانی یۆنان دەستیان بـە یۆتۆپیاسازی یان دروستكردنی كۆمەڵگە ئارمانییەكان كرد. تایبەتمەندیی سـەرەكی ڕێنسـانس ئەوەیە كە بیرمەندان، فەیلەسووفان و نووسەران، هونەرمەندان و زانایانی ئـەو سـەردەمە، بـە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ پێوەندییان لەگەڵ بیرمەندانی كۆنی یۆنان و ڕۆما دامەزراندووە. (٢١)

لەم قۆناغەدا، ئارمانخوازی بە پێی نەریتی ئەفلاتوونی ژیایـەوە و هەنـدێك لـە بیرمەنـدان دەستیان بە دروستكردنی شارە خەیاڵی و یۆتۆپیاییەكان كرد.

یەكێك لەو كەسانە بیرمەندی بەریتانی تۆماس مور (Thomas More) لە كتێبی خـۆی بە ناوی یۆتۆپی (یۆتۆپیا) كە لە ساڵی ١٥١٦ی زایینی بـڵاو بۆتـەوە، شـێواز و هەلومـەرجی كۆمەڵگەیەكی تەواو دەخاتەڕوو. كۆمەڵگەی دڵخوازی تۆماس موور دوورگەیەكە كە لە پانتایی بەربـەرینی ئۆقیانووسـدا بـە ڕێكخسـتنی كۆمەڵایـەتی تایبـەت كـە ئامـانجی، خۆشـی و خۆشگوزەرانی تەواوی دانیشتووانی ئەو دوورگەیەیە.

تۆماسۆ كامپانێلا (Thommaso Campanela) بیرمەندی ئیتاڵیش لە كتێبی خۆی بە ناوی "شاری خۆر"(Cite du Soleil) كۆمەڵگەی دڵخواز و جێگەپەسندی خۆی وەسف كـرد كە كاریگەریی هزری ئەفلاتوونی تێدا بەرچاو دەكەوێت. (٢٣)

نووسـەران و زانایـانی فەلسـەفەی مێـژووش بـە خسـتنەڕووی تیۆریگـەلێك لـەبارەی گەشەسەندنی كۆمەڵگە مرۆییەكان لە هاتنەدی كۆمەڵناسیی نوێدا كاریگەرییان هەبووە.

( فەلسەفەی مێژوو) بریتییە لە " زانستێك كە تێیدا باس لە جووڵە، جووڵێنـەر، ڕێگـە و ئامانجی "مێژوو" دەكرێت.(٢٤) بەم پێیە فەلسەفەی مێژوو دەیهەوێ وەڵامی ئەم سێ پرسیارە

بداتەوە: ١ـ مێژوو بەرەو کوێ دەچێت ( ئامانج)، ٢ـ بە چ شێوەیك دەڕوات (میکانیزمی جوولّە، بزوێنەر)، ٣ـ لە چ ڕێگەیەکەوە دەڕوات ( ڕێباز و قۆناغە دیارەکانی جوولّەکە).
مێژوونووسان، بیرمەندان و توێژەرانێك کە بۆ دۆزینەوەی وەلاّمی ئەم پرسیارانە تیۆرییان خستۆتەڕوو، بە خاوەنانی فەلسەفەی مێژوو لەقەلّەم دەدرێن.

فەلسەفەی مێژوو لە سەدەی هەژدەهەمدا برەوی سەند، بەلاّم دەتوانرێ ئیبن خەلدوون بیرمەندی ئیسلامیی سەدەی چواردەیەمی زایینی بە بناغەدانەری ئەم زانستە بزانرێ. زانایانی فەلسەفەی مێژوو پێشوەچوون و گەشەسەندنیان بۆ کۆمەلّگەی مرۆیی بە کارێکی سروشتی زانیوە و پێیان وابووە کۆمەلّگەی مرۆیی جێگیر و بێجوولّە نییە، بەلّکوو بەردەوام لە حالّی گۆڕان دایە و بەرەبەرە لە قۆناغێك بۆ قۆناغێکی دیکە لە شارستانییەن دەچێت.

"ئارنۆلّد توین بی" یەکێك لەو فەیلەسووفانەیە کە بڕوای بە ڕەوتی گەشەسەندنی بازنەیی مێژوو هەیە و دووپاتبوونەوەی بە ڕووداوە دووپاتبووەکانی سروشت بەراورد دەکات. لە ڕوانگەی ئەوەوە مێژووی جیهان بەدوای یەکدا هاتنی هەلاّتن (دەرکەوتن) و ئاوابوونی شارستانییەتەکانە. هەر شارستانییەتێك لەدایك دەبێت، گەشە دەکات و سەرەنجام دەمرێت. توین بی لەم بارەوە دەلێت: " مێژووی مرۆڤ هەتا ئێستا بە واتایەکی گرینگ، تەنانەت لەو بوارانەی چالاکیی مرۆڤ کە تێیدا ئیرادەی مرۆیی لە بەرزترین ئاستی دەسەلاّتدارێتی و لە کەمترین ئاستی هاوولاّتیبوون دەرحەق بە سووڕانەوەی سروشتی ماددی بووە، دووپات بۆتەوە... و ئەگەر مێژووی مرۆڤ دووپات دەبێتەوە، ئەم دووپاتبوونەوەیە بە پێی ئاهەنگی گشتی جیهان ئەنجام دەدات ..."(٢٥)

هەروەها ناوبراو پێی وایە کە هەتا ئێستا نزیکەی بیست جار مێژوو بە دروستکردنی کۆمەلّگەگەلێکی وەك کۆمەلّگەی ڕۆژئاوایی دووپات بۆتەوە و ئەمڕۆکە کاتێك کە لێکدانەوە بۆ شارستانییەتەکانی لەناوچوو یان لە حالّی ئاوابووندا دەکەین و لەگەلّ یەکتر بەراوردیان دەکەین، هەندێك لێکچوون لە هەلّوەشانەوە و ڕووخانیاندا دەبینین. بەلاّم "توین بی" لە هەمان کاتدا بڕوای وایە کە کۆمەلّگەکان دەتوانن پێش بە هەلّوەشان و لەناوچوونیان بگرن: " بەلاّم ئێمە مەحکوومی هەبوونی مێژوویەکی دووپاتبۆوە نین. ڕێگە بۆ ئێمە کراوەیە کە لەڕێگەی هەولّەکانی خۆمان، ڕێگەیەکی نوێ و بێپێشینە بە مێژوو بدەین. ئێمە وەك بوونەوەرە مرۆییەکان خاوەن ئازادیی هەلّبژاردنین و ناتوانین بەرپرسایەتی خۆمان بخەینە ئەستۆی خوا یان سروشت، بەلّکوو دەبێ خۆمان بەئەستۆی بگرین. ئەمە ئەرکی خودی ئێمەیە..." (٢٦) و

له کۆتاییدا ناوبراو که خۆدوورگرتن له حەتمییەتی مێژوو به گونجاو دەزانێ، سێ ڕێگاچارە پێشنیار دەکات:

له باری سیاسییەوە دامەزراندنی حکومەتێکی مەرجداری جیهانی و له باری ئابوورییەوە، دۆزینەوەی ڕێگەیەك لەنێوان سۆسیالیزم و ئابووریی بازاڕ و له باری مەعنەویشەوە نوێکردنەوەی بناغەی ژیانی ئایینی له سێ پێشنیار یان سی ئەرکی پێشوو. "توین بی" زۆرترین پێداگری لەسەر بنەما ئایینییەکان کردووە.

ئیسواله ئیشپینگلێر فەیلەسووفی ئەڵمانی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم له فەیلەسووفەکانی دیکەی مێژوویە که بڕوای به ڕەوتی بازنەیی مێژوو (سووڕی مێژوو) هەبوو. ناوبراو کولتوورەکان بەو گیایانە دەشوبهێنێ که دەڕوێن (شین دەبن)، زیاد دەکەن، سیس دەبن و له کۆتاییدا دەمرن و بەم هۆیەوە ناوبراو بۆ شارستانییەتەکان، بەهار، هاوین، پاییز و زستانێکی لەبەرچاو گرتووە. بەهاری شارستانییەتەکانی لەگەڵ منداڵیی مرۆڤ بەراورد کردووە و هەر بەم پێودانگە، هاوینی لەگەڵ قۆناغی لاوێتی، پاییزی لەگەڵ پێگەیشتوویی و پیری و سەرەنجام زستانی شارستانییەتەکانی لەگەڵ مردنی مرۆڤەکان بەراورد کردووە.

له ڕوانگەی ئیشپینگلێر قۆناغی منداڵی یان بەهاری کولتوورەکان به ڕابوونی هەستی ئایینی دیاری دەکرێ و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی له جۆری باوکسالاری یان فیۆدالییە.

هاوینی کولتوورەکان به بڕوای ئیشپینگلێر قۆناغێکە که تێیدا "ڕوحی ڕەخنەگرانە" دەخولقێ و برەو دەستێنێ، له ئاییندا ریفۆرمگەلێك دێتەکایەوە و بۆ نموونە دەرکەوتنی "مارتین لۆتەر" و "کالڤین" له مەسیحییەتدا و بیرمەندانی وەك دیکارت و لایپینێتز دەتوانرێ له تایبەتمەندییەکانی ئەم قۆناغە بزانرێن.

پاییزی کولتوورەکان هاوکاتە لەگەڵ پێگەیشتنی کولتووری و پشکەوتنی هزر و عەقڵ. پرۆسەی ئاوەزخوازیی سەدەی هەژدەیەم و دەرکەوتنی بیرمەندانێکی وەك کانت، گوتە، هیگڵ و فیختە دەتوانرێ بۆ ئەم قۆناغە بگەڕێنرێنەوە. ئەم قۆناغە، سەردەمی دەسەڵاتداریێتی و بەربڵاویی حکومەتە.

سەرەنجام له زستانی کولتوورەکان له جیهانبینی مێژوویی ئیشپینگلێردا، حکومەتی عەقڵ، دوایین شوێنەوارەکانی نەریتەکان ڕادەماڵێت، زانستەکان مرۆڤ به دەسەڵات دەگەیەنن، جەماوەر کۆتوبەندە کۆنەکان دەپسێنن، شەڕی گەورە ڕوو دەدەن و له کۆتاییدا، ناهومێدی، ڕەشبینی، خەیاڵپەرستی و ئاڵۆزی دێتە کایەوە، زانست و هونەر نەزۆك دەبن و حکومەتی

دیکتاتۆری (سزاریزم) دادەمەزرێت، جەماوەر قەڵاچۆ دەکات و ئیمپریالیزم کە دوایین شێوازی سیاسی کولتووره، پاشماوەکانی هێزەکانی کولتوور لەناو دەبات و کۆتایی بە ژیانی دێنێت.(٢٧)

دیاره زۆر پێشتر له ئیشپینگلێر، ڕەزا قولیخانی هیدایەت لە درێژەی کتێبی ڕەوزەتولسەفا، لەو شوێنە کە قسە لەسەر لەناوچوون و هەڵوەشانی زنجیرەی سەفەوییە، ئەوە دەردەخا کە زنجیرەکان وەك مرۆڤەکان دەچن، چونکە قۆناغگەلێك تێپەڕدەکەن کە هاوڕێکە لەگەڵ منداڵی، پێگەیشتن و پیری لە مرۆڤدا. بە بڕوای ڕەزا قولیخان، سەردەمی سەفەوییە قۆناغی منداڵیی خۆی لە زەمانی شا ئیسماعیلی یەکەم و جێگرەوە لەیەك لەدوای یەکەکانی ناوبراودا تێپەڕ کردووە و لە سەردەمی شا عەبباسدا پێگەیشتووە و قۆناغی پیربوونیشی دواتر هاتۆتە پێشەوە.(٢٨)

لەنێو مێژوونووسان و فەیلەسووفانی مێژوو، گرووپێك بە خۆشبینییەوە لە ڕەوتی مێژوو دەڕوانن و گرووپێکی دیکە ڕەشبینانە سەیری ڕەوتی تێپەڕینی مێژوو دەکەن. گرووپی یەکەم بڕوایان وایە کە مرۆڤ بەرەبەرە پێش دەکەوێت و مێژووی مرۆڤ لە قۆناغی خراپتر بەرەو قۆناغی باشتر و لە بارودۆخی نزمتر بەرەو هەلومەرجی بەرزتر لە جووڵە دایە، بەڵام هەندێکیان ئەم پێشکەوتنە لە زانست و ژمارەیەکیان لە تکنیك و بەشێکیشیان لە زاڵبوون بەسەر سروشت و بەهرەمەندبوونی زیاتر لە سەرچاوە سروشتییەکانی دەزانن و بە کورتی بیرکردنەوەی ئەوان بە شێوەیەکە کە مرۆڤ لە داهاتوودا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ دەبێت. تاقمەکەی تر لە خاڵی بەرامبەری تاقمی یەکەمدا ڕاوەستاون. ئەوان بە جێگەی پێشکەوتنی مرۆڤ تیۆری لەناوچوون، هەڵوەشان و ڕووخانی شارستانییەنە مرۆییەکان دەخەنەڕوو. دەڵێن مرۆڤ قۆناغگەلی جۆراوجۆر تێپەڕ دەکات کە لە منداڵییەوە دەست پێدەکات و بە پیری و مەرگ دەگات. بەم پێیە، فەلسەفەی مێژوو لە لایەك بە تیۆری پێشکەوتن و لە لایەکی دیکەشەوە بە هەڵوەشان و لەناچوون پشت ئەستووره. هەندێك دەڵێن سروشتی مرۆڤ لە سەرەتادا توندوتیژ بووە، دوایی هێدی ونەرم بووە و دواتر بەرەو کونجکۆڵی ڕۆیشتووە و سەرەنجام بەرەو فەساد و گەندەڵی چووە و بە کورتی گەندەڵی و لەناوچوون قۆناغی کۆتایی سروشتی مرۆیی دەزانن. (٢٩)

فەیلەسووفانی مێژوو پێیان وایە کە هیچ دیاردەیەك لە کۆمەڵگەدا بێهۆکار نییە، بەم هۆیەوە ئەوان لە پەیدابوونی کۆمەڵناسیی زانستیدا بەشدارییەکی گرینگییان هەبووە. بەڵام لاوازیی فەلسەفەی مێژوو لەوەدایە کە زیاتر بە بیروڕا و تیۆرییە گشتیی و فەلسەفییەکان پشت

ئەستووره و دەیهەوێ بە جارێك یاسایەكی گشتی و گشتگیر بۆ پەیدابوون، گەشە و پەرەسەندنی كۆمەڵگە بدۆزێتەوە. لەحاڵێكدا كە یاساكانی كۆمەڵناسی ڕێژەیی و بەستراوە بە كات و شوێنن.

لەپەیدابوونی كۆمەڵناسی چەند لایەنێكی دیكەش كاریگەرییان هەبووە كە دەتوانین ئاماژە بە بزووتنەوە كۆمەڵایەتی ـ سیاسییەكانی ئەوروپا، بزاڤە ئازادیخوازییەكان، پێشكەوتنەكانی زانستە ئەزمونییەكان، پرۆسەی بەپیشەسازیبوون و ئاڵۆزیی پێكهاتەی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگە پیشەسازییەكان بكەین.

كۆمەڵناسیی نوێ لە هەوڵ و كۆششەكانی بیرمەندان و ڕیفۆرمیستە كۆمەڵایەتییەكان و ڕەوتە هزرییە جۆراوجۆرەكان و ئەو پێشكەوتنانەی كە لە زانستەكانی دیكەدا بەدەست هاتوون و بە تایبەت گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتییەكانی سەدەكانی هەژدە و نۆزدەی كۆمەڵگەی ئەورووپا، سوودی زۆری وەرگرتووە. "گاستۆن بۆتۆل" لە كتێبی مێژووی كۆمەڵناسی سەبارەت بە پەیدابوونی ئەم زانستە نووسیویەتی: " گرینگترین زانستی دیاردە كۆمەڵایەتییەكان لە كاتە قەیراناوییەكان یان لە كاتی ڕۆچوون لە قەیرانێكدا واتە كاتێك كە ڕووداو و پێشهاتەكان لە چوارچێوەی ئاسایی دەچنەدەر و ڕێگە چارەی ئاسایی تێیدا كاریگەر نییە، بەرهەم هاتووە."(٣٠)

دەتوانرێ بگوترێ كاتێك كە بارودۆخی كۆمەڵگە ئارام و جێگیرە و ڕەوتی ئاسایی خۆی تێپەڕ دەكات، كەمتر پێویستی بە بیركردنەوە و لێكدانەوە لە بوارە كۆمەڵایەتییەكان هەست پێدەكرێت. بەڵام كاتێك كە كۆمەڵگە تووشی دۆخێكی قەیراناوی دەبێت و پشێوی دێتە كایەوە، بیرمەندان و توێژەران و ڕیفۆرمیستە كۆمەڵایەتییەكان وەجووڵە دەخات بۆ ئەوەی كاروبار و دیاردەكۆمەڵایەتییەكان هەڵسەنگێنن و بە مەبەستی چارەسەركردنی كێشە كۆمەڵایەتییەكان هەنگاو هەڵێننەوە. بەم شێوەیە گۆڕانكارییە جۆراوجۆرە كۆمەڵایەتییەكان، شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا و شۆڕشی گەورەی فەڕەنسا، جیهانی جێگیر و ڕاوەستاوی سەدەكانی ناوەڕاستیان تووشی گۆڕانكاریی كردەوە و بواری دەركەوتن و سەرهەڵدانی كۆمەڵناسیی نوێیان دەستەبەر كردووە. لەنێو ئەو بیرمەندانەی كە لە هاتنەدی كۆمەڵناسیی نوێدا شوێندانەر بوون، مۆنتسكیۆ جێگە و پلەیەكی بەرزی هەیە.

مۆنتسکیۆ (Montesquieu) بڕوای وایە کە کەشوهەوا کاریگەریی لەسەر باری ژیان و گوزەران و ئەخلاق و پەروەردە و فێرکردن هەیە. گرینگترین شت لە ڕوانگەی ئەودا یاسایە، چونکە بە هۆی ئەوەوە ئازادیی و کەرامەتی مرۆیی دابین دەکرێت. یاسا (قانوون) بنەمای توێژینەوە و دیراساتەکانی ناوبراو پێك دێنێ. ناوبراو تەنانەت گرینگی بە چەمکی ڕێژەیی لە یاساکانی کۆمەڵیش داوە. بە بڕوای ئەو یاسا دەبێ بە سەرنجدان بە داب و ڕەسم و باوەڕ و بنەما ئایینییەکانی خەڵك دابنرێ ئەگینا شیاوی جێبەجێکردن نییە. مۆنتسکیۆ بە بەکارهێنانی یاسا لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا لە هاتنەکایەی کۆمەڵناسیی نوێدا، کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبووە و بەم هۆیەوە زۆر لە کۆمەڵناسان ئەو بە گەورەترین بیرمەندی کۆمەڵایەتی سەدەی هەژدەهەم و لە پێشڕەوانی کۆمەڵناسی نوێ دەزانن. خاڵی جێگەی سەرنج ئەو خاڵە هاوبەشەیە کە لە باری کاریگەریی هۆکارە ژینگەی جوگرافیایی لەسەر تایبەتمەندییە جەستەیی و دەروونییەکانی مرۆڤ و ڕەوشی ژیان و جۆری شارستانیەت، لە نێوان بۆچوونەکانی ئیبن خەلدوون و مۆنتسکیۆدا هەیە و بەم هۆیەوە هەندێك لە توێژەران بۆ نموونە هامێر (Hammer) کە نامیلکەیەکی لەبارەی مێژووی ئیسلام و بیروڕا و تیۆرییەکانی ئیبن خەلدوون بە زمانی ئەڵمانی بڵاوکردۆتەوە، نازناوی مۆنتسکیۆی عەرەبی بە ئیبن خەلدوون بەخشیوە.(٣١)

دەبێ "سان سیمۆن"(Saint Simon)یش وەك یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسیی نوێ باسی بکرێت. ئەو یەکەم کەسێکە کە کۆمەڵگە مرۆییەکان وەك واقعییەتێکی تایبەت و جیاواز لە واقعییەتەکانی دیکە لەبەرچاو گرتووە. (٣٢) بە بڕوای ئەو بە هەمان شێوە کە زانستە سروشتییەکان تاوتوێ دەکرێن، کاروبار و بابەتە کۆمەڵایەتییەکانیش دەتوانرێ لێکدانەوەیان بۆ بکرێت. لەگەڵ ئەمەشدا خۆی گرینگیی بە کاروبارە مەعنەوییەکان دەدات و هەوڵ دەدات ئایینێك بۆ بەختەوەری ڕەگەزی مرۆڤ دابهێنێت.(٣٣)

پێشکەوتنەکانی زانستە سروشتییەکان و دۆزینەوە نوێیەکان کە لە بوارەکانی زانستە ئەزموونییەکاندا بەدەست هاتوون، بیرمەندان و زانایانی هێنایە سەر ئەو قەناعەتە کە لە ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ و ناسینی کۆمەڵگە مرۆییەکان کەڵك لە میتۆدەکانی زانستە ئەزموونییەکان وەربگرن.

ئۆگست کۆنت (Auguste Comte) قوتابیی سان سیمۆن دوای توێژینەوەی زۆر سەرەنجام بەو ئاکامە گەیشت کە بۆ توێژینەوەی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان زانستێکی سەربەخۆ پێویستە

که کاروباره کۆمەڵایەتییەکان بە کەڵك وەرگرتن لە میتۆدەکانی توێژینەوە لە زانستە سروشتییەکاندا تاوتوێ بکات و هەر بۆیە ئەو سەرەتا ناوی فیزیکی کۆمەڵایەتی ( Physique Sociale) لەسەر ئەم زانستە دانا، دواتر زاراوەی Sociologieبۆ هەڵبژارد. ئۆگست کۆنت لە پۆلێنبەندیی خۆی لە زانستەکان، کۆمەڵناسی لە دواین پلەدا دانا. بەم شێوەیە زانستەکانی بەسەر شەش دەستە بە شێوەی خوارەوە دابەش کرد:

**١ـ ماتماتیك**

**٢ـ ئەستێرەناسی**

**٣ـ فیزیا**

**٤ـ کیمیا**

**٥ـ بایۆلۆژیا**

**٦ـ کۆمەلناسی**

ئۆگست کۆنت ڕێکوپێکیی و دیسیپلینێك کە بەسەر ئەم پۆلێنبەندییەدا زاڵە، " گشتێتی ڕوو لە کەم بوون، تێکەڵکاری و ئاڵۆزیی ڕوو بە زیادبوون" ناو دەنێ و پێی وایە کە: یەکەم زانستە ئاسان و سادەکان، لەسەرووی زانستەکانی دیکەن و هەرچەند لەم پۆلێن بەندییە بەرەو خوارەوە بێین، بابەتەکە وردتر، ئاڵۆزتر و گەیشتن بە یاسا دژوارتر دەبێت.

دووهەم ئەوەکە زانستەکانی خوارتر بەستراوە بە زانستەکانی سەرەوەن. بۆ نموونە ماتماتیك پشت ئەستوور بە هیچ زانستێك نییە بەڵام زانستەکانی دیکە وەك ئەستێرەناسی و فیزیا و کیمیا پێویستییان بە ماتماتیك هەیە.

سێهەم ئەوەکە زانستە سادەترەکان ( بە سەرنجدان بە یاسای قۆناغە سێیانییەکان)، خێراتر قۆناغەکانی یەکەم و دووهەمیان تێپەڕاندووە و بە قۆناغی پۆزێتیڤ کە لە ڕوانگەی ئۆگست کۆنتەوە قۆناغی پیگەیشتوویییە، گەیشتوون.

ماتماتیك سەردەمێکی دورودرێژە کە پێی ناوەتە قۆناغی پۆزێتیڤ یان ئەزموونی و، کۆمەڵناسی دواین زانستە کە پێ دەنێتە ئەم قۆناغەوە. بەم پێیە ماتماتیك سادەترین و کۆمەڵناسی ئاڵۆزترین زانستە. ئۆگست کۆنت پێی وابوو کە کۆمەڵەکانیش هەروەك زانستە ئەزموونییەکان دەبێ لە میتۆدە ئاساییەکان لەم زانستە واتە پشت ئەستوور بوون بە تاقیکاری و تێڕامان و ئەزموون تاوتوێ بکرێن و لە قۆناغی پۆزێتیڤیزم کۆمەڵناسی بەدوای دۆزینەوەی

پەیوەندییە هۆکردییەکانی زاڵ بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدایە. ناوبراو کۆمەڵناسی بۆ دوو بەش، دابەش دەکات:

**ئا ـ کۆمەڵناسیی ستاتیک یان جێگیر**

**ب ـ کۆمەڵناسیی دینامیك یان گۆڕاو**

بەشی یەکەم توێژینەوە لەسەر ڕێکوپێکیی دەکات بە دەستەواژەیەکی دیکە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لەحاڵەتی جێگیریدا تاوتوێ دەکات و بابەتی ئەو جێگیری، هاوسەنگی و پێکهاتەی کۆمەڵگەیە.

بەشی دووهەم دیراسەی گۆڕانکاریی دەکات و ئۆگست کۆنت یاسای قۆناغە سێیانییەکانی ( یەزدانی، میتافیزیکی و پۆزێتیڤ)ی لەسەر ئەم بنەمایە ڕوون کردۆتەوە.

ڕێمۆن ئارۆن بیرمەندی هاوچەرخی فەڕەنسی، ستاتیکی و دینامیکی لە ڕوانگەی ئۆگست کۆنتەوە بەم شێوەیە شرۆڤە کردووە: " ستاتیك (جێگیر) و دینامیك (گۆڕاو) دوو بەشی سەرەکی کۆمەڵناسیی "ئۆگست کۆنت"ن. ستاتیك لە بنەڕەتدا توێژینەوە لەسەر بابەتێك دەکات کە ئەو بە " هاوڕایی" ناو دەبات. کۆمەڵگە وەك بوونەوەرێکی زیندوو دەچێت و بە هەمان شێوە کە تاوتوێی ئەرکی ئەندامێك لە ئەندامەکانی جەستەی بوونەوەری زیندوو، بەبێ پێکەوەگرێدانی لەگەڵ گشت بونەوەرە زیندووەکە مەیسەر نابێت، تاوتوێی سیاسەت و دەوڵەتیش بەبێ دانانیان لە گشت کۆمەڵگە لە کاتێکی دیاریکراو لە مێژوودا مەیسەر نابێت. بەم پێیە جێگیریی کۆمەڵایەتی لە لایەکەوە شیکردنەوەی توێکارانەی پێکهاتەی کۆمەڵگە لە کاتێکی دیاریکراو لە مێژوو لەخۆ دەگرێت و لە لایەکی دیکەشەوە، شیکردنەوەی ئەو فاکتەرانەی کە " هاوڕایی" یان " سازان (گونجان)ی کۆمەڵایەتی" پێك دێنن، دەگرێتەوە. واتە لەڕاستیدا شرۆڤەی ئەو فاکتەرانەی کە لە کۆی تاکەکان یان سەرجەمی خێزانەکان، کۆمەڵێك و لە ژمارە و فرەیی دامەزراوەکان، یەکەیەکی یەکگرتووی کۆمەڵایەتی دروست دەکەن. بەڵام ئەگەرچی "ستاتیك" تاوتوێی هاوڕایی یان گونجانی کۆمەڵایەتی دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا ئێمە لە دۆزینەوەی فاکتەرەکان و ئەندامانی سەرەکی هەر کۆمەڵگەیەکدا ڕێنوێنیی دەکات بۆ ئەوەی لە سەرویی جۆراوجۆریی کۆمەڵگە مێژووییەکان، بتوانین بنەماکانی هەر ڕێکوپێکییەکی کۆمەڵایەتی بدۆزینەوە..."

دینامیك (گۆڕاو)ی کۆمەڵایەتی ئەو قۆناغانەی کە کۆمەڵگە مرۆییەکان تێپەڕیان کردووە، وەسف دەکات، بەڵام دینامیکی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیە کە ئۆگست کۆنت خستوویەتەڕوو،

لەگەڵ مێژووی ئەو مێژوونووسانەی کە ڕووداوەکان دەنووسنەوە، جیاوازی هەیە. لە ڕوانگەی ئەوەوە دینامیکی کۆمەڵایەتی قۆناغە یەك لەدوای یەك و پێویستەکانی گۆڕانکاریی زەینی و هزری مرۆڤ و کۆمەڵگە مرۆییەکان دیراسە دەکات. ستاتیکی کۆمەڵایەتی ڕێکوپێکیی سەرەکی هەر کۆمەڵگەیەك دەردەخات لەحاڵێکدا کە دینامیکی کۆمەڵایەتی ئەو هەوراز و نشێوانەی کە ئەم ڕێکوپێکییە سەرەکییە پێش گەیشتن بە قۆناغی کۆتایی پۆزێتیڤیزم تێپەڕیان دەکات، نیشان دەدات. دینامیك، شوێنکەوتووی ستاتیکە، چونکە لەسەر بنەمای تەکووزیی هەر کۆمەڵگەیەکە کە دەتوانین بزانین مێژوو چییە. ستاتیك، تەکووزی و دینامیك گۆڕان و پێشوەچوون بەبیر دێنێتەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە "پێشکەوتن، گەشە و ڕێکوپێکییە".

ستاتیکی کۆمەڵایەتی لە هەنگاوی یەکەمدا وەك زانستی توێکارییە کە چۆنییەتی ڕێکخراوبوونی فاکتەرە جیاوازەکانی پێکهێنەری کۆمەڵگە تاوتوێ دەکات، بەڵام چونکە بابەتی کۆمەڵناسی، مێژووی مرۆڤایەتییە کە بە شێوەی تاقە قەومێك لەبەرچاو دەگیرێت، ستاتیکی توێکاری بە ئاسانی دەبێتە شیکردنەوەی بنەما وبناغەی هەر کۆمەڵگەیەك و لەبەر ئەوەکە لە بنەرەتدا مێژوویەك زیاتر بوونی نییە، لە ڕێگەی دیراسەی ستاتیکییەوە دەتوانرێ بە تایبەتمەندییە پێکهاتەییەکانی هەر کۆمەڵگەیەك بگەین.(٣٤)

## سێ قۆناغەکە:

بە بڕوای ئۆگست کۆنت، هزری مرۆڤ تا ئێستا بە سێ قۆناغی یەك لەدوای یەکدا تێپەڕیوە و لەسەر بنەمای هەریەك لەم زەینییەتانە کۆمەڵگەیەکی تایبەت بە تایبەتمەندیگەلێکی دیاریکراوەوە بەدی هاتووە. ئەم سێ قۆناغە بریتین لە:

**١. قۆناغی یەزدانی (ئایینی، لاهووتی)** (Theology)

**٢. قۆناغی میتافیزیکی** (Metaphysic)

**٣. قۆناغی پۆزێتیڤ (وەزعی)** (Positivism)

قۆناغی یەزدانی قۆناغێکی وەهمی و خەیاڵییە و زەینی مرۆڤ دیاردەکان بۆ بوونەوەر و هێزەکانی شیاوی بەراوردکردن لەگەڵ مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە تاکەکانی کۆمەڵگە بڕوایان بە خواوەند و ئەفسانە و شتی لەم بابەتە هەیە و گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگە و ڕەوتی ڕووداوەکان بە پێی بوون و دەسەڵاتی ئەوان شرۆڤە دەکرێن.

قۆناغی میتافیزیکی یان فەلسەفی، قۆناغێکە کە تێیدا بەڵگەهێنانەوە و بیرکردنەوە و لۆجیکێکی تایبەت جێگەی خەیاڵ دەگرێتەوە و هزری مرۆڤ بۆلای هۆکارە سەروسروشتی و میتافیزیکییەکان دەچێت. بە بڕوای ئۆگست کۆنت ئەم قۆناغە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ قۆناغی پێشوو نییە و تەنیا بواری ڕۆیشتن بەرەو قۆناغی سێهەم کە ئەو بە پۆزێتیڤی ناو دەبات، ئامادە دەکات.

لە قۆناغی پۆزێتیڤ هزری مرۆڤ بەدوای دۆزینەوەی پەیوەندیی هۆ و بەرهۆیی نێوان دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە. بە دەربڕینێکی دیکە هەوڵ دەدات یاساکانی زاڵ بەسەر دیاردەکان بدۆزێتەوە. بە وتەی ڕیمۆن ئارۆن: یاسای قۆناغە سێیانەییەکان لە هزری ئۆگست کۆنتدا کاتێک واتای دروستی خۆیان وەردەگرن کە یاسای پۆلێنبەندی کردنی زانستەکان تێکەڵاو بێ و ڕێکوپێکییەك کە بەسەر پۆلێنبەندی زانستە جۆراوجۆرەکاندا زاڵە، لەڕاستیدا نیشانەیەکی ئاشکرایە کە ڕێکوپێکییەك کە بە هۆی ئەوەوە هزری مرۆیی لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا حاڵەتێکی ئیجابی و پۆزێتیڤ بەخۆوە دەگرێت، واتە شێوازی بیرکردنەوەی پۆزێتیڤ لە ماتماتیك، فیزیا، کیمیا، زووتر لە بایۆلۆژیا جێگیر بووە. سرووشتییە کە شێوازی هزری پۆزێتیڤ لەو زانستانەی کە ئاڵۆزیی زیاتریان تێدایە، درەنگتر دەردەکەوێ. هەرچەند بابەتەکە سادەتر بێ، ئاسانتر دەتوانرێ تێیدا بیر لە شێوازی پۆزێتیڤ بکرێتەوە.

مەبەست لە تێکەڵاوکردنی یاسای قۆناغە سێیانییەکان یان ڕێکوپێکیی پەیوەندیدار بە پۆلێنبەندی زانستەکان، سەلماندنی ئەم خاڵەیە کە شێوازی بیرکردنەوەیەك کە لە ماتماتیك، فیزیا، کیمیا و بایۆلۆژیادا باوە، لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانیشدا بەرەو بستێنێ بۆ ئەوەی زانستێکی پۆزێتیڤ لە کۆمەڵگەدا بە ناوی کۆمەڵناسی وەدی بێت.

تایبەتمەندییەکانی جۆری کۆمەڵگەیەك کە لەگەڵ هەر یەك لە قۆناغە سێیانییەکان بەراورد بکرێ، دەتوانرێ بەم شێوەیە نیشان بدرێ:

| قۆناغە سێیانییەکان | جۆری کۆمەڵگە | یەکەی کۆمەڵایەتی باڵادەست | چوارچێوەی کۆمەڵگە | جۆری پەیوەندیی کۆمەڵایەتی |
|---|---|---|---|---|
| یەزدانی | پەلاماردەرانە | خێزان | خێزان | هاوپێوەندیی سۆزداری |
| میتافیزیکی | بەرگری | دەوڵەت | بەکۆمەڵ | ڕێز و حورمەت |
| پۆزێتیڤ | پیشەسازی | مرۆڤدۆستی | جیهانی | هاوکاری |

بە پێی خشتەی سەرەوە لە قۆناغی یەکەمدا کە کۆنت بە قۆناغی یەزدانی ناوی دەبا، سیستەمی مەوجوود لەسەر بنەمای خێزانە و هەستی سۆزداریی توند بەسەر کۆمەڵگەدا زاڵە. بە واتایەکی دیکە پەیوەندیگەلێك لە جۆری پەیوەندیی باوك و مناڵەکان، بنەمای پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. بەم شێوەیە پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە وەك ئەندامەکانی خێزانێك لەسەر بنەمای هاوپێوەندیی سۆزداری توندی نێوانیانە.

قۆناغی دووەم واتە قۆناغێك کە بە میتافیزیکی ناو براوە، یەکەی کۆمەڵایەتی باڵادەست، دەوڵەتە. لەم قۆناغەدا حکومەتی فەرمی و یاسایی بەدی هاتووە. پەیوەندیی زاڵ، پەیوەندییەکی بەکۆمەڵە نە تەنیا خێزانی و هەستەکانی تاکەکان لە بەرامبەر یەکتردا شێوەی ناسینی مافەکانی یەکتر و ڕێزی دوولایەنە دەردەکەوێ.

سەرەنجام لە قۆناغی سێیەمدا کە کۆنت بە قۆناغی پۆزێتیڤ ناوی دەبات، ئینسانییەت و مرۆڤدۆستی جێگەی دەوڵەت دەگرێتەوە و چوارچێوەکەی نە تەنیا کۆمەڵگەیەکی تایبەت بەڵکوو کۆمەڵگەی جیهانیش لەخۆ دەگرێت.

لە قۆناغی پۆزێتیڤدا پەیوەندیی هۆ و بەرهۆ (ئەنجام) بەسەر دیاردەکاندا زاڵە و هەوڵی کۆمەڵناسیش بۆ ئەوەیە ئەم پەیوەندییە بدۆزرێتەوە. قۆناغی گونجان لەگەڵ ڕاستییەکانە. لەم قۆناغە هزر لە جیاتی بەستنەوەی دیاردەکان بە هۆکاری ناسروشتی دەست بۆ دروستکردنی پەیوەندیی هۆ و ئەنجام دەبات و چاوەدێریکردن و تاقیکردنەوە جێگەی وەهم و خەیاڵ دەگرێتەوە.

لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا، بیروڕاکانی ئۆگست کۆنت گۆڕانکاریی گشتییان بەسەردا هات و لەو شتەی کە لە پەیوەندیی لەگەڵ پۆزێتیڤیزم بڕوای پێی هەبوو، پاشگەز بۆوە و ڕێبازێکی نوێی بە ناوی مرۆڤدۆستی هێنایە کایەوە، پەرستگەی دروست کرد و ڕێوڕەسم و بۆنەی تایبەتی پێك هێنان. دەتوانین بڵێین ڕۆڵی پاپای ئایینی مرۆڤدۆستانەی دەگێڕا. ناوبراو ئەو کەسانەی بە بڕوادارانی ئایینی نوێ دەزانی کە مرۆڤایەتیان خۆش بوێت و خزمەت بە هاوڕەگەزی خۆیان

بکەنە سەرمەشقی ژیانیان و دەیگوت: لە مرۆڤدۆستیدا، عەشق سەرەتا، ڕێکوپێکی بنەما و پێشکەوتن ئامانجە.(٣٥)

**دۆرکایم** لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسی و یەکەم کەسە کە بە شێوازی زانستی لە کۆمەڵناسیدا دەستی بە توێژینەوە کردووە. کتێبی "خۆکوشتن" کە بەرهەمی بەناوبانگی ناوبراوە، ئاکامی توێژینەوەیەکی بەربلاوە کە لە پەیوەندیی لەگەڵ ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییەدا نووسراوە. دۆرکایم بە یەکێك لە خاوەنانی ڕێبازی ڕەسەنایەتی کۆ (کۆمەڵگە) لەقەڵەم دەدرێت. بە بۆچوونی نابراو دەبێ لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وەك شتێك لەبەرچاو بگیرێن و هەر بەو میتۆدانە دەبێ توێژینەوەیان لەسەر بکرێ کە لە زانستەکانی دیکەدا باون. ئەم بۆچوونانەی دۆرکایم ڕەخنەی زۆری ڕووبەڕووی ناوبراو کردەوە و بەم هۆیەوە لە چاپی دووهەمی کتێبی " ڕێساکانی میتۆدی کۆمەڵناسی" لەم بارەوە دەنووسێ:

" ئەم حوکمە کە دەبێ وەکوو شت سەیری واقیعە کۆمەڵایەتییەکان بکرێ، واتە حوکمێك کە بنەمای میتۆدی ئێمەیە یەکێك لەو حوکمانەیە کە زیاتر لە هەموو شتێك بۆتە هۆی گفتوگۆ و قسە لەسەر کردن، هەندێك کەس ئەمە بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی دروست و عەقڵی سەلیم دەزانن و پێیان سەیر بووە کە ئێمە واقیعەکانی جیهانی دەرەوە و واقیعەکانی جیهانی کۆمەڵایەتی بە یەکسان دادەنێین، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە واتا و سنووری ئەم یەکگرتنە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بە هەڵە چوون. بابەتی ئەم یەکبوونە ئەوە نییە کە فۆرمە باڵاکانی بوون دابەزێنین بۆ فۆرمە نزمەکانی، بە پێچەوانەوە مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە بە ئەندازەی فۆرمە نزمەکانی بوون واقعییەت بە فۆرمە باڵاکانی بوون بدرێ. بە دەستەواژەیەکی دیکە، ئێمە ناڵێین کە واقیعە کۆمەڵایەتییەکان شتگەلێکی ماددین، ئێمە دەڵێین ئەم واقیعانە وەك شتە ماددییەکانن بەڵام شتبوونیان بە جۆرێکی دیکەیە".(٣٦)

دۆرکایم لە جێگەیەکی دیکە لە باسەکەی خۆی لەمەڕ "شت"بوونی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان نووسیویەتی:

"ئەوەی مەبەستە لەم ڕێسایە ئەوەیە کە کۆمەڵناس دەبێ حاڵەتێکی دەروونی تایبەت بەخۆوە بگرێت کە فیزیکزان و کیمیازان و زانایانی بایۆلۆژیا ئەو کاتە بەسەر خۆیاندا دێنن کە هەنگاو دەنێنە ناوچەیەکی دۆزینەوەی تازەوە لە ئاقاری خۆیاندا. کۆمەڵناس ئەو کاتەی دەچێتە ناو جیهانی کۆمەڵایەتییەوە دەبێ هۆشی لەسەر ئەوە بێ کە پێدەنێتە ناو جیهانێکی

نەناسراو. دەبێ خۆی لە بەرامبەر ئەو واقیعانەدا ببینێتەوە کە هەمووان لە یاساکانیان، واتە یاساکانی ژیان پێش دروستبوونی زیندەوەرزانی، بێخەبەرن. دەبێ خۆی بۆ ئەو دۆزینەوانە ئامادە بکات کە دەبێتە هۆی سەرسوڕمانی... لە دۆخی هەنووکەیی زانستدا، ئێمە گرینگترین دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان وەك دەوڵەت، بنەماڵە و تەنانەت خاوەندارێتی و گرێبەست و تاوان و بەرپرسایەتی بەو شێوەیە کە پێویستە، ناناسین و دەتوانین بڵێین بە تەواوەتی لە هۆکار و دەرەنجام و ئەرکەکانی یاسای گۆڕانیان، بێئاگاین و ئەگەر لە هەندێك لە بابەتەکان بە تازەیی بە هەندێك شت گەیشتووین، ئەم بابەتانە زۆر کەمن. (٣٧)

دۆرکایم لە کتێبی بەناوبانگی خۆی لەژێر ناونیشانی "دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتی" کە لەساڵی ١٨٩٣ بڵاوی کردۆتەوە، لە پەیوەندیی لەگەڵ کۆمەڵگەکاندا دوو جۆر هاوپێوەندی دەخاتە بەرباس کە یەکێکیان هاوپێوەندی و یەکگرتوویی میکانیکییە و ئەوەی دیکە هاوپێوەندی یان یەکگرتوویی ئۆرگانیکی. بە وتەی ئەو دابەشکردنی کار بۆتە هۆی گۆڕانکارییەکی گەورە لە کۆمەڵگەکاندا و لەڕاستیدا بە هۆی دابەشکردنی کارە کە کۆمەڵگەی نەریتی کە لەسەر بنەمای یەکگرتوویی میکانیکییە، دەبێتە کۆمەڵگەی پیشەسازی لەسەر بنەمای هاوپێوەندیی ئۆرگانیکی.

دۆرکایم لە تایبەتمەندییە دیمۆگرافییەکانی کۆمەڵگەکاندا بەدوای هۆکاری پێکهاتنی دابەشبوونی کاردا گەڕاوە و پێی وایە کە حەشیمەتێکی کەم بەبێ پەنابردن بۆ دابەشکردنی کاری ئاڵۆز دەتوانێ درێژە بە ژیانی خۆی بدات، خێزانە بەربڵاوەکان کەڵك لە تاکە تکنیکێك وەرگرن و بەهرە لە سەرچاوەکانی گوزەرانیان ( کشتوکاڵ، ڕاوەماسی و ..) وەربگرن.

بەڵام لە دۆخێکدا کە حەشیمەت بەرەو زیادبوون بچێت، درێژەی ژیان تەنیا بە ئەنجامدانی دابەشکردنی کار بەسەر کاروبارە جیاوازەکاندا و بە گەشەی پسپۆڕێتی و زیادبوونی ئەرکەکان مەیسەر دەبێت. دۆرکایم بەو دەرەنجامە دەگات کە کەڵەکەبوونی حەشیمەتی تەنیا بە دابەشکردنی کار کۆتایی نایەت و دەرەنجامی ئەم کەڵەکەبوونە دەبێتە هۆی هاتنەئارای کۆویژدان، بەم شێوەیە کە بە زیادبوونی پەیوەندیی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر و نزیك بوونەوەیان لە یەکتر، دەبێتە هۆی جووڵەیەکی گشتی لە ئاستی کۆمەڵگەدا کە داهێنەری و لە کۆتاییدا پێشکەوتنی شارستانیەتی لێ دەکەوێتەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، کارلێکی دولایەنە یان کاریگەریی دوولایەنەی تاکەکان لە

پەیوەندییە مرۆییەکاندا هۆکاری سەرەکی شارستانیەتە. کۆویژدان وەك مۆتۆر یان هێزی بزوێنەری گەشەی کۆمەڵگەکان و سەرچاوەی شارستانیەت، لەڕاستیدا بەرهەمی بەهێزبوون و فرەیی کارلێکە دوولایەنەییەکانی تاکەکانە. بەم شێوەیە دۆرکایم توانی بە دامەزراندنی پێوەندییەکی دوو لایەنەی هۆکردیی بگات: یەکەم ئەوەکە گەشە و کەڵەکەبوونی حەشیمەتی هاوکات دەبێتە هۆی پێشکەوتنی دابەشکردنی کار و کۆویژدان. دووهەم ئەوەکە کەڵەکەبوون و دابەشکردنی کار بە نۆری خۆیان وەك هۆکارە سەرەکییەکانی شارستانییەن واتە گەشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووری لەقەڵەم دەدرێن. ئەم پێوەندییە دولایەنە هۆکردییە بە شێوەیەك لە ڕوانگەی دۆرکایمەوە خاوەن بایەخ و گرینگییە کە بە بەراورد لەگەڵ "قانونی ڕاکێش"ی نیۆتۆن لە فیزیادا، بە قانونی ڕاکێشی کۆمەڵایەتی ناوی دەبات.(٣٨)

هەروەك ئاماژەی پێکرا، "خۆکوشتن" یەکێکی دیکە لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی دۆرکایمە کە لە هەمان کاتدا توێژینەوەیەکی زانستی ڕێکوپێکە کە لە بواری کۆمەڵناسیدا ئەنجام دراوە. دۆرکایم لەم توێژینەوەیە بەم دەرەنجامە دەگات کە خۆکوشتن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە بە فاکتەرە دەروونناسییەکان شی ناکرێتەوە بەڵکوو خۆکوشتن دەبێ بە فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە ڕوون بکرێتەوە.

دۆرکایم سێ جۆر خۆکوشتن دەخاتە بەرباس کە بریتین لە:

خۆکوشتنی تاکخوازانە یان خۆویستانە، خۆکوشتنی ئەویترخوازانە یان گیانبەختکردن، خۆکوشتنی سەرچاوەگرتوو لە پشێویی کۆمەڵایەتی.

ڕیمۆن ئارۆن بیرمەندی فەڕەنسی لە لێکدانەوەی ئەم سێ جۆرە خۆکوشتنەدا بەم شێوەیەی نووسیوە:

"دۆرکایم یەکەمین جۆری خۆکوشتنی کۆمەڵایەتی کە لە ڕێگەی لێکدانەوەی ئاماریی هاوپێوەندییەکان پێی گەیشتووە، بە خۆکوشتنی خۆپەرستانەی ناو دەبات. پیاو و ژن کاتێك کە لە بنەڕەتدا لە بیری خۆیاندان، کاتێك کە نەیانتوانیوە لە گرووپێکی کۆمەڵایەتی جێبگرن، کاتێك کە مەیلە بزوێنەرەکانیان لە پلەیەك لە هاوسەنگییدا نییە کە لەگەڵ چارەنووسی مرۆیی بگونجێ، واتە باڵادەستیی گرووپ و هێزی زۆرەکی و داسەپاوی ژینگەیەکی بەرتەسك و بەهێز قبووڵ بکات، لەم حاڵەتەدا ئامادەیی زیاتریان بۆ کۆتاییهێنان بە ژیانی خۆیان هەیە. دووهەمین جۆری خۆکوشتن، خۆکوشتنی

ئەویترخوازانەیە. لەم جۆرە خۆکوشتنەدا لـە کتـێبی دۆرکایمـدا دوو نموونـەی سـەرەکی خراونەتەڕوو. نموونەی یەکەم لە زۆر کۆمەڵگەی کۆندا بەرچـاو دەکـەوێت، خۆکوشـتنی ژنێکی مێرد مردوو کە وەك لە هێندا باو بووە، پێی باشە لەگەڵ جەستەی مێردەکەیدا بسووتێنرێت. لەم جۆرەدا، بە هیچ شێوەیەك قسە لەسەر خۆکوشتن بە هۆی تـاکخوازیی زێدەڕۆیانە نییە، بەڵکوو باس لە توانەوەی بەتەواوەتی تاك لـەناو گـرووپ دایـە. تـاك لەسەر بنەمای بڕیاری کۆمەڵایەتی، مردن قبووڵ دەکات بێئەوەی کە تەنانەت لە فکری بەرگری لە مافی ژیانی خۆی بێ. هەر بەم شێوەیە، فەرماندەری بەلەمێك کە حەز ناکات دوای نوقم بوونی بەلەمەکەی بە زیندوویی بمێنێتەوە و خۆکوشتنی ئەویترخوازانە قبووڵ دەکات. ئەو خۆی فیـدای بڕیـارێکی کۆمەڵایـەتی دەکـات کـە لـە قـووڵایی دڵییـەوە وەریگرتووە و لە پێڕەوی کردن لە بڕیاری گرووپ تا ئـەو جێگەیـە دەچـێتە پـێش کـە تەنانـەت غـەریزەی پاراسـتنی زاتـی خۆشـی لەبەرچـاو ناگرێـت... سـەرەنجام جـۆرە خۆکوشتنێکی کۆمەڵایەتی دیکەش هەیە کە خۆکوشـتنی سەرچـاوەگرتوو لـە پشـێویی کۆمەڵایەتییە. ئەم جۆرە خۆکوشـتنەیە کـە زیـاتر لـە هـەمووان لەلایـەن دۆرکایمـەوە گرینگیی پێدراوە، چونکە هێمای بەرچاوترین تایبەتمەندیی کۆمەڵگەیە. ئەم خۆکوشتنە هەر ئەوەیە کە لە هاوپێوەندیی نێوان زۆربوونی خۆکوشتنەکان و قۆناغە یـەك لـەدوای یەکە ئابوورییەکان دەتوانرێ لێی تێبگەین.

وادێتە بەرچاو کە داتاکان زۆربوونی خۆکوشـتنەکان لـە قۆناغـەکانی قـەیرانی ئـابووری و هەروەها سەرنجڕاکێشتر لەوەش، لە قۆناغـەکانی برەوسـەندنی لەڕادەبـەدەری ئـابووری نیشـان دەدەن..."(٣٩)

دۆرکایم بابەتی خۆکوشتنی وەك دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی لـە پێوەنـدیی لەگـەڵ گـۆڕاوە کۆمەڵایەتییەکانی وەك تەمەن، ڕەگەز، بیروباوەڕی ئایینی ( جیاوازی ڕادەی خۆکوشتن لـەنێوان پرۆتسـتانەکان و کاتۆلیکـەکان)، دۆخـی هاوسـەرگیری، ژمـارە منداڵـەکان دەبینـێ و پلـەی هاوپێوەنـدیی و پێوەنـدیی کۆمەڵایـەتی تـاك لەگـەڵ کۆمەڵگـە وەك تـەوەری سـەرەکی توێژینەوەکانی لەقەڵەم دەدات.

**ماکس ڤیبەر** ( ١٩٢٠ ـ ١٨٦٤) یەکێك لە پێشڕەوان و خاوەنڕا گـەورەکانی کۆمەڵناسـی لـە سـەدەی بیسـتەم دایـە کـە کاریگەرییـەکی زۆری لەسـەر کۆمەڵناسـان و قوتابخانـەکانی کۆمەڵناسیی سەدەی بیستەم هەبووە و ڕوانگەکانی لە بـوارە جیاوازەکـانی وەك کۆمەڵناسـیی

سیاسی، ئایینی، مێژوویی ئێستاکەش لە لایەن کۆمەڵناسانی ئەمرۆکە، باس و گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت و پشتیان پێدەبەسترێ.

ڤیبەر لە توێژینەوەکانی کۆمەڵناسیدا جەخت لەسەر "کردەی کۆمەلایەتی" دەکاتەوە و خاڵی دەسپێکردنی ناوبراو بە پێچەوانەی کۆنت و دۆرکایم لە تاکەوە بەرەو کۆمەڵگەیە.

لە ڕوانگەی ئەوەوە کردەی کۆمەلایەتی کردەیەکە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان بەرەو کردەی تاکەکانی دیکە لە تۆڕی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان ئاراستە دەکرێ و زانستی کۆمەڵناسیش بە جەختکردنەوە لەسەر کردەی کۆمەلایەتیی مرۆڤ، بەم شێوەیە پێناسە دەکات: " کۆمەڵناسی زانستێکە لە هەوڵی شیکردنەوە و تێگەیشتن و تێگەیاندنی کردەی مرۆڤ دایە بۆ ئەوەی بتوانێ بە ڕوونکردنەوەی هۆکردیی ڕەوتی کردەی کۆمەلایەتی و دەرەنجامەکانی بگات. لەڕوانگەی ماکس ڤیبەرەوە، واقعییەتی سەرەکی لە کۆمەڵناسیدا تاکیی مرۆییە چونکە تاکی مرۆیی بە تەنیایی دەتوانێ دەست بۆ کردەوەگەلی واتادار کە شیاوی تێگەیشتن بن، ببات و دامەزراوەکان و بەشەکانی پێکهاتەی کۆمەلایەتی، نۆرمەکان و نموونەکان تەنیا وەك کۆی کردەوە مرۆییەکان شیاوی تێگەیشتنن.

ڤیبەر کردە کۆمەلایەتییەکان بۆ سێ دەستە پۆلێن بەندی دەکات بەم شێوەیە:

ئا: کردەی عەقلانی (ژیرانە)

ب: کردەی نەریتی

پ: کردەی سۆزداری

کردەی عەقلانی کردەیەکە کە ئەنجامدەری کار بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی کەڵك لە ئامرازی لۆژیکی و عەقلانی وەردەگرێ. ئەم جۆرە کردەیە خۆی بۆ دوو دەستە دابەش دەبێت:

**١ـ کردەی عەقلانی پەیوەست بە ئامانج**

**٢ـ کردەی عەقلانی پەیوەست بە بەها**

لە جۆری یەکەمدا هەم ئامرازەکان و هەم ئامانجەکان و دەرەنجامەکان و شوێنەوارەکانی دوایی کردەکەی لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە ماددییە تایبەتەکانە کە جێگەی سەرنجی کاراکتێرەکەیە . بۆ نموونە کردەی بازرگانێك کە بۆ سوودی هەرچی زیاتر بوار، بارودۆخ و دەرەنجامەکانی داهاتووی تاوتوێ کردووە. دواتر دەست بە

سەرمایەدانان دەکات یان کردەی ئەندازیارێك کە بە مەبەستی دروستکردنی پردێك سەرەتا دەست بۆ تاوتویّ و تاقیکردنەوە پێویستەکان دەبات و دواتر کاری دروستکردنی پردەکە دەست پیّدەکات.

لە جۆری دووهەم، ئامانجە کۆتاییەکانی کاراکتەرەکە پەیوەست بە ئامانج و بەها مەعنەوییانەیە و بۆیە بەرژەوەندییە ماددییەکان لەبەرچاو ناگیرێن وەك ئەو خەباتگێڕانەی بڕوای پتەویان بەئامانج یان ئایدۆلۆژیایەك هەیە و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان بە هەموو نرخێك تیّدەکۆشن. یان کەسانێك کە داخوازانە و وشیارانە بۆ بەرگری لە ئامانج و وڵاتی خۆیان دەچنە بەرەکانی شەڕ و ئامادەن گیانیان فیدا بکەن.

کردەی نەریتی لە ڕوانگەی ماکس ڤیبەرەوە کردەیەکە کە پەیوەست بەو نەریتانەیە کە بۆ ماوەی چەندین سەدە و سەردەم بەسەر کۆمەڵگەدا زاڵ بوون و بەشێکی بەرچاو لە نموونە ڕەفتاری و نۆرمەکانی خەڵك بە تایبەت خەڵکی کۆمەڵگە نەریتییەکانن وەك گوندنشین و عەشیرەتی پێك دێنن. بۆ نموونە داب‌ونەریتی ڕۆژانە و بۆنە و ڕێوڕەسمە باوەکانی نێو خەڵك.

ماکس ڤیبەر کردەیەك بە سۆزداری دەزانیّ کە لەسەر بنەمای هەست و سۆز و وروژانەکان جێبەجیّ دەکریّ. نموونەی ئەم کردەیە دەتوانریّ لە تۆڵەستاندنەوەی لەسەر بنەمای کێبەرکێی وەك کێبرکێی وەرزشی یان پەیوەندییە سۆزدارییەکانی نێوان تاکەکانی بنەماڵەیەك ببینریّ.

ڤیبەر لە کۆمەڵناسیی سیاسیی خۆیدا تایبەتمەندییەکان و جۆرە سێیانییەکانی دەسەڵاتداریی یان ڕەوایی عەقڵانی ـ یاسایی، دەسەڵاتدارەتی نەریتی و دەسەڵاتدارێتی کاریزمایی لەسەر بنەمای کردە سێیانییەکان تاوتویّ و شرۆڤە کردووە.

یەکێك لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی ڤیبەر کتێبی "ئەخلاقی پرۆتستانتی و رۆحی سەرمایەداری"یە کە تێیدا هەوڵی داوە کاریگەریی دەرکەوتنی پرۆتستانتیزم لە ئورووپا لەسەر گەشەی بورژوازیی ڕۆژئاوایی تاوتویّ بکات. ڤیبەر لەم توێژینەوەیەدا کە دەرەنجامەکانی دواتر بوون بە هۆی دەرکەوتنی رێبازێك بە ناوی ڤیبەرە نوێیەکان، گۆڕانکاریی سەرچاوەگرتوو لە کاریگەرییەکانی بنەماکانی ئەخلاقیی کالڤینیزم لەسەر پێکهاتەی ئابووری و زانستی وڵاتانی ڕۆژئاوایی تاوتویّ کردووە. ئەم بەرهەمە بە تایبەت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو بە هۆی ناوبانگ دەرکردنی ناوبراو.

له ڕوانگەی ماكس ڤیبەر كۆمەڵناسی زانستی تێگەیشتنە و لەڕووی میتۆدۆلۆژییەوە، برەوی بە میتۆدی "لێتێگەیشتن" (VERSTEHEN)داوە. ڤیبەر پێی وایە كە دەبێ كۆمەڵناسی كار بۆ تێگەیاندنی وێنا زەینییەكانی تاكەكان بكات بۆ ئەوەی لە ناوەوە لە واتا و مانای كردەی ئەوان تێبگات.

ناوبراو تێگەیشتن لەكردەی كۆمەڵایەتیی مرۆڤ بە ئاكامی تێگەیشتنی ڕاستەوخۆ و دەسبەجێی كردەی تاكەكەسی نازانێ بەڵكوو پێی وایە كە دەبێ ئەنگیزە و پاڵنەرەكانی مرۆڤ و واتایەك كە ئەو بۆ كردەكانی خۆی دایدەنێ، لێی تێبگەی. بە دەستەواژەیەكی دیكە لە كۆمەڵناسیی لێتێگەیشتنی ماكس ڤیبەر، تاكی مرۆیی و كردەی ئەو وەك یەكەیەكی سەرەكی توێژینەوە كۆمەڵایەتییەكانە.

ماكس ڤیبەر بێجگە لە كۆمەڵناسی، لە ئابووری، زانستە سیاسییەكان، یاسا و كارگێڕیدا خاوەنڕا بووە و خاوەن بەرهەمگەلێكی فرە و فرەچەشنە كە لەنێویاندا دەتوانین ئاماژە بە "ئابووری و كۆمەڵگە" و " ئەخلاقی پرۆتستانی و ڕۆحی سەرمایەداری" بكەین.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی یەکەم

1-Gaston bauthoul. Histore de la Sociologie. Puf. Paris 1965.P.6

٢ـ منبع فوق، ص٧.

٣ـ شەڕەکانی پیلۆپۆنیز ئەو شەڕانەن لەنێوان ئەسینا و ئیسپارتەدا کە نزیکەی ٦٥ ساڵ واتە لە ساڵی ٤٠٤ هەتا ٣٤٠ی پێش زایین درێژەیان کێشاوە.

٤ـ سیتە (CITE) بەی واتای شارێکە کە خاوەن ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و کولتووریی تایبەت بە خۆی بووە.

٥ـ گاستون بوتول، ص ١٠ و ١١.

٦ـ محمد علی فروغی، سیر حکمت در اروپا، ١٣٤٥، ص ٤٤.

٧ـ محمد علی فروغی، همان منبع، ص ٦٩ـ ٤٥.

٨ـ کارل یاسپرس (Karl Jaspers)، اگوستین، ترجمه محمد حسن لطفي خوارزمی، ١٣٦٣، ص ١٢ـ١٠

٩ـ سمینار جامعەشناسی، تاریخ جامعەشناسی و تفکرات اجتماعی، دفتر همکاری حوزه و دانشگاه، شماره ٨ـ ص ١٠.

١٠ـ همان منبع ص ١٨.

١١ـ خلاصەای از سیاسات مدنیّه، ص ٦٩ـ٧٠، به نقل از اندیشەهای مدینه فاضله، ص ٢٥٢.

١٢ـ ابونصر محمد فارابی، اندیشەهای اهل مدینه فاضله، ص.٤٨

١٣ـ تحقیق ماللهند، ابوریحان بیرونی، جلد اوّل، ترجمه منوچهر صدوقی، موسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگی، ١٣٦٢.

١٤ـ مقدمه ابن خلدون، عبدالرحمان ابن خلدون، ترجمه پروین گنابادی، جلد اول ص ٥٠.

١٥ـ همان کتاب ص ٨ و ٩.

١٦ـ همان کتاب، ص٣٣٦ ـ ٣٣٣.

١٧ـ پژوهشی در اندیشەهای ابن خلدون، دکتر محمد علی شیخ ١٠٣ـ١٠٤.

١٨ـ مقدمه ابن خلدون، عبدالرحمان ابن خلدون، ترجمه پروین گنابادی، جلد اول ص ٢٤٠

١٩ـ کلیات عقاید ابن خلدون، عزت الله رادمنش، ص.٤٠

٢٠ـ مقدمه ابن خلدون، جلد اول، ص.٥٣

٢١ـ گاستون بوتول، تاريخ جامعه‌شناسى، ترجمه ا.وكيلى، ص.٢٦

٢٢ـ وشەی یۆتۆپی (Utopie) وچەیەکی لاتینییە و لـە دوو بەشـی "OU" بـە واتـای "نـە" و Toposبـە واتای شوێن و جێگە پێك هاتووە و مەبەست لێی واتە ئەوەی لە جیهـانی واقیعیـدا بـوونی نییـە. فەیلەسـوفە فارسـەکان زاراوەی "ناکجا باد" واتە "شاری ئاوات" یان "شاری خەیاڵی"یان لە جێگەی ئەم وشەیە داناوە.

٢٣ـ مدينه‌فاضـله به تصور غربيها، محمد شهيدزاده ماهانى، ترجمه از دائرةالمعارف أمريكا، از انتشارات پژوهشگاه علوم انسانى، ص .٤٠

٢٤ـ فلسفه تاريخ، عبدالكريم سروش، انتشارات حكمت سال ١٣٥٧، ص ٧ و .٨

٢٥ـ تمدن در بوته أزمايش، أرنولد توين بى، ص .٣٤

٢٦ـ همان منبع ص .٤٥

٢٧ـ علم تحولات جامعه، حميد حيمد، ص ٦٦ ـ ٦٤. و نيز در آستانه رستاخيز، امير حسين آريـان پـور، ص ١٢٢ ـ ١١٢.

٢٨ـ مجله سخن، دوره چهارم، شماره ١٠ ص .٨٩٢

٢٩ـ سمينار جامعه‌شناسى، دفتر همكارى حوزه و دانشگاه شماره ٨ ص .١٩

٣٠ـ گاستون بوتول، تاريخ جامعه‌شناسى، ص.١

٣١ـ مقدمه ابن خلدون، جلد اول، ص.٣٠

٣٢ـ ژان كازنو، پيدايش و تكوين جامعه‌شناسى، ترجمه باقر ساروخانى، نامه پژوهشكده، شمـاره سـوم و چهارم، پاييز و زمستان ١٣٥٨، ص .٥٣

23- Raymond aron. Les etapes de la Penesee sociologie PP:104J106.

٣٤ـ همان منبع ص .٨٢

٣٥ـ اسعد نظامى، نظريه‌هاى جامعه‌شناسى، دانشكده علوم اجتماعى، .١٣٥٥

٣٦ـ اميل دوركيم، قواعد روش جامعه‌شناسى، ترجمه على محمد كاردان، ص ٦ و ٧.

٣٧ـ همان مأخذ ص .٩

٣٨ـ گى روشه، تغييرات اجتماعى، ترجمه منصور و وثوقى، انتشارات نشر نى، ص ٤٦ـ٤١.

٣٩ـ ريمون آرون، مراحل اساسى انديشه در جامعه‌شناسى ص ٣٤ و ٣٥.

# بەشی دووەم

## کۆمەڵناسی وەك زانستێك:

### ١- پێناسەکان:

پێناسەیەکی ورد لە کۆمەڵناسی وەك زانستێك کارێکی سادە نییە، چونکە یەکەم ئەوەکە هەتا ئێستاش ئەم زانستە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا قۆناغەکانی سەرەتایی ژیانی خۆی تێپەڕ دەکات و پانتایی توێژینەوەکان لە بوارەکانیدا بە شێوەیەکی ئەوتۆ پەرەیان نەستاندووە. دووهەم ئەوەکە لەنێوان بابەتە جیاوازە تیۆری و پراکتیکییەکانیدا هەندێك ئاڵۆزی هەیە کە دەستنیشانکردنی بابەتەکانی ئەو زانستە لەگەڵ بابەتەکانی زانستە مرۆییەکانی دیکە کە پێش ئەو هاتوونەتە کایەوە، دژوار دەکا. کۆمەڵناسان هەریەکێکیان، بە پێی هەڵهێنجان و تێگەیشتن و بۆچوونەکانی خۆیان هەوڵیان داوە پێناسەیەك بۆ کۆمەڵناسی بخەنەڕوو، بەم پێیە مەسەلەی دیکە پەیوەندیی بە جۆراوجۆریی ئەو پێناسانە هەیە کە بۆ ئەم زانستە کراوە، لەوانەیە بە ژمارەی ئەو کتێبانەی کە لەم بارەوە نووسراون، پێناسەی بۆ کرابێ.

دیارە فرەچەشنیی پێناسەکان تەنیا تایبەت بە زانستی کۆمەڵناسی نییە، بەڵکوو لە زانستەکانی دیکەش چ ئەوانەی پێش کۆمەڵناسی بەدی هاتوون و چ ئەوانەیکە دوای ئەم زانستە هاتوونەتە ئاراوە، ئەمە بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەم شتە هیچ کات لە گەشەسەندنی زانستەکانی کەم نەکردۆتەوە.

کۆمەڵناسی کەمێك زیاتر لە سەدە و نیوێك تەمەنی هەیە و فرەیی پێناسەکانی ئاکامی جیاوازیی بۆچوونەکان، دژبەیەکییەکان و ئەو رووبەڕووبوونەوەیانەیە کە لەم ماوەیەدا لەنێو بیرمەندان، خاوەنڕایان و گەورەپیاوانی ئەم زانستە لەسەر ئامانج و بابەتی کۆمەڵناسی بوونی هەبووە.

هەندێك لە کۆمەڵناسان بە جێگەی پێناسەی کۆمەڵناسی دەڵێن: کۆمەڵناسی هەر ئەو کارانەن کە کۆمەڵناسان ئەنجامیان دەدەن، و بەم شێوەیە کارەکە بە ئاسانی تەواو دەکەن.

هەندێکی دیکە هەرچەند کتێبی زۆریان لەژێر ناونیشانی کۆمەڵناسیدا نووسیوە بەڵام لە هێنان و خستنەڕووی پێناسە خۆیان بواردووە. بۆ وێنە " هێنری مێندراس"( Henri Mendras) کۆمەڵناسی فەرەنسی دەڵێ: " پێناسەی هەر زانستێك لە سەرەتاکەیدا واتایەکی نییە". ئەگەر لە ڕووی گەڵاڵە و نەخشەی پێشوو پێناسەیەك لەم زانستە بخەینەڕوو، دەبێتە هۆی باس وخواسی بێهوودە و مشتومڕی بەرفراوان و دەرەنجامێکیشی بەدواوە نابێت." (١)

ژمارەیەکی دیکە لە کۆمەڵناسان لە ماوەی ژیانی زانستیی خۆیاندا پێناسەی جۆراوجۆریان لە کۆمەڵناسی خستۆتەڕوو کە لە پێناسەکانی دواتردا، پێناسەکانی پێشوویان دەستکاری یان تەواوتر کردووە.

کۆمەڵناسی وەرگێڕدراوی زاراوەی (Sociologie)فەرەنسییە، ئەم زاراوەیە لە دوو بەش "سۆسیۆس"Socios کە لە(Socieum) لاتینی وەگیراوە، و بە واتای دۆست، ڕەفیق و هاوڕێ یە و هەروەها لۆگۆس (Logos)ی یۆنانی بە مانای ناسین، توێژینەو، موتاڵا و زانست پێك هاتووە.

ئۆگست کۆنت کە بە باوکی کۆمەڵناسی ناسراوە، لە ساڵی ١٨٣٧ بۆ ئەو زنجیرە دەرسانەی کە لە پاریس دەیگوتنەوە، زاراوەی(Sociologie) هەڵبژارد. مەبەستی ئەو لە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە هێنانە کایەی زانستێکی نوێ بوو کە بتوانێ بە میتۆدی زانستە ئەزموونییەکان ژیانی کۆمەڵایەتی تاووتوێ بکات.

بە بۆچوونی ئۆگست کۆنت، کۆمەڵناسی زانستی یاسا گشتییەکانی تایبەت بە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە.

دۆرکایم (E.Durkheim) کۆمەڵناسی فەرەنسیش، کۆمەڵناسی بە زانستێك دەزانێ کە بابەتی دیراسە و توێژینەوەکەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانن. ناوبراو پێی وایە کە دیاردەی کۆمەڵایەتی دەبێ وەکوو "شت" لەقەڵەم بدرێ و تەنیا لەگەڵ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دیکە شیاوی دەرخستن و ڕوونکردنەوەیە. جەخت کردنەوە لەسەر "شت بوون"ی دیاردە

کۆمەڵایەتییەکان لەلایەن دۆرکایمەوە بۆتە هۆی ئەوەکە لەم بارەیەوە ڕەخنە لە ناوبراو بگرن. دۆرکایم لە پێشەکی چاپی دووهەمی کتێبی ڕێساکانی میتۆدی کۆمەڵناسی دەڵێ:

"ئەم حوکمە کە دەبێ وەکوو شت سەیری واقیعە کۆمەڵایەتییەکان بکرێ، واتە حوکمێك کە بنەمای میتۆدی ئێمەیە یەکێك لەو حوکمانەیە کە زیاتر لە هەموو شتێك بۆتە هۆی گفتوگۆ و قسە لەسەر کردن، هەندێك کەس ئەمە بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی دروست و عەقڵی سەلیم دەزانن و پێیان سەیر بووە کە ئێمە واقیعەکانی جیهانی دەرەوە و واقیعەکانی جیهانی کۆمەڵایەتی بە یەکسان دادەنێین، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە واتا و سنووری ئەم یەکگرتنە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بە هەڵە چوون. بابەتی ئەم یەکبوونە ئەوە نییە کە فۆرمە باڵاکانی بوون دابەزێنین بۆ فۆرمە نزمەکانی، بە پێچەوانەوە مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە بە ئەندازەی فۆرمە نزمەکانی بوون واقعییەت بە فۆرمە باڵاکانی بوون بدرێ. بە دەستەواژەیەکی دیکە، ئێمە ناڵێین کە واقیعە کۆمەڵایەتییەکان شتگەلێکی ماددین، ئێمە دەڵێین ئەم واقیعانە وەك شتە ماددییەکانن بەڵام شتبوونیان بە جۆرێکی دیکەیە.(٢)

دۆرکایم بەدوای دەقی سەرەوەدا، پێناسەی "شت"ی کردووە و پێی وایە بە هەمان شێوە ئەوەی لە دەرەوەڕا دەیناسین لەگەڵ ئەوەی کە لە ناوەوە دەیناسین جیاوازی هەیە، شتیش لەگەڵ وێناکردندا لێك جیاوازە. زەین و بیر تەنیا بە هاوکاری تێڕامان و تاقیکردنەوە دەتوانێ لێی تێبگا.

دۆرکایم لە پێناسەیەکی دیکەدا کۆمەڵناسی بە " زانستی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان" دەزانێ و دامەزراوەی کۆمەڵایەتیش بە کۆمەڵێك لە کردەوە و بیروڕاکان دەزانێ کە کەم تا زۆر خۆیان بەسەر تاکەکاندا دەسەپێنن و تاك کەم و زۆر لە بەرامبەر خۆیدا دەیانبینێ و بە واتایەکی دیکە، دۆرکایم دامەزراوە بە هەموو بیروڕا و شێوازە ڕەفتارییەکان دەزانێ کە کۆمەڵ دایناون یان دایمەزراندوون.

یەکێکی دیکە لە کۆمەڵناسان بە ناوی ماکس ڤیبەر کۆمەڵناسی بە زانستی توێژینەوە و تاوتوێکردنی کردە کۆمەڵایەتییەکان دەزانێ. ناوبراو کۆمەڵناسی بە زانستێك دەزانێ کە لە هەوڵی تێگەیشتن و شرۆڤە و لێکدانەوەی کردەی کۆمەڵایەتی دایە و بەم پێیە بنەما سەرەکییەکانی کۆمەڵناسیی ڤیبەر بریتین لە: کردەی کۆمەڵایەتی، تێگەیشتن و تێگەیاندنی و سەرەنجان ڕوونکردنەوەی هۆکاریی ئەو کردەوەیە. لە ڕوانگەی ڤیبەرەوە سەرەکیترین واقعییەت لە کۆمەڵناسییدا، تاکی مرۆییە چونکە تەنیا مرۆڤە کە دەتوانێ دەست بۆ کردەوەگەلی

واتاداری شیاوی تێگەیشتن ببات. ماکس ڤیبەر کردە کۆمەڵایەتییەکانی بۆ چوار دەستە کردەی عەقڵانی پەیوەست بە ئامانج، کردەی عەقڵانی پەیوەست بە بەها، کردەی سۆزداری و کردەی نەریتی پۆلێن بەندی دەکات.

هەندێك لە کۆمەڵناسان کە تارادەیەك لەژێر کاریگەریی قوتابخانەی دەروونناسی دان دەڵێن: لەبەر ئەوەی کە کۆمەڵگە لە تاکەکان پێك دێت بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵگە دەبێ خەریکی ناسین و توێژینەوە لەسەر تایبەتمەندییەکانی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بین. ژمارەیەکی دیکە وەك ویلیام گراهام سامنێر (W.G.Sumner) کۆمەڵناسی بە شێوەیەکی گشتی بە زانستی کۆمەڵگە دەزانن، سامنێر پێی وایە کە بابەتی کۆمەڵناسی زیاتر خودی کۆمەڵگەیە و دەبێ وەك گشتێك تاوتوێ بکرێ نەك وەك کۆمەڵەیەك لە تاکەکان کە کۆمەڵگە پێك دێنن.(٣)

جۆرج گۆرڤیچ (G.Gurvich) زیاتر لە هەمووان بۆچوونی کۆمەڵناسی فەڕەنسی مارسێل مووس (Marcel Mauss) قوتابیی دۆرکایم پەسند دەکات کە دەیگوت: " کۆمەڵناسی ڕوانگەیەکی گشتییە دەربارەی دیاردە گشتییە کۆمەڵایەتییەکان و هەر بۆیە کۆمەڵناسی بنچینەی هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکانە و بابەتەکەی تەواوی واقیعە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕەهەندی جۆراوجۆر و ئاستی جیاواز و پێکهاتە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگە و جووڵە و گۆڕانکارییەکانییەتی". بە بڕوای گۆرڤیچ بابەتی کۆمەڵناسی لانیکەم چوار حاڵەتی هەیە کە هەر یەکێکیان دیمەنێك لە واقیعە گشتی و ئاڵۆزەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی پێك دێنن کە ئەوانیش بریتین لە: کۆمەڵناسی ورد یان میکرۆسۆسیۆلۆجی (Micro Sociologie)کە شێوازە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتیبوونی مرۆڤـ تاوتوێ دەکات و باسی هەموو جۆرەکانی ئەو پەیوەندییانە دەکات کە تاکەکان لێك نزیك دەکات و پەیوەندییان لەنێودا دروست دەکات. دووهەم "کۆمەڵناسی چڕ" کە لە ئاستی دەرەوەی کۆمەڵگە وەك شوێنی نیشتەجێبوون، حەشیمەت و پەیوەندییان لەگەڵ ئێکۆلۆژیادا هەتا ژیانی کۆمەڵایەتی لە توێژینەوە جۆراوجۆرەکان و دیاردەکانی تایبەت بە دەروونناسیی گشتی کە قووڵترین ئاستە، لەخۆ دەگرێ و، لەو نێوەدا دامەزراوەکان، بنیاتەکان، ڕێکخراوەکان، ڕەفتارە بەکۆمەڵییەکان، ڕۆڵەکان، حەزەکان، پێگەکان، پاڵنەر و ئەنگیزەکان، هێما و سەمبوولەکان، بەها و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان تاوتوێ دەکات. سێهەم باسی یەکە گشتییە کۆمەڵایەتییەکان و جیاوازییەکانیان، گرووپەکان و چینە کۆمەڵایەتییەکان دەکات و چوارەمیش کە بە کۆمەڵناسی گەورە

(دەکرێ فراوانیش بەکار بێنین) ماکرۆسۆسیۆلۆجی (Macro-Sociologie) ناوی براوە، بابەتی توێژینەوەکەی سیستەمە گشتییەکانی کۆمەڵگەیە.

لـە پێناسـە باسـکراوەکاندا هەرچـەند هاوبەشـێتی لـە واتـادا بـوونی هەیـە، بـەڵام جیاوازیگەلێکیش لە باری ئامانج و ڕوانگە سەرەکییەکانەوە بەرچاو دەکەوێ. بـە تایبـەت لـە نێوان دوو دەستە لە کۆمەڵناسە ئەمریکی و ئەوروپییەکان لە پێناسـەی کۆمەڵناسـیدا زیـاتر گرینگیی بە پێکهاتە و بنیاتی کۆمەڵگە و چوارچێوە گشتییەکانی دەدەن. لە حاڵێکدا کە بـۆ کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان ئەوەی کە زیاتر لە هەر شتێکی دیکە بایـەخی هەیـە، پەیوەنـدیی نێوان تاکەکان و کردەوە گرووپییەکانە. لە کۆمەڵناسیی ئەمریکی بە تایبەت لەدەیـەی ١٩٦٠ بە دەرکەوتن و پەرەسەندنی ڕێبازگەلێکی وەك ئیتنـۆ میتۆدۆلـۆژی، دیاردەناسـی و کـارلێکی دوولایەنەی هێمایی، مەیل بۆ لای تاکگەرێتی پەرەی ستاندووە. لە وڵاتە سۆسیالیسـتییەکان، کۆمەڵناسی ڕەنگ و ناوەڕۆکێکی جیاوازی هەیە. لەم وڵاتانەدا کۆمەڵناسی لـەژێر کاریگـەری ئایدۆلۆژیای مارکسیستی دایە و لە دۆخی گشتیی کۆمەڵگە دەڕوانێت و بە نیـازی پێشـبینی کردنی گۆڕانکارییەکانی لە داهاتوو دایە. لە حاڵێکدا کە کۆمەڵناسی لـە ئـەمریکا خـەریکی وەسـفکردنی کاروبـارە کۆمەڵایەتییـە بچـوکەکانە و زیـاتر لایـەنی شـیکاری و ئـەزموونی و پراکتیکی هەیە. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ لە پێناسەکانی سەرەوە پێناسەیەکی کـورت و لەهەمان کاتدا گشتگیر بە شێوەی خوارەوە بخرێتەڕوو:

کۆمەڵناسی یەکێك لە لقەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانە کە بە شێوازێکی زانستی دیراسە و توێژینەوە لەسەر دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگە پەرەسەندووەکاندا دەکـات. بـە پێـی ئەم پێناسەیە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی گشتی هەموو ئەو کاروبار و واقیعیانـەن کە تایبەتمەندیی گشتییان هەیە و بە بەش و فاکتەرە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی دێنـە ئەژمار. ئەم واقیعیانە دەکـرێ لـە سـێ دەسـتەدا جێبکرێنـەوە: کارەکـانی پەیوەندیـدار بـە مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی، کارەکانی پەیوەندیدار بە پێکهاتەی نـاوەوەی کۆمەڵگـە (زانسـتی توێکاریی کۆمەڵایەتی) و کارەکانی پەیوەندیدار بە ڕەفتارە گرووپی و جەماعییەکان ( ورووژان و ڕەوتە کۆمەڵایەتییەکان).

لە وڵاتی ئێمەدا هەتا ئێستاش کۆمەڵناسی بناغەیەکی پتەو و قایمی وەدەست نـەهێناوە و تیۆرییەکانی کۆمەڵناسی زیاتر لەسەر بنەمای دیراسات و توێژینەوەکانی کۆمەڵناسە ئەورووپی و ئەمریکییەکانە. گەشە و بەکارهێنانی ئەم زانستە لە حاڵێکدا مەیسەر دەبـێ، کـە توێـژەرە

دەروەستە ئێرانییەکان بە ئاگاداربوون لە تیۆرییـەکانی کۆمـەڵناس و بیرمەنـدە گـەورەکان لـە کەشی کۆمەلآیەتی ـ کولتووری گونجاو و لە دامەزراوە توێژینەوەییەکانی سـەربەخۆ خـەریکی کاری توێژینەوە بن و بوارەکانی ناسـینی بابـەت و مەسـەلە کۆمەلآیەتییـەکانی کۆمەڵگـە و سەرەنجام چارەسەرکردنیان بخولقێنن.

## ٢ـ بابەتی کۆمەڵناسی

لە پێناسەی کۆمەڵناسیدا گوتمان کە ئەم زانستە دیراسـە و تـاوتوێی دیـاردە یـان واقیعـە کۆمەلآیەتییەکان دەکات. لێرەدا دەمانەوێ بزانین کە دیاردە یان واقیعی کۆمەلآیەتی چییە و چ جیاوازیگەلێکی لەگەڵ دیاردە تاکەکەسی و دەروونییەکانی هەیە. مەبەست لە دیاردە هـەموو ئەو واقیعانەن کە لە کۆمەڵگەدا بوونیان هەیە یـان دێنـە پێشـەوە و تـاك لـە دەرەوەی خـۆی دەیانبینێ. دیاردە کۆمەلآیەتییەکان پشت ئەستوور بە کۆمـەڵی مـرۆیین. هـەروەها دەتـوانرێ مەبەست لـەم چـەمکە ڕێکخـراو و دامـەزراوەکان، بنیـات و سـیما جۆراوجۆرەکـانی ژیـانی کۆمەلآیەتی وەك هونـەر، ئـەدەبیات، ئـایین، ئاکـار، دابونـەریت، عادەتـەکان، پـەروەردە و بارهێنان، بیروڕاو بۆچوونەکان و ڕووداوگەلی دیکە بێ کە هەر تاکێك ئەوانە لە دەرەوەی خـۆی دەبینێ.

لە بارەی ماهییەتی دیاردە کۆمەلآیەتییەکان لەنێوان کۆمەڵناساندا جیاوازیی بیروڕا هەیە. هەندێك لە کۆمەڵناسان کە سەر بە قوتابخانـەی دەروونناسـیین، دیـاردە کۆمەلآیەتییـەکان لـە جۆری دیاردە دەروونی و تاکەکەسییەکان دەزانن. ئەم بیرمەندانە پێیان وایە کـە ئەگـەر تـاکی مرۆیی بناسیین و تایبەتمەندییە دەروونی و حەزەکانی بزانین دەتوانین کۆمەڵگە بناسـیین. بـەلآم دەبێ ئەوە بزانرێ کە دیاردە کۆمەلآیەتییەکان سەربەخۆن و لە تاك جیاوازن و جیاوازییان لەگەڵ دیاردە تاکەکەسی و دەروونییەکان هەیە. لەڕاستیدا دەتـوانرێ دیـاردە کۆمەلآیەتییـەکان بـەو واقیعە کۆمەلآیەتییانە لەقەڵەم بدەین کە گشتی، عەینی و هەستپێکراون.

ئەمیل دۆرکایم، کۆمەڵناسی فەڕەنسـی سـێ تایبەتمەنـدیی بـۆ دیـاردە کۆمەلآیەتییـەکان لەبەرچاودەگرێ:

**١ـ دەرەکیبـوون:** واقیع یان دیـاردەی کۆمەلآیـەتی لـە دەرەوەی تاکـە چـونکە بەرهـەمی بۆچوونەکان و لەدایکبووی فکر و هزری تاکێکی دیاریکراو نییە و خواست و ئیرادەی تاك هـیچ دەستێوەردانێکیان لە پەیدابوونیدا نییە. بەم هۆیەوە پێش تاك بوونی هـەبووە و دوای ئـەویش

بـــوونی هـــەر دەبـــێ. هـــەر تاکێـــك دوای لـــەدایکبوون دیـــاردە کۆمەڵایەتییـــەکانی وەك: داب‌ونەریتەکان، ڕێوڕەسمەکان، ڕێکخراوەکان، دامەزراوەکان، زمان، ئەخلاق، بەهاکان، یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان لە بەردەم خۆیدا بە ئامادەیی دەبینێ و بەرەبـەرە بـە پێـی بـارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەو ژینگەیەی کە تێیدا ژیان بەسەر دەبات، لە ڕێگـەی فێرکـردن و بارهێنانـەوە بەدەستیان دێنێ. واتـە لەڕاسـتیدا ئـەم دیـاردە و واقیعـە کۆمەڵایەتییانـە لـە دەرەوەڕا خـۆ دەخزێننە ناو ویژدانی تاك و بە شێوەیەك لەگەڵ کەسایەتی تاك تێکەڵ دەبن، کە لە زۆر بابەتدا دەرەکی بوونیان کەمتر هەست پێدەکرێ. بۆ نموونە ئەگـەر دیاردەیـەکی وەك زمـان لەبەرچـاو بگرین، تێبینی دەکەین کە هەر تاکێك لە سەرەتای لەدایکبوونییەوە، بە ئامـادەیی بەدەسـتی دێنێ، واتە زمان پێش هاتنەدونیای تاك بوونی هەبووە و بەم پێیە لەدەرەوەی تاك دایە و تـاك لە ڕێگەی فێربوون و پەروەردە و لە ڕێگەی باوك و دایك یان مامۆستاکانی فێری دەبێ. لەسەر ئەم بنەمایە دیاردەی زمان لە تاك سەربەخۆیە و شتێکی دەرەکییە و دوای تاکیش هەر دەبێ و بە دەربڕینێکی دیکە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ئەو شێوازە کرداری، هزری و هەسـتییانەن، کـە لە دەرەوەی نەستە تاکەکەسییەکان بوونیان هەیە.

**٢ـ حەتمیبوون:** تایبەتمەندیی دووهەمی دیاردەی کۆمەڵایـەتی حـەتمی بوونییـەتی چـونکە گوشار دەخاتە سەر ویژدانی تاك و بەسەریدا دەسەپێت. بۆ نموونە هاوسەرگیری کـە کردارێکـی کۆمەڵایەتییە تەنیا بە هۆی خۆشەویستییەوە سەر ناگرێ بەڵکوو خاوەن ڕێسا و داب و ڕەسمـی تایبەت بە خۆیەتی. دەبێ گرێبەستێك لە ئارادا بێ و ڕێوڕەسمی تایبەت کە بە پێی بـارودۆخی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان جیاوازە، لەبەرچاو بگیرێ، بۆ ئەوەی ئەم پرۆسەیە سـەر بگـرێ و بـە فەرمی بناسرێ. هەروەها زۆر ڕێسا و دابونەریت و عـادەتی دیکـەش هەیـە کـە تـاك ناچـارە قبووڵیان بکات و پەیڕەوییان لێ بکات ئەگینا لەلایـەن کەسـانی دیکـەوە سـەرکۆنە و لۆمـە دەکرێ و سزا دەدرێت.

بەم پێیە لەنێوان دیاردە تاکەکەسی و دەروونییەکان و دیاردە یان واقیعە کۆمەڵایەتییـەکان جیاوازیی زۆر هەیە. دیاردەی کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی ویژدانی تاکەکەسی بـوونی هەیـە و بـۆ تاك شتێکی دەرەکییە و بەسەریدا دەسـەپێت. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی کـە ئێمـە لـە سـەرەتای لەدایکبوونەوە بەرەبەرە لەگەڵ واقیعە کۆمەڵایەتییەکان کە بە ئامادەکراوی لەبەردەم ئێمەدان، ئاشنا دەبین، فێریان دەبین و خوویان پێدەگرین و بە پێویستییەکانی ژیانی خۆمانیـان دەزانـین.

له زۆر بابەتدا حەتمی بوونەکە بۆ ئێمە بە تەواوەتی هەستپێکراو نییە و ئێمە لە جێبەجێکردنی لەسەر خۆمان گوشارێکی ئەوتۆ هەست پیٚناکەین.

هەر لە سەرەتاوە منداڵ ناچار دەکەین کە لە کاتی دیاریکراودا خواردن بخوات، بخەوێ، ڕێکوپێك بێت، پاكوخاوێنی بپارێزێ، ڕێزی گەورەکان بگرێ. فێری دەکەین کە بە چ شێوەیەك جلوبەرگ لەبەر بکا، چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسانی دیکە بکا و ... لەڕاستیدا ئێمە ئامرازێکین کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بۆ زەینی ئەو دەگوازینەوە و بەسەریدا دەسەپێنین، بەڵام چونکە منداڵەکە وردەوردە عادەتیان پیٚدەگرێ و مەیلێك بۆ ئەنجامدانیان لە وجوودیدا پەیدادەبێ، کاریگەریی فشارەکە لەسەر ئەو هەست پیٚناکرێ. ئێمە لە منداڵییەوە خوومان گرتووە کە کاتێك لەگەڵ گەورەترەکان بە ڕێگەیەکدا دەڕۆین یان لە ژوورێك دەچینەدەر یان دەچینە ژوورێکەوە، "فەرموو"یان بکەین. دەزانین کە جێبەجیٚنەکردنی ئەم کارە پێچەوانەی ئەخلاقە و بیٚئەدەبییە و لەوانەیە لە لایەن کەسانی دیکە سەرکۆنە بکرێین. بەڵام لە جێبەجێکردنیدا گوشارێکی ئەوتۆ لەسەر خۆمان هەست پیٚناکەین، چونکە عادەتمان بەم کارەوە گرتووە و لە لای ئێمە ئەم کارە ڕێسایەکی قبوولکراوە و حەزمان لە ئەنجامدانییەتی و بە یەکێك لە پێویستییەکانی ژیانی خۆمانی دەزانین. لە حالێکدا ئەم کارە بۆکەسێکی بیانی کە بە تازەیی هاتۆتە ناو کۆمەڵگەی ئێمە و بۆی شتێکی نائاشنایە و خووی پیٚنەگرتووە، دژواریی ئەم کارە بە تەواوەتی هەست پیٚدەکرێ.

ئێستا ئەگەر ئێمە خۆمان لە جێگەی ئەو کەسە بیانییە دابنێین و بچینە گوندێك کە بە ڕێکەوت میوانداریی لێیە و بانگهێشت کراوەکان وردەوردە دەچنە ناو میوانییەکەوە، ئەوەمان بەرچاو دەکەوێ کە بە هاتنەژوورەوەی هەر کەسێکی تازەهاتوو، ئەو گوندنشینانەی کە لە مەجلیسەکە دانیشتوون، لە جێگەی خۆیان هەڵدەستن و پاش ماوەیەکی کەم دادەنیشنەوە و ئەم کارە کە نیشانەی ڕێزگرتنە، بە هاتنەناوەوەی هەر کەسێك دووپات دەبێتەوە. ئەم هەستان و دانیشتنانە بۆ ئەو جەماعەتە بە ڕادەیەك ئاساییە کە لە ئەنجامدانیدا زەخت و زەحمەتێکی ئەوتۆ هەست پیٚناکەن. بەڵام بۆ "من" کە لەناو ئەو کەسانەدام و ناچارم وەك ئەوان هەر دەم بە هاتنەناوەوەی هەر کەسێك لە جێگەکەم هەڵبستم و سەرلەنوێ دابنیشمەوە، جێبەجێکردنی ئەم کارە جۆرێك ناچاری و هەستکردن بە فشاری لەگەڵە. بەم پێیە تێبینی دەکرێ کە ئەنجامدانی ئەم کارە کۆمەڵایەتییە کە بۆ خەڵکی گوندەکە بە یەکێك لە بنەما و ڕەسمەکانی ژیان و لەشتە ئاشکراکان دێتە ئەژمار، لە

دەرەوەی نەستی "من" جێدەگرێ و بەسەرمدا دەسەپێت. واقیع و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕوانگەی فشارێك کە لەسەر ویژدانی تاکەکەسییان هەیە لە یەك ئاست و پلەدا نین، بەڵکوو بەهێز و لاوازن. هەندێکیان وەك یاسا و ڕێساکان، یاسا کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان بەهێزتر و تووندترن، چونکە سەرپێچی لێکردنیان سزایەکی توندی بەدواوەیە و هەندێکی دیکەیان گوشارێکی کەمتر دەخەنە سەر تاك. ئەگەر من ملکەچی یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان نەبم، سزا دەدرێم بەڵام ئەگەر بۆ وێنە لە جلوبەرگ پۆشیندا دابونەریتی کۆمەڵگە لەبەرچاو نەگرم، لەوانەیە لە لایەن کەسانی دیکەوە گاڵتەم پێبکرێ. دیارە لەم گاڵتەپێکردنە لە سزادان سووکترە و هەروەها فشارێك کە لە جێبەجێکردنی یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان لە خۆمدا هەستی پێدەکەم بەهێزتر و توندتر لەو گوشارەیە کە لە لەبەرکردنی جلوبەرگ بە پێی داب و ڕەسمە کۆمەڵایەتییەکان دەخرێتە سەرم.

**٣ـ گشتگیربوون:** دۆرکایم تایبەتمەندیی گشتگیربوونی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش تاووتوێ دەکات و دەڵێ: گشتگیربوونی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ئەوەیە کە کۆمەڵایەتییە ( کەم تا زۆر بە ناچاری) نەك ئەوەکە چونکە گشتییە کەواتە کۆمەڵایەتییە. بە دەستەواژەیەکی دیکە دیاردەی کۆمەڵایەتی، حاڵەتێکی گرووپییە کە بەسەر هەموو تاکەکاندا دەسەپێنرێت و لەهەموویاندا بە شێوەیەکی دووپات بۆوە بەرچاو دەکەوێ. چونکە لە کۆ (گشت) دایە و لە بەشیش دا هەیە نەك ئەوەکە چونکە لە بەشەکان دایە کەواتە لە گشتیشدا دەبینرێ.

دۆرکایم سەربەخۆییەکی بابەتی بە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەبەخشێ و زانستی بوونیان دەستەبەر دەکات و لە کتێبی یاساکانی میتۆدی کۆمەڵناسی، بەشێکی بۆ ڕێساکانی تێڕامانی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تەرخان کردووە و دوای ئەوەی کە ئاماژە بە شێوازی ئاسایی لە زانستەکانی دیکە و پێشینەی دیاردەکان لە کۆمەڵناسیدا دەکات، دەڵێ کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش دەبێ وەك دیاردە ماددییەکان تاووتوێ بکرێن و ئەوان بە جێگەی شتومەکەکان دابنرێن. لە جێبەجێکردنی تەواوتری ئەم ئامانجەدا لە باری شێوازی توێژینەوە پێشنیار دەکا کە توێژەر پێش دیراسەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ ئەم بابەتانە لەبەرچاو بگرێ:

**١ـ هەر چەشنە دادوەری یان واتای لەپێشدا دروستکراو لە زەینی خۆی دووربخاتەوە.**
**٢ـ پێناسەکەی گشتگیر بێ.**
**٣ـ واقیعە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ بەجیا لە لایەنی تایبەتی و تاکەکەسی تاوتوێ بکات.**

### ٣. دابەشکردنی کۆمەڵناسی

کۆمەڵناسی لە باری شێواز، ئامانج، سنوور و بابەت، بە چەند جۆرێك دابەش دەکرێت:
**ـ کۆمەڵناسی لە باری شێوازەوە:** یەکەمین دابەشکاریی کۆمەڵناسی لەلایەن ئۆگۆست کۆنت دامەزرێنەری ئەم زانستەوە هاتۆتە کایەوە. ناوبراو کۆمەڵناسی کە لەو سەردەمدا زۆرێك لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەشی لەخۆ دەگرت، لە پەیوەندیی لەگەڵ کات و شوێن بۆ دوو بەش دابەش کردووە:

### ئا ـ کۆمەڵناسیی ستاتیك یان جێگیر (Sociologie Satique)

ئەم بەشە لە کۆمەڵناسی، لە کات و شوێنێکی دیاریکراو توێژینەوە لەسەر کۆمەڵگە دەکات کە هاوشێوەی زانستی توێکارییە و دیراسەی چۆنییەتی ڕێکخستن و پێکهاتەی توخمە جیاوازەکانی پەیکەری کۆمەڵایەتی دەکات. کۆمەڵناسی ستاتیك لە لایەك پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە لە کاتێکی دیاریکراو تاوتوێ دەکات و لە لایەکی دیکەشەوە شرۆڤەی فاکتەر یان فاکتەرەکانی پێکهێنەری کۆمەڵگە دەکات.
لەم تاووتوێ و توێژینەوەیەدا کۆمەڵگە وەك ئۆرگانیزمێك لەبەرچاو دەگیرێت کە کارکردی ئەندامێك کە بەشێك لە ئۆرگانیزمە، تاووتوێ دەکرێت. وەك توێژینەوە دەربارەی چینی مامناوەندی کۆمەڵگەیەك لە ماوەیەکی کورتی زەمەنیدا.
بە پێی توێژینەوە ستاتیکییەکان دەتوانرێ نەزم و تایبەتمەندییە پێکهاتەییەکانی هەر کۆمەڵگەیەك بدۆزینەوە. کۆنت لەم بارەوە دەڵێ: " دەبێ نەزمی کۆمەڵگەی مرۆیی وەها تاووتوێ بکرێ کە گۆیا بێجووڵەیە." لە کۆمەڵناسیی ئیستاتیکدا ئەو کاروبارانەی کە بنەمای هەر کۆمەڵگەیەك پێك دێنن وەك: داب‌ونەریت و ئەخلاق، پیشەسازی، کولتوور و دیاردە هاوشێوەکانی دیکە توێژینەوەیان لەسەر دەکرێت بەبێ ئەوەی کە سەرنجی بنەما و سەرچاوە و ڕەوتی مێژووییەکەیان بکرێت.

## ب ـ كۆمەڵناسیی دینامیك یان گۆڕاو (Sociologie Dynamique)

کۆمەڵناسی دینامیك کۆمەڵ لە کات و لە حاڵەتی ناجێگریدا دیراسە دەکات و گۆڕانکاریی و پەرەسەندنەکانی تاووتوێ دەکات و هۆکارەکانی شوێنەوار و دەرەنجامەکانی ڕوون دەکاتەوە. بۆ وێنە توێژینەوە لەسەر خێزانی ئێرانی لە سەرەتاوە تا ئێستا دەکات و گۆڕانکارییەکانی دیاری دەکات و هۆکارەکانی ئەم گۆڕانکارییانە ڕوون دەکاتەوە و لەم توێژینەوەیەدا کەڵك لە مێژوو وەردەگرێت.

کۆمەڵناسی ستاتیك تەکووزی و سەقامگرتوویی سەرەکی هەر کۆمەڵگەیەك ئاشکرادەکات و کۆمەڵناسی دینامیك ئەو هەوراز و نشێوانەی، کە ئەو سەقامگرتوویییە سەرەکییە لە ڕەوتی مێژوودا تێپەڕیان دەکات، دەخاتەڕوو.

توێژینەوەی ستاتیکی وێنەگرتن و جۆری دینامیکییەکەی فیلم هەڵگرتنەوە بەبیر دێنێتەوە. دۆرکایم کۆمەڵناسی بە سێ بەشی خوارەوەدا دابەش دەکات:

### ١ـ مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی

مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی (Morphologie Sociale, Sociologiede la Form) شکڵی دەرەوەی کۆمەڵگە، قەبارەی حەشیمەت، کۆبوونەوە و لێك بڵاویی و چۆنییەتی جێگیربوونییان تاووتوێ دەکات و دواتر کاریگەرییەکانیان لە ژیانی ناوەوە و پەرەسەندنی کۆمەڵگە ڕوون دەکاتەوە. دۆرکایم بۆ ئەم بەشە لە کۆمەڵناسی گرینگییەکی تایبەت دادەنێ و دەڵێ: کۆمەڵناس دەبێ هۆکارەکانی ڕاکێشان و پاڵپێوەنانی حەشیمەت لە ناوچە جیاوازەکان بدۆزێتەوە. بۆ نموونە ئەوە نیشان بدات کە بۆ هەندێك لەناوچەکان حەشیمەت بۆلای خۆیان ڕادەکێشن و هەندێکی دیکە لەخۆیان دووری دەکەنەوە و هۆکارە و شوێنەوارەکانی بڵاوبوون و کۆبوونەوەی حەشیمەت چییە.

مارسێل مووس (M.Mauss) قوتابیی دۆرکایم دەربارەی کاریگەریی گردبوونەوە و بڵاوبوونی حەشیمەت لە ژیانی ناوەوەی کۆمەڵگەدا دەڵێ:

قەبیلەی ئیسکیمۆکان خاوەن دوو حاڵەتی دانیشتووانە. حاڵەتی کەڵەکەبوون و چڕیی حەشیمەت و حاڵەتی بڵاوبوون و پەرتەوازەیی حەشیمەت. کاتێك کە لە زستاندا دانیشتووان لێك نزیکن، تاکەکان هەستی مرۆڤدۆستیی بەهێزیان هەیە. کاتێك کە حەشیمەتەکە

بڵاودەبێتەوە، تاکەکان خۆپەرست و خۆویست و دوور لە هەستی مرۆڤدۆستیین. ئەم دیاردەیە لە هەندێك لە گوندەکانی ناوچەی "بانە"ی کوردستانیش بە شێوەیەکی دیکـە بەرچـاو کـەوتووە. لەم ناوچەیەدا بە هۆی بارودۆخی تایبـەتی ژینگـەی جوگرافیـایی، گوندنشـینان لـە دوو جـۆر شوێنی نیشتەجێبوونی هاوینە و زستانە کەڵك وەردەگرن. زسـتان لـە گونـدی سـەرەکییان بـە شێوەی بەکۆمەڵ و لە پەنا یەکتر ژیان بەسەردەبەن. هاوینانیش لە ناوچە کوێستانییەکان لەنێو لەوەڕگە و لێڕەوارەکان بە شێوەی بەربڵاو و جیا لە یەکتر بەسەردەبەن.

ئەم شێوازە ژیانە کە بە پێی ڕەوشی گوزەرانی ئاژەڵداری و کەمبوونی لەوەڕگەکان لە دەوروبەری گوندە ئەسڵییەکە و گوندەکانی ناوچەکەیە، دەبێتە هۆی ئەوەکـە خـەڵك لـە دوو جۆر یەکەی نیشتەجێبوونی بڵاو ( لە هاویندا) و چـڕبۆوە ( لـە زسـتاندا) سـوود وەربگـرن. هاوینان لە سەری چیا و تەپۆلکەکان و لەنێو لەوەڕگەکان و لەو یەکە نیشتەجێبوونانەی کـە "کۆخ"یان پێدەڵێن، لە هاوین و ماوەیەك لە بەهار و پاییز لەگـەڵ مەڕوماڵاتەکـەیان لـەو شوێنانە کات بەسەردەبەن. لە وەرزی زسـتان و لـە کـاتی مـانگی ڕەمـەزان و تازیـەداریی ئایینیدا بۆ گوند دەگەڕێنەوە. بە هۆی بارودۆخی ژیان و دژواریی پەیوەندیدار بە کـەمبوونی لەوەڕگە لە گوندەکەیاندا و هەروەها هەلومەرجی کەشوهەوا حەزکردن بۆ " کـۆخ نشـینی" زیاتر بووە و لە ئاکامدا ڕووحییەی گۆشەگیری و تەکڕەوی تێیاندا پەیدا بـووە و ڕووحییـەی بەکۆمەڵبوون بێهێز بووە. (٦)

## ٢ ـ فیزیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی (Physiologie Sociale)

لـەم شـێوازەدا پێکهاتـەی کۆمەڵگـە و ئەنـدام و توخمـە پێکهێنـەرەکانی، دامـەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، گرووپە کۆمەڵایەتییـەکان، شـێوازە جۆراوجۆرەکـانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی، ئابووری و سیاسی، پێکهاتەی دەسەڵات و ... تاووتوێ دەکرێن و پەیوەنـدییان لەگـەڵ دیـاردە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەوە ڕوون دەکرێتەوە.

## ٣. کۆمەڵناسیی گشتی

ئامانجی کۆمەڵناسیی گشتی پێکهێنانی سەنتێزێك لە هەموو دیراسات و توێژینەوەکان لە بوارە جیاوازەکان و، ڕوونکردنەوەی یاسا گشتییە کۆمەڵایەتییەکانە و لەم بوارەدا هەموو دیراسە و توێژینەوەکان بە مەبەستی دۆزینەوەی یاسا گشتییەکانی کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ. (٧)

ـ **کۆمەڵناسی لە باری ئامانجەوە:** کۆمەڵناسی لە باری ئامانجی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە بە دوو جۆر دابەش دەبێت:

### ١. کۆمەڵناسیی تیۆری (Sociologie Theorique)

ئەمانجی ئەم بەشە لە کۆمەڵناسی ناسینی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و دۆزینەوەی هۆکارەکان و دەرئەنجامەکانیانە بەبێ ئەوەی کە سوودی کاتییان لەبەرچاو بێت. هەرچەند لە کۆتاییدا سوودی بۆ زانستە مرۆییەکان دەبێ، بەڵام کۆمەڵناسیی تیۆری زیاتر هەوڵ دەدات بە پێی تیۆرییەکانی مرۆڤناسانە پانتایی ئەم زانستە بەربڵاوتر بکات و لە ناسینی زیاتری جیهانی دەرەوە بە زانستی مرۆیی زیاد بکات. بۆ نموونە کاتێك کۆمەڵناسان پێکهاتە و ئەرکی خێزان و کارلێکی دوولایەنەی تاکەکانی خێزان تاووتوێ دەکەن لەبواری شێوازەکانی هاوسەردیتنەوە و هەڵبژاردنی هاوسەر لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکاندا خەریکی تاووتوێ و توێژینەوە دەبن و ئەنجامی توێژینەوەکانیان لە کتێبەکاندا دەخەڕوو، ئێمە لە تیۆرییەکانی کۆمەڵناسانە سەبارەت بە خێزان لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان ئاگادار دەبین و بە زانستی ئێمەوە زیاد دەکەن و بوارێکی گونجاو بۆ توێژینەوەی ئێمە دەستەبەر دەکەن و لە ئاکامی ئەم توێژینەوانەدا، زانستی مرۆیی بەربڵاوتر و دەوڵەمەندتر دەبێ کە سەرەنجام بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی بەسوود دەبێت.

### ٢. کۆمەڵناسی کردەیی یان پڕاکتیکی (Sociologie Pratique)

هەرچەند کۆمەڵناسی لە توێژینەوەکانیدا بیهەوێ و نەیهەوێ سوود بە زانستە مرۆییەکان دەگەیەنێ، بەڵام ئامانجی ڕاستەوخۆی ئەو زانستە زیاتر ئەمەیە کە لە توێژینەوەکانی لە پێناو لابردنی دژوارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ بە شێوەی پراکتیکی کەڵك وەربگرێ. لەم ساڵانەی دواییدا ئەم جۆرە توێژینەوانە لە کۆمەڵە جۆراوجۆرەکانی گوند و شاردا لە زۆر وڵاتاندا برەوی ستاندووە. توێژینەوە لەمەڕ هۆکارەکانی چەندپارچەیی زەوی کشتوکاڵ و غەیرە ئابووری بوون و ئاستەنگییەکانی

سەرچاوەگرتوو لەمــە، توێژینەوەیەکــە کــە ناونیشــانی کۆمەڵناســیی پراکتیکــی وەرگرتــووە، چــونکە دەرەنجامەکانی توێژینەوە لەبەردەست پلاندارێژان و جێبەجێکاران دایە بۆ ئــەوەی لــە ڕاســتای گەشــەی ئابووری و بە مەبەستی ڕێکوپێك کردنی بەرنامە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان سوودیان لــێ وەربگــرن و ئەم کێشەیە چارەسەر بکەن. هەروەها ئەو توێژینەوانەی کە لە بواری کۆچکردنی گوندنشینان بــۆ شــار، مەسەلەی تەڕافیك لە شاری تاران، جیابوونەوە، لادانی هەرزەکاران، گیرۆدەبوون و ... ئەنجام دەدرێــت، بە بابەتگەلی توێژینەوە لە بواری کۆمەڵناسیی پراکتیکی لەقەڵەم دەدرێن.

## ـ کۆمەڵناسی لە باری سنوورەوە:

کۆمەڵناسی لە باری سنوور و پانتایی کۆمەڵگەی توێژینەوە بۆ دوو جۆر دابەش دەبێ:

### ئا ـ کۆمەڵناسیی ورد

بــە درێــژایی ســی ســاڵی دوایــی کۆمەڵناســیی ورد وەك یــەکێك لــە شــێوازەکانی توێژینــەوەی کۆمەڵگەناسانەی گرووپە بچووکەکان کەڵکی لێ وەرگیراوە. بەکارهێنانی ئەم شــێوەیە لــە توێژینــەوەی گرووپە بچوکەکاندا ئەوە دەردەخات کە کۆمەڵناسان لــە نێــوان گرووپــی بچــوك (Small Group) و گرووپی گەورە (Large Group) دا هەندێك جیاوازییان دەست کەوتووە.

لە کۆمەڵناسیی وردیدا سەرەتا شێوازە جیاوازەکانی "بەکۆمەڵایەتیبوونی مرۆڤـ" تــاووتوێ دەکرێت و جۆری ئەو هۆگریی و پەیوەندییانەی کە هۆکاری یەکگرتوویی تاکەکانە و ئەوان لــە چوارچێوە کۆمەڵایەتیدا لێك گرێ دەدات، ڕوون دەکاتەوە.

### ب ـ کۆمەڵناسیی فراوان (گەورە)

کۆمەڵناسیی کــەلان تــاووتوێی سیســتەمە گشــتییە کۆمەڵایەتییــەکانی وەك سیســتەمی فیۆداڵی، سیستەمی سەرمایەداری و ... دەکــات و هــەوڵ دەدات هۆکارەکــانی پەرەســەندن و گۆڕانکارییەکانیان ئاشــکرا بکــات و یاســا گشــتییەکانی زاڵ بەســەر ئــەم سیســتەمانە ڕوون بکاتەوە.

## ـ کۆمەڵناسی لە باری بابەتەوە:

کۆمەڵناسی لە جیهانی ئەمڕۆدا بۆ توێژینەوە و تاووتوێکردن خاوەن بواری جۆراوجۆر و فرەچەشنە. لە ئاکامی دابەشبوونی کار، گەلێك پسپۆڕێتیی هاتوونەتە کایەوە و هەر کام لە کۆمەڵناسان لە بوار و بابەتێکی تایبەتدا خەریکی لێکدانەوە و توێژینەوەن.

ئەمڕۆکە بوارەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا ڕۆژ بە ڕۆژ لە حاڵی زیادبوون دان، وەك زانستی پزیشکی کە بابەتەکەی بەرەبەرە پەرەی سەندووە و زۆر پسپۆڕێتییش پەیدا بوون. لەم زانستەشدا هەر یەکێك لە پسپۆڕان لە بوارێکی دیاریکراو و لە چوارچێوەیەکدا خەریکی کارکردنن.

هەندێك لە لقەکانی کۆمەڵناسی بریتین لە: کۆمەڵناسیی شارنشینی، کۆمەڵناسیی گوندنشینی، کۆمەڵناسیی خێزان، کۆمەڵناسی پیشەسازی، کۆمەڵناسیی کار، کۆمەڵناسیی ڕاگەیەنە گشتییەکان، کۆمەڵناسیی سیاسی، کۆمەڵناسیی ئەدەبیات، کۆمەڵناسیی مەعریفە، کۆمەڵناسیی جەنگ (شەڕ)، کۆمەڵناسیی یاسایی، کۆمەڵناسیی لاوان، کۆمەڵناسیی ئایینی، کۆمەڵناسیی هەژاری و ...

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی دووەم

١ـ هانری منـدراس (Henri Mendras)، مبـانی جامعه‌شناسـی، ترجمـه بـاقر پرهـام، انتشـارات امیرکبیر، ١٣٤٩، ص ١١.

٢ـ امیل دورکیم (E.Durkheim) قواعد روش جامعه‌شناسی، علی محمد کاردان، موسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی، ١٣٤٣، ص ٦و٧.

٣ـ ساموئل کُنیگ (S.koening)، جامعه‌شناسی، مشفق همدانی، امیرکبیر، ١٣٤٩، ص ١٩ و ١٨.

٤ـ رجوع شود به مجله سخن، دوره شانزدهم، عقاید و أرا گورویچ ص ٧٩٩.

٥ـ امیل دورکیم، قواعد روش جامعه‌شناسی، علی محمد کاردان، موسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی، ١٣٤٣، ص ٦و٧.

٦ـ علی اکبر نیك خلق، مقدمه‌ای بۆ جامعه‌شناسی روستایی ایران، پژوهشکده علوم ار طباتی و توسـعه ایران، ١٣٥٨، ص ٣٦.

٧ـ برای کسب اطلاعات بیشتر رجوع فرمائید به تاریخ جامعه‌شناسی، نوشته جمشید مرتضوی، موسسـه تحقیقات اجتماعی و علوم انسانی دانشـگاه تبریـز، ١٣٥١، صـفحه ٢٥٧ و نیـز علـی اکـبر ترابـی، مبـانی جامعه‌شناسی، اقبال، ١٣٤٧، ص ٦٧.

# بەشی سێیەم

## کۆمەڵناسیی و زانستەکانی دیکە

ناسین و تاوتوێکردنی کۆمەڵگەی مرۆیی، بابەتی زانستێکی تایبەت نییە، بەڵکوو زانستە جۆراوجۆرەکانی وەك جوگرافیای مرۆیی، مێژوو، ئابووری، ئەنترۆپۆلۆژیا، دانیشتواناسی (دیمۆگرافیا)، یاسا، دەروونزانی و زانستە هاوشێوەکانی دیکە هەر یەکێکیان سەرنجی لایەنێك لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییان داوە و لە ناسینی بەتەواوەتی کۆمەڵگەدا هاوکاریی یەکتریان کردووە. بەڵام ئەوەی کە ئەو هاوکاری و پەیوەندییە بە چ شێوەیەك جێبەجێ دەکرێ و کۆمەڵناسی لە نێو ئەم زانستە کۆمەڵایەتیانەدا لە چ ڕەوشێك دایە و چ پێگەیەکی هەیە، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە نێو خاوەنڕایان و کۆمەڵناسان باس و گفتوگۆی زۆری لەسەرکراوە و هەر یەکێکیان بە شێوەیەك لەسەری دواوە. هەندێك لە کۆمەڵناسانی وەك دۆرکایم و شاگردەکانی بابەت و سنووری کۆمەڵناسییان بە ڕادەیەك بەربڵاو نیشان داوە کە زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە وەك لقەکانی ئەم زانستە لەقەڵەم دەدران. مارسێل مووس قوتابیی دۆرکایم بە پشت بەستن بە بۆچوونی مامۆستاکەی دەڵێ:"کۆمەڵناسی زانستی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانە".

بەم پێناسەیە دەتوانرێ هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە تێهەڵکێشی کۆمەڵناسی بکرێن. دۆرکایم و پەیڕەوانی پێیان وابوو کە ئابووری زانستێکە کە دامەزراوەی ئابووری تاوتوێ دەکا و زمانناسی بونیادی زمان و مێژوو گرینگی بە پەرەسەندن و گۆڕانکارییەکانی ئەم دامەزراوانە دەدات. بەم پێیە هەموو ئەم زانستانە وەك زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لە هەناوی کۆمەڵناسیدا جێدەگرن. جۆرج گۆرڤیچ ئەم بۆچوونەی ڕەت کردۆتەوە و دەڵێ: دۆرکاریم و شوێنکەوتووانی لەم مەسەلەیە بێئاگا بوون کە لە تەنیا سنوورێکدا دەتوانرێ بە شێوازی

جۆراوجۆر هەڵسەنگاندن بکەین. هەروەها لـە هـەمان چوارچێوەدا دەتـوانین ئاسـت و لایەنـە جۆراوجۆرەکانی بابەتێك لێك بدەینەوە.

بـۆ نموونـە زانسـتی یاسـا گرینگـی بـە یاسـا دادوەرییـەکان دەدا، جوگرافیـای مرۆیـی بابەتـە پەیوەندیدارەکان بە مۆرفۆلۆژیا و کاریگەریی دوولایەنەی مرۆڤ و ژینگە لێك دەداتەوە و زانستی زمـان سەرنجی نیشانەکان و ڕاز و هێماکانی زمان دەدا، لە حاڵێکدا کـە کۆمەڵناسـی دیـاردەی کۆمەڵایـەتی تەواو و کامڵ کە گشت ئاستەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لەخۆ دەگرێ، لێك دەداتەوە.

دەربارەی جیاوازی نێوان زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان و لقـەکانی کۆمەڵناسـی دوو تیـۆری خراونەتەڕوو:

١ـ بۆچوونی یەکەم ئەوەیە کە هەر کام لە لقەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی گشتی خەریکی شیکردنەوەی کاروبار و بابەتەکانی پەیوەندیدار بە خۆیانن، بۆ نموونـە زانسـتی ئابووری بابەتە ئابوورییەکان شی دەکاتەوە و لێکیان دەداتەوە و کۆمەڵناسی بایەخ بە داڕشتنی سەنتێزەکان دەدا.

٢ـ ڕای دووەم ئەوەیە کە هەر یەك لە زانستە کۆمەڵایەتییـەکان گرینگـی بـە یـەکێك لـە لایەنە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەدەن و لقەکانی کۆمەڵناسییش هەر ئەم کارە دەکـەن، بەڵام بەم جیاوازییـەوە کـە لـەم ئاسـتەدا ڕاناوەسـتێ بـەڵکوو هـەوڵ دەدا لـە لێکۆڵینـەوە و تاووتوێکردنی لایەنێکی کۆمەڵایەتی، لەگەڵ لایەنەکانی دیکـە گرێـی بداتـەوە و بـە شـێوەی گشتێکی تەواو لەبەرچاوی بگرێ و ڕوونی بکاتەوە. بۆ وێنە هەر یەك لە بابەتەکانی کۆچکردن، هاوسەرگیری، جیابوونەوە، گیرۆدەیی، لەدایکبوون، مردن و ... بە شێوەیەکی جیاجیا و بـەبێ گرینگیدان بە ئاستەکانی دیکەی ژیانی کۆمەڵایەتی وەك ئابووری، حەشیمەت، بنەماڵەن و... ناتوانرێ ڕوون بکرێنەوە.

گۆرڤیچ کۆمەڵناسـیی بـە یـەکێك لـە زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان دادەنـێ کـە دیـاردەی کۆمەڵایەتی لە گشتێتی خۆیدا و لە حاڵـەتی پەرەسـەندن و گۆڕانکاریـدا لەبەرچـاو دەگـرێ و جیاوازییەکەی لەگەل زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە زیـاتر لـە بیـاڤی کـار و شـێوازەکەیدا دەبینێ. لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی باسەکەمان تاوتوێی هەنـدێك لـە زانسـتەکۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییان بە کۆمەڵناسییەوە دەکەن.(١)

### ١. مێژوو

ناسینی دیاردەکۆمەڵایەتییەکان لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە تەنیا تایبەت بە لێکدانەوەیان لە سەردەمی ئێستادا نییە، بەڵکوو بۆ تێگەیشتن و ڕوونکردنەوەی ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ سەرنجی ڕابردووی دوور و نزیکیان بدرێ.

کۆمەڵناسی لەم بوارەدا پێویستی بە زانستی مێژوو هەیە. زۆربەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان سەرچاوەیان بۆ ڕابردوو دەگەڕێتەوە و دەبێ لە ڕۆژگارانی کۆندا بەدوای هۆکارەکانیاندا بگەڕێین. کۆمەڵناسی لە تاوتوێکردنی هێما کۆمەڵایەتییەکان و شرۆڤە و ناسینیان کەڵك لە زانستی مێژوو وەردەگرێ. مێژوو لەسەر بنەمای بابەتە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندیدار بە خۆی بۆ سەر لقەکانی ئایینی، سیاسی، هونەری، ئەدەبی، فەلسەفی، کولتووری و ... دابەش دەکرێ و لەهەر یەك لەم لقانەدا، هاوکاری لقە هاوشێوەکانی کۆمەڵناسی دەکات.

مێژوو بۆ ڕوونکردنەوەی پێشینەی ژیانی کۆمەڵایەتی و کاریگەریی بەڵگەنەویست و ئاشکرای لەسەر ژیانی هەنووکەیی لە گشت کاروبارەکانی کۆمەڵگەدا، دەبێ ببێتە جێگەی سەرنجی کۆمەڵناسی، چونکە ناکرێ دیاردەکان بەبێ سەرنجدان بە ڕابردوویان تاوتوێ بکرێن. توێژینەوە بە شێوازی مێژوویی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە کۆمەڵگە مرۆییەکان لە قۆناغە جیاوازەکان و لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان چ بیروڕا و بۆچوونگەلێکی فەلسەفی، کۆمەڵایەتی و زانستی بوونیان هەبووە، ژیان و گوزەرانی خەڵك بە چ شێوەیەك بووە؟ شێوازەکانی دەسەڵاتداریێتی، ڕێکخراوەکانی بەرگری و ئیداری چ گۆڕانکاریگەلێکیان بەسەردا هاتووە ؟ و ...

مێژوو زیاتر وەسفی دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە سەرەتای پەیدابوونییەوە دەکات لە حاڵێکدا کە کۆمەڵناسی سەرقاڵی شیکردنەوە و تاوتوێی ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان و هۆکارەکانی ڕوودان و دەرکەوتنیان و پەیوەندیی نێوانیانە و لەڕێگەی بەراوردی ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان و دەرخستنی خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان هەوڵ دەدات بیانگشتێنێ و بە یاسا گشتییەکان بگات. لەسەر ئەم بنەمایە مێژوو و کۆمەڵناسی تەواوکەری یەکترن.

کاتێك كە مێژوونووس دەیهەوێ دیاردەکـان و هۆکارەکـانی دەرکـەوتنیان شـی بکاتـەوە، پێویستی بە کۆمەڵناسی هەیە، چونکە هـەر ڕووداوێـك ئاکـامی تێکـەڵاوبوونی دیاردەگـەلی جۆراوجۆرە و بۆ ناسینی پێویستە ئاگاداری پێکهاتە، بونیاد و دیاردەکانی دیکە بین.

کۆمەڵناسـی لـە لێکدانـەوەی دامـەزراوەکان و کاروبـاری کۆمەڵایـەتی و شـیکردنەوەی سەرچاوەکانی، سوود لە مێژوو وەردەگرێ. بۆ نموونە تاوتوێی ڕووداوەکانی قۆناغێکی مێژوویی وەك سەردەمی ساسانی لە ئێراندا لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، بەڵام ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی حکومەت و تایبەتمەندییەکانی ڕێکخراوە سیاسییەکان لە پەیوەندی لەگەڵ ئاست و لایەنـەکانی کۆمەڵگەی ساسانی وەك بنەماڵە، حەشیمەت، گرووپ و چینە کۆمەڵایەتییەکان و سیسـتەمی داخراو و کاروبارە هاوشێوەکانی تر و سەرەنجام دۆزینەوەی هۆکـار و دەرەنجامـەکانی ڕووخـانی ئەم زنجیرە دەسەڵاتدارێتییە، بە توێژینەوەیەکی کۆمەڵناسانە لەقەڵەم دەدرێ.

لەڕاستیدا دەتوانرێ بانگەشـەی ئـەوە بکـرێ کـە کۆمەڵناسـێك بـەبێ ناسـینی مێـژووی کۆمەڵگەیـەك ناتوانـێ بـە شـێوەیەکی قـووڵ و ڕوو لـە گەشـە، ڕەوتـی گۆڕانکارییـە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە هەڵسەنگێنێ و تاوتوێیان بکات.

## ٢- جوگرافیای مرۆیی

پەیوەندییەکی نزیك لە نێوان جوگرافیـای مرۆیـی(Geographie Humaine) یـان بـە وتـەی هەنـدێك لـە کۆمەڵناسـان، جوگرافیـای کۆمەڵایـەتی (Geographie Sociale) و کۆمەڵناسیدا هەیە. ئەو بابەتانەی کە جوگرافیا لێیان دەکۆڵێتەوە، فاکتـەرە سـەرەکییەکانی پێکهێنەری هەلومەرجی تایبەتی کۆمەڵایەتین. شێوازی نیشتەجێبوون و جۆری ژیان و گوزەران تا ڕادەیەك پەیوەندییان بـە دۆخ و هەلومـەرجی جـوگرافی هەیـە. بـۆ نموونـە شـێوازی ژیـانی دانیشتووانی دەشتەکان جیاوازی لەگەڵ جۆری ژیان و گوزەرانی دانیشتووانی دەرودۆڵەکان یـان دانیشتووانی قەراغ ڕووبارەکان یان لێڕەوارەکان هەیـە. ئـەم هـزرە کـە خـوو و ڕەوشـتی هـەر نەتەوەیەك لەژێر کاریگەریی ژینگەی جوگرافی دایە، هەر لە کۆنەوە هەبووە. ئەفلاتوون لەمـەڕ پەیوەندیی نێوان فاکتەری جوگرافی و شێوازی ژیان و دەسەڵاتدارێتیی چەند باسـێکی هێناوەتـە گۆڕێ. ئیبن خەلدوون قسەی لەسەر ژینگە و پەیوەندیی لەگەڵ کولتووری کۆمەڵگەدا کردووە.

مۆنتسکیۆش بڕوای وابووە کە لەنێوان جۆری حکومەت و ئاووهەوا و بەپیتیی خاکـدا پەیوەندیی هەیـە. "لوپلـە" گرینگـی بـە کاریگـەری ژینگـەی جـوگرافی لەسـەر ژیـانی

کۆمەڵایەتی داوە. ناوبراو لە توێژینەوەکانیدا وێڕای ئاماژە بە کولتوور و ئەخلاقی مەڕداران و چادرنشینەکانی دەشتی ئاسیا دەڵێ: جۆری کولتوور و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییان لەسەر بنەمای خێزانی بەربڵاوی باوکسالاری ڕاوەستاوە کە پەیوەندی بە کەڵك وەرگرتن لە لەوەڕی ئاژەڵەکان لە لەوەڕگە پان و بەرینەکانەوە هەیە. بەم هۆیەوە هەندێك لە جوگرافیاناسەکان بڕوایان بە ناچاریێتی (حەتمییەت)ی جوگرافی هەیە کە یەکێك لەو کەسانە "ڕاتزێل"ی ئەڵمانییە.

بەڵام لە بەرامبەر کاریگەرییەك کە ژینگەی سروشتی و هەلومەرجی ناوچەیی لەسەر شێوازی ژیان و جۆری گوزەرانی دادەنێن، کردەوەکانی مرۆڤیش کاریگەریی لەسەر سروشت و ژینگەی جوگرافیا دادەنێ. هەر بۆیە لە ناسینی کۆمەڵگە مرۆییەکاندا بە هەمان شێوە کە دەربارەی پەیوەندیی گرووپەکان و ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان توێژینەوە دەکرێ، پەیوەندی ئەم کۆمەڵگەیانە لەگەڵ جۆری ژینگەی دەرەوەیان و کاریگەرییەك کە ژینگەی جوگرافی لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هەیەتی، تاوتوێ دەکرێ و لەم بابەتەدا پەیوەندی نێوان کۆمەڵناسی و جوگرافیا دەردەکەوێ. ئەم نزیکی و پەیوەندییە لەو کاتەوە کە لقێکی گرنگ لە جوگرافیا ناوی جوگرافیای مرۆیی یان جوگرافیای کۆمەڵایەتی لێنراوە، بایەخی زیاتری پەیدا کردووە و ئێکۆلۆژیای مرۆیی(Ecologie Humaine) کە لە مرۆڤ لە باری پەیوەندیی لەگەڵ ژینگەی سروشتی دەکۆڵێتەوە، فاکتەرێکی هاوبەشە کە ئەم دوو زانستە لێك گرێ دەدات.(٢)

لەسەریەك دەتوانین بڵێین جوگرافیای مرۆیی کاریگەرییەکانی ژینگە لەسەر کۆمەڵگەی مرۆیی و هەروەها کاریگەرییەکانی مرۆڤ بە هاوکاریی تەکنۆلۆژیا لەسەر ژینگە تاوتوێ دەکا و لێیان دەکۆڵێتەوە یان بە واتایەکی سادەتر، توێژینەوە لەسەر کاریگەریی دوولایەنەی هۆکارە جوگرافی و مرۆییەکان لەسەر یەکتر دەکا. کۆمەڵناسی لە بابەتە پەیوەندیدارەکان بە مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی، بە تایبەت لە کۆمەڵناسیی گوندنشینیدا، پێویستی بە هاوکاری جوگرافیای مرۆیی هەیە.

### ٣. خەڵکناسی یان ئەنترۆپۆلۆژیای کولتووری

کۆمەڵناسی لە زۆر بابەتدا خاڵی هاوبەشی لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆژیادا هەیە و ئەم هاوبەشییە بە شێوەیەکە کە دیاریکردنی سنووری نێوانیان دژوار دەکات. هەندێك لە کۆمەڵناسان و ئەنترۆپۆلۆژییەکان لە بواری جیاوازی نێوان ئەم دوو زانستە دەڵێن: کۆمەڵناسان توێژینەوە لەسەر دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن و مرۆڤناسان دیاردە کولتوورییەکان تاوتوێ دەکەن. بۆ نموونە کرۆبێر (Kroeber)دەڵێ: کۆمەڵناسی لە کۆمەڵگە و ئەنترۆپۆلۆژیا لە کولتوور دەکۆڵێتەوە. هەندێك لە خاوەنڕایان پێیان وایە کە کۆمەڵناسی لایەنەکانی چەندێتی و ئەنترۆپۆلۆژیا لایەنە چۆنایەتییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ تاووتوێ دەکات.

کۆمەڵناسی زیاتر لە بواری توێژینەوەکانی خۆیدا لە شێوازی "توێژینەوەی فراوان" کە لە ئاستێکی بەربلاو و لە ماوەیەکی تا ڕادەیەك کورتدا جێبەجێ دەبێ، کەڵك وەردەگرێ و ئەنترۆپۆلۆژیا شێوازی "توێژینەوەی چڕ" یانی توێژینەوەیەکی قووڵ و هەمەلایەنە کە لە کۆمەڵگەیەکی بچوك و سنووردار وەك بنەماڵە، عێل، عەشیرەت، تایفە، گوند و لە ماوەیەکی تا ڕادەیەك دوورودرێژدا ئەنجام دەدرێ، کەڵك وەردەگرێ. هەروەها دەتوانین بڵێین کۆمەڵناسی بایەخ بە بابەتە ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگە هاوچەرخەکان دەدا و لە زۆر بابەتدا لە دەسکەوتەکانی ئەنترۆپۆلۆژیا سوود وەردەگرێ. بەڵام ئەنترۆپۆلۆژیا توێژینەوە لەسەر قەومە سەرەتاییەکان دەکا و لە ڕێگەی تاووتوێ و بەراوردکردنی کولتوور و شوێنەوارەکانی ژیانی مرۆڤە سەرەتاییەکان و کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆیی، بە نیازی ناسینی پەرەسەندنەکانی بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی مرۆڤە. لەگەڵ ئەمەشدا نابێ پێمان وابێ کە ئەنترۆپۆلۆژیا تەنیا لە ژیانی مرۆڤە سەرەتاییەکان دەکۆڵێتەوە، بەڵکوو ئەمرۆکە بوارێکی بەرفراوانی داگیر کردووە و ئەنترۆپۆلۆژییەکان هۆگرییەکی زۆریان بە بەکارهێنانی شێوازەکانی شیکردنەوەی کۆمەڵگە پیشەسازییەکان هەیە و زیاتر گرووپە بچوکەکان لەناو کۆمەڵگە شارنشینی و گوندنشینەکان دیراسە دەکەن و لە هەندێك بواری وەك کەسایەتی و کولتوور ئەنترۆپۆلۆژییەکان و دەروونناسەکۆمەڵایەتییەکان توێژینەوەی هاوبەش ئەنجام دەدەن کە ئەمە خۆی نزیکی و پەیوەندیی ئەم زانستانە نیشان دەدا.(٣)

له کۆتاییدا و به شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ بگوترێ که کۆمەڵناسی و خەڵکناسی ( یان ئەنترۆپۆلۆژیای کولتووری) له دوو لایەنەوە جیاوازییان لەگەڵ یەکتر هەیه: له باری میتۆد و له باری سنوورەوە. له باری میتۆدەوە هەروەك باسکرا، له کۆمەڵناسییدا له شێوازی بەرینی ڕوانین و له خەڵکناسییدا له شێوازی باریك بینانه کەڵك وەردەگیرێ. له باری سنوورەوە خەڵکناسی توێژینەوە لەسەر کولتوور و هەندێك له کولتوورەکانی کۆمەڵگەکان و یەکە بچووك و سنووردارەکان دەکات له حاڵێکدا که پانتایی توێژینەوەکانی کۆمەڵناسی زۆر بەربلاوتره و زیاتر دامەزراوەکان، ڕێکخراوەکان و به گشتی دیاردەکۆمەڵایەتییەکان له کۆمەڵگه ئاڵۆزەکاندا تاوتوێ دەکات.

## ٤. ئابووری

زانستی ئابووری لێکۆڵینەوەی پەیوەندییه مرۆییەکان له بوارەکانی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکاربردنی شتومەك و خزمەتگوزارییەکانه. بەلام چونکه ئەم پرۆسەیه له کۆمەڵگەدا بەڕێوە دەچێ، بەشێك له کاروباره کۆمەڵایەتییەکان پێك دێنێ. به واتایەکی دیکه دەرکەوته ئابوورییەکان که به هۆی پەیوەندیی دوو لایەنەی نێوان مرۆڤەکان دێنه ئاراوە، بەشێك له کاروبارەکانی ناو کۆمەڵ دێنه ئەژمار، کەواته پەیوەندییان به کۆمەڵناسییەوە هەیه. له هەر کام له بوارەکانی سەرەوەدا، بابەتی پەیوەندییه کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەرییەکانی فاکتەره کۆمەڵناسییەکان له نموونەکانی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکاربردنی دەردەکەوێ.

بۆ نموونه له کرداری بەرهەمهێنان کۆمەڵناسیی پیشەسازی، پێوەندیی لەگەڵ بابەتگەلێکی جۆراوجۆر له بواری پەیوەندییه کۆمەڵایەتییەکانی نێوان کرێکار و خاوەنکار، له بابەت ڕادەی حەقدەستەکان و نرخەکان و هەروەها ڕووبەڕووبوونەوەی کولتوور و کەسایەتی نێوان کەسانێك که له کارگەدا پێکەوە کار دەکەن، هەیه که کەڵك له کۆمەڵناسی و دەسکەوتەکانی له بواری ئابووریدا وەردەگیرێ. هەروەها فاکتەری کاریگەر له فۆرم گرتنی بازاڕ و پەیوەندییەکانی ناو بازاڕ له بابەتەکانی پەیوەندیدار به بیاڤی کۆمەڵناسیین.

لەڕاستیدا ئابووری که گرینگی به لایەنێکی تایبەتی ژیانی کۆمەڵایەتی دەدا لەگەڵ کۆمەڵناسی که کاروباره کۆمەڵایەتییەکان به شێوەیەکی گشتی تاووتوێ دەکا، پەیوەندیی پێك دێنێ. کۆمەڵناسی هەروەها پەیوەندییەك که له نێوان دابەشکردنی کالا و چین و توێژه جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا هەیه، ڕوون دەکاتەوە و کاریگەریی هۆکاره کۆمەڵایەتییەکانی وەك

عادەت، دابونەریت، ڕێوڕەسم، کولتوور و بیروبۆچوونەکان و هۆکارە هاوشێوەکانی دیکە لە دیاردە ئابوورییەکاندا دەردەخا و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بە چ شێوەیەك جۆراوجۆریی گەشەی ئابووری پەیوەندیی بە جۆری بیرکردنەوە و شێوازی پەروەردە و سەرەنجام جۆرێك پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هەیە.

### ٥. دیمۆگرافیا

دیمۆگرافیا (Demographie) لێکۆڵینەوە لە پێکهاتەی دانیشتووان و بزاوت و گۆڕانکارییەکانی لە شوێن و کات ( لەدایکبوون، هاوسەرگیری، مردن، گرووپە تەمەنی و ڕەگەزییەکانی حەشیمەت و کۆچکردن) دەکا و لەم بوارەدا سوود لە ئامار وەردەگرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەم کاروبارانە لە کۆمەڵدا ڕوو دەدەن، لەگەڵ کۆمەڵناسی کە تاوتوێی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، پەیوەندییان هەیە و ناتوانن لە کاریگەرییەکانی هۆکارە ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان بەدوور بن.

دۆرکایم لە کتێبی "دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتی"دا ئاماژە بەوە دەکا کە لە نێوان چوونەسەری حەشیمەت و دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتیدا، هاوپێوەندییەکی پۆزەتیڤ لەئارا دایە. واتە هەرچەندە ڕادەی دانیشتووان بەرەوسەر بچێ، دابەشکردنی کار و پسپۆڕێتی زیاتر دەبێ. لە جیهانی ئەمڕۆدا زیادبوونی حەشیمەت بە تایبەتی لە کۆمەڵە گەورە پیشەسازییەکاندا گۆڕانکاریی زۆری لە باری کولتووری ـ کۆمەڵایەتی بە تایبەت لە بواری خێزاندا لێکەوتۆتەوە. کۆمەڵناسان لە توێژینەوەکانیاندا دەریانخستووە کە زیادبوونی حەشیمەت لە شارە گەورەکاندا، کەمبوونەوەی منداڵ خستنەوە و لە ئاکامدا بچووك بوونەوەی قەوارەی خێزانی لێکەوتۆتەوە و گۆڕانی بەسەر ئەرکی خێزان لە بوارە سەرەکییەکاندا هێناوە و لەزۆر بابەتدا لاوازی و سستی و لێك هەڵوەشانی خێزانەکانی بەدواوە بووە.

بێگومان منداڵبوون تەنیا کردارێکی بایۆلۆژی نییە، بەڵکوو هۆکارە کۆمەڵایەتی ـ ئابووری و زۆر هۆکاری کۆمەڵایەتی دیکە لە ڕێژەکەیدا کاریگەرییان هەیە. بێجگە لەمەش بە هۆی کارکردنی ژن لە کۆمەڵگەدا و کەمبوونەوەی حەزی ماڵداریی و منداڵ بەخێوکردن و لە ئاکامدا ناجێگیری و بەردەوام نەبوونی خێزان و زیادبوونی ڕێژەی جیابوونەوە لە شارە پیشەسازییە نوێیەکاندا کێشە و گرفتی زۆر هاتۆتە ئاراوە کە زۆرجار گرژی و ئاڵۆزی و قەیرانی زۆری لێ دەکەوێتەوە. ئەمانە و زۆر بابەتی دیکەی دیمۆگرافی پێویستیان بە توێژینەوەی مرۆڤناسانە

هەیە. دیمۆگرافیا دەرەنجامی توێژینەوەکانی خۆی لە بواری بزاوتە شوێنی و کاتییەکانی حەشیمەت و بابەتەکانی دیکەی دیمۆگرافی، لەبەردەست کۆمەڵناسان دەنێت هەتا ئەوان بە لێکدانەوەی کۆمەڵناسانە، هۆکار و دەرەنجامەکانیان بدۆزنەوە و ئاکامی توێژینەوە و لێکدانەوەکانیان لە خزمەت پلاندارێژان و سیاسەتمەداران و سەرپەرشتیارانی کاروبارەکان بنێن کە بە شارەزابوونی تەواو لەم بابەتانە، بەرنامە کۆمەڵایەتی ـ ئابووری و دیمۆگرافییەکان کۆنترۆڵ و شی بکەنەوە.

توێژینەوەکانی کۆمەڵناسانە پەیوەندییان بە بابەتەکانی دیمۆگرافییەوە هەیە و ناتوانرێ بابەتە دیمۆگرافییەکانیش بەبێ بایەخدان بە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و سیستەمی بەهاکان، نۆرمەکان و بە شێوەیەکی گشتی کولتوور تاوتوێ بکەین.

**٦ـ یاسا**

کۆمەڵناسی و زانستی یاسا پێویستییەکی زۆریان بە هاوکاریی یەکتر هەیە. زانستی یاسا لێکۆڵینەوە لە ڕێکخستنی یاساکانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی لە بواری پەیوەندییە مەدەنی، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەکا و ماف و ئەرکی کۆمەڵایەتی تاکەکان لە پەیوەندیی لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ حکومەتدا، یانی یاساکانی زاڵ بەسەر پەیوەندییە ستوونی و ئاسۆییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگە ڕێك دەخا و، ئەم کارە پێویستی بە ئاگایی و ناسینی بارودۆخ و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی هەیە. چونکە یاسا مەدەنییەکان دەبێ گونجانیان لەگەڵ پێداویستی و دابونەریت و یاسا و ڕێساکانی کولتووری کۆمەڵگە هەبێ و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوانەوە ڕێك بخرێن و دابڕێژرێن.

لە کۆمەڵگەکاندا زۆر لە یاساکان پێش ئەوەی کە شێوەیەکی نووسراو و تۆمارکراو (لایەنی فەرمی) بەخۆوە بگرن، لایەنی عورفییان هەیە و کۆمەڵگە مرۆییەکان لەژێر کاریگەریی توندی ئەم یاسایانە واتە عورف و عادەت و نەریتەکاندان کە ئارام ئارام و بە تێپەڕینی کات و بە هۆی دووپاتبوونەوە، شێوەی نۆرمێکی کۆمەڵایەتی بەخۆوە دەگرن.

توێژینەوەکانی مرۆڤناسانە، جیاوازیی نێوان یاسا فەرمییەکان و عورف و عادەت واتە ئەو شتانەی کە کۆمەڵگە لەژێر کاریگەرییان دایە و پەیڕەوییان لێدەکا، ڕوون دەکاتەوە و ئەوە دەردەخا کە چۆن بەشێك لە بەها نوێیەکان لەگەڵ بەها کۆنەکان دەکەونە دژایەتی کردنەوە و بە خستنەڕووی هۆکارەکانی ئەم جیاوازی و دژبەیەکیانە و ناسینی مەسەلەکانی سەرچاوەگرتوو

دەتوانێ بوارێکی کۆمەڵایەتی لەبار بۆ گۆڕانکارییەکانی داهاتوو و قبوولکردنی نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکان و یاسا ڕەسمییەکان پێك بێنێ.

**٧ـ ئامار**

ئامار وەك زانستێك کە کۆمەڵناسی لە ئەنجامدانی توێژینەوەکانیدا سوودێکی زۆر لە میتۆدەکانی وەردەگرێ، گرینگی و بایەخێکی زۆری هەیە و لەڕاستیدا دەکرێ ئامار بە عەسای دەستی کۆمەڵناسی و زانستەکانی دیکە دابنرێ.

ئەمڕۆکە بە کەڵك وەرگرتن لە میتۆدەکانی ئامار، کۆمەڵناسان لە توێژینەوەکانیاندا لە هەوڵی گۆڕینی گۆڕاوە چۆنایەتییەکان بۆ چەندایەتییەکان دان و لە ماتماتیکیش لە لێکدانەوە و شیکردنەوەکانیاندا بەهرە وەردەگرن.

**٨ـ زمانناسی**

زمان بریتییە لە کۆمەڵەیەکی پێکەوەبەستراو و پێکهاتوو لە نیشانە و هێما دەنگییەکان کە بۆ دەربڕینی واتا و گواستنەوەی بیروڕاکان و سەرەنجام پەیوەندی بەستنی نێوان مرۆڤەکان بەکار دێت.

زمان بە شێوازگەلی جۆراوجۆر دەتوانێ یاریدەی ناسینی کۆمەڵگە و کولتوور بدات. زمان هاوکاری ناسینی ژینگە سروشتی و کولتوورییەکان دەکات. بۆ وشەی بەفر لە زمانی فارسی، فەڕەنسی و ئینگلیزی وشەیەك زۆر باوە و کەڵکی لێ وەردەگیرێ، بەڵام لە زمانی ئیسکیمۆکاندا سێ وشە بەکار دێن، بەفرێك کە لە حاڵی کەوتنە خوارەوە لە ئاسمانە، بەفرێك کە لەسەر زەوی کەوتووە و بەفرێك کە بە هۆی سەرماوە وەك سەهۆڵی لێ هاتووە.(٤) لە زمانی فارسیدا بۆ سەگ وشەیەك هەیە. کە بە وشەگەلی زیادی جۆرەکانی سەگ دیاری دەکات وەك سەگی بەرمەڕی یان سەگی ڕاو. لەنێو ئینگلیزی زمانەکاندا بە هۆی ئەوەکە سەگ لە زۆربەی ماڵەکاندا بوونی هەیە و جاری وایە ئەندامێکی بنەماڵەیە، ناوی جۆراوجۆری لێ نراوە. زمانی دوو گرووپی کۆمەڵایەتی جیا لەیەکتر تا ڕادەیەك دەرخەری پەیوەندی نێوانیانە. بوونی وشە و زاراوەی عەرەبی لە زمانی فارسیدا دەربڕی پەیوەندیی کولتووری نێوان فارس و عەرەبەکانە و بەکاربردنی وشەگەلێکی وەك پارکینگ، پارك کردن، مێرسی و ... پەیوەندیی نێوان فارس و بیانییەکان دەردەخا و ئەم پەیوەندییە هەرچی زیاتر بێ، وشە و زاراوەی زیاتر لە

گرووپە بێگانەکان دێنە ناو زمانی ئەو نەتەوەوە. بۆ نموونە لـە لێوارەکـانی کەنـداوی فـارس و دەریای عومان وشەی ئینگلیزی زیاتر بەکار دەبردرێن بەڵام لە بەشی باکووری ئێران بـە هـۆی هاوسنووری لەگەڵ ڕووسیا وشەی ڕووسی زیاتر لە ئاخاوتنەکانیاندا کەڵکی لێوەردەگیرێ.

زمان ئامرازی تێگەیشتن و تێگەیاندن و گواستنەوەی کولتوور لە وەچەیەك بـۆ وەچـەیەکی دیکەیە. بۆ ناسینی کولتووری کۆمەڵگەیـەك، زانیـاری و ناسـینی زمـانی ئـەو کۆمەڵگەیـە پێویستە. زمان دامەزراوەیـەکی کۆمەڵایەتییـە و نـە تـەنیا لـەنێوان خـەڵکی کۆمەڵگەیـەك پەیوەندیی چەند لایەنە پێك دێنێ، لـەناو گرووپـە جیاوازەکانیشـدا دەبێتـە هـۆی دامـەزرانی پەیوەندی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی و کولتووری. کەواتە بابەتی زانستێکی کۆمەڵایەتی بە ناوی "زمانناسـی"(Linguistique)یـە کـە پەیوەندییـەکی نزیکـی لەگـەڵ کۆمەڵناسـی و ئەنترۆپۆلۆژیادا هەیە و لە ڕێگەی دیراسەکردن و ناسینی پێکهاتەی وشەکان و ڕێسا و ڕێزمان، شیکردنەوەی دەنگەکان، یارمەتی زانستی کۆمەڵناسی دەکا کە گرینگی زۆر بە دامـەزراوەی کۆمەڵایەتی دەدات.

## ٩- دەروونناسی

دەروونناسـی توێژینـەوەی زانسـتی لەسـەر چـالاکیە دەروونییـەکانی تـاك و فاکتـەرە سەرەکییەکانی پێکهێنەری وەك هۆش، یادگە، تێگەیشتن و ... دەکا بە واتایەکی دیکە بابەتی دەروونناسـی، توێژینـەوەی حاڵەتـە دەروونـی و ڕەفتارییـەکانی مرۆیـی یـە. لەحاڵێکـدا کـە کۆمەڵناسی تاوتوێی گرووپ و کۆمەڵە مرۆییەکان دەکات. بەڵام ناتوانرێ لە دەرەوەی ژینگەی سروشتی و کۆمەڵایەتی، چالاکییە دەروونییەکان و ڕەفتاری ئینسان وێنا بکەین، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییـە و کاریگـەریی ژیـانی گرووپـی لەسـەر حاڵەتـە دەروونییـەکان و هەڵسوکەوتەکانی ئـەو و هـەروەها کاریگـەریی ڕەفتـاری ئـەو لەسـەر کەسـانی دیکـە و لـە کۆمەڵگەدا شتێکی حاشا لێنەکراوە. بەم پێیە کۆمەڵناسی و دەروونناسی لە توێژینەوەکانیاندا پێویستیان بە هاوکاری و یاریدەدانی یەکتر هەیە. کاتێك کە کۆمەڵناسی دیراسەی پاڵنەرەکان، حەز و ویستەکان، بەها کۆمەڵایەتییـەکان و ئـاوات و پێداویسـتییەکانی گرووپـە مرۆییـەکان دەکات، پێدەنێتە سنووری دەروونناسی و کاتێك کە دەروونناسی ڕەفتاری تاك تاوتوێ دەکات، ناتوانێ کاریگەریی فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان لەحاڵەتە دەروونییەکان و ڕەفتاری تاکدا نـەبینێ و بە ناچار پێدەنێتە سنووری کۆمەڵناسی. کەواتە دەتوانین بڵێین ئەم دوو زانستە لە زۆر بابەتدا

بواری هاوبەشیان هەیە. جۆرج گۆرڤیچ بە نیشاندانی ئەم دوو زانستە وەك دوو جەغزی یەکتربڕ کە بەشێك لە هێڵەکانیان هاوبەشن، بە جوانی ئەوە دەردەخا کە کۆمەڵناسی و دەروونناسی لە چ بوارگەلێکدا هاوبەشن. ئەمڕۆکە بە گەشەسەندنی ئەم دوو زانستە، سنوور و چوارچێوەکەشیان پەرەی سەندووە و زانستێکی نوێ بە ناوی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی هاتۆتە ئاراوە.

## ١٠- دەروونزانیی کۆمەڵایەتی

دەروونزانیی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەم لەگەڵ دەروونزانی و هەم لەگەڵ کۆمەڵناسییدا هەیە. ئەم لقە کاریگەریی دوولایەنەی تاك لەگەڵ گرووپ یان کۆمەڵگە لێك دەداتەوە. بە واتایەکی دیکە، دەروونزانیی کۆمەڵایەتی تاوتوێ و دیراسەی کاریگەریی تاك لەسەر گرووپ یان کۆمەڵگە و بەپێچەوانەوە کاریگەریی کۆمەڵگە یان گرووپ لەسەر تاکەکەس دەکا.

بابەتگەلێکی وەك کێبرکێ لە گرووپدا، ناکۆکی، هاوکاری، وەپێشکەوتن، سەرکردایەتی و بە شێوەیەکی گشتی کردەوە دوولایەنە گرووپییەکان لە گرینگترینی ئەو بابەتانەن کە لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکرێ. بەم پێیە دەتوانرێ سنووری توێژینەوە لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا لەم بوارانەی خوارەوەدا کورت بکرێتەوە:

١ـ کاریگەریی کۆمەڵگە لەسەر تاك لە ڕێگەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە

٢ـ کاریگەریی تاك لەسەر کۆمەڵگە لە ڕێگەی دیاردەگەلێکی وەك سەرکردایەتی

٣ـ پەیوەندیی نێوان تاکەکان و کردە دوولایەنەییەکان لە دیاردەگەلێکی وەك ناکۆکی، کێبرکێ، گونجان و ...

هەندێکجاریش لە بابەت هەندێك لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، سنووری دیاریکراو لە نێوان دەرونزانیی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵناسی بەرچاو ناکەوێ. بەڵام بە کورتی دەبێ بڵێین کە لە پەیوەندیی لەگەڵ گرووپی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵناسی بە شێوەیەکی بنەڕەتی و تایبەتی گرینگی بە ڕەفتاری گرووپ دەدا و دەروونزانیی کۆمەڵایەتیش هۆگریی بە کردەوە و ڕەفتاری تاك لە حاڵەتی گرووپیدا نیشان دەدا. پێش ئێستا توێژینەوە دەربارەی کردەوەکانی تاکیان بۆ دەرونزانی و، هی کۆمەڵگەیان بۆ کۆمەڵناسی و کولتوورییان بۆ ئەنترۆپۆلۆژیا دەگەڕاندەوە. بەڵام ئێستاکە وردەوردە جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکرێتەوە کە تێکەڵاویی تاك و گرووپ و

کولتوور و کاریگەریی دوولایەنەیان لەسەر یەکتر بە شێوەیەکی هەمیشەیی و بەردەوامە کە توێژەرێك کە نیازی توێژینەوەی یەکێکیانی هەبێ، بەبێ گەڕانەوە بۆ دوو بابەتەکەی دیکە ناتوانێ توێژینەوەیەکی تەواو ئەنجام بدات.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ بگوترێ کە دیاردەی کۆمەڵایەتی کردەیەکی گشتییە کە هەریەك لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە بەرامبەریدا جێگەیەکی تایبەتیان هەیە. کۆمەڵناس، یاساناس، خەڵکناس، مێژوونووس، دەروونزانی کۆمەڵایەتی، حەشیمەتناس هەریەکێکیان لە ڕوانگەیەکی تایبەتەوە لە دیاردەی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە. هەڵەیە ئەگەر پێمان وابێ دەتوانین بە یەکێك لەم زانستانە توێژینەوە لەسەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بکەین. هەریەك لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە تەنیا توانای ڕوونکردنەوەی تەواوی لایەنەکانی دیاردەی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکوو هەر یەکێکیان لە سنووری توێژینەوەی خۆی دەتوانێ بەشێك لە کردەیەکی کۆمەڵایەتی بخاتە بەر لێکدانەوە، بەڵام دیاردەی کۆمەڵایەتی وەها ئاڵۆزە کە ئەگەر بمانهەوێ لایەنێکی بە شێوەی جیاواز و بەبێ لەبەرچاوگرتنی لایەنەکانی دیکە بخەینە بەرباس، کارێکی نەگونجاو و دژوارە، بەم پێیە بۆ ناسین و ڕوونکردنەوەی هەموو لایەنەکانی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، هاوکاریی زۆر لە زانستەکۆمەڵایەتییەکان پێویستە و بۆ توێژینەوە لەسەر کۆمەڵگەیەك دەبێ گرووپێکی پێکهاتوو لە پسپۆرانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەشدار بن و هاوکاریی یەکتر بکەن.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی سێیەم

١ـ رجوع کنید به ژرژ گورویچ (G. Gurvich)، طـرح مسائل جامعه‌شناسی امروز، ترجمه عبدالحسین نیك گهر، دانگشاه مشهد .١٣٤٧

٢ـ علی اکبر نیك خلق، مقدمه‌ای بر جامعه‌شناسی روستایی ایران، پژوهشکده علوم ارتبـاطـي و توسـعه ایران ١٣٥٨ ص .١١

٣ـ همان ماخذ ص .٢٣

٤ـ مهدی تزیا، مقدمات انسان شناسی، دانشکده علوم اجتماعی ص٨.

# بەشی چوارەم

## کۆمەڵگەی مرۆیی

### ١- پێناسەکان

زاراوەی کۆمەڵگە لە کۆمەڵناسیدا بە واتای ڕەوش و حاڵەتی ئەو مرۆڤانەیە کە لەژێر یاسایەکی هاوبەشدا ژیان بەسەر دەبەن. بۆسۆئە(Bossuet) دەڵێت:" لەڕاستیدا هەر یەك لە ئێمە بۆ ئەویتر دروست بووە."

خێزان، کۆمەڵگەیەکی سروشتی پێك دێنێ. گرووپێك لە خەڵکیش کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەت لە دەوری یەکتر کۆ بوونەتەوە، بە کۆمەڵگەیەك لەقەڵەم دەدرێ، وەك کۆمەڵگەی ئەدەبی و ... لۆکریس(Lucrece) دەڵێ: "کۆمەڵگە، داهێنانێکی مرۆیی یە." هۆبز (Hobbes)پێی وایە کە کۆمەڵگە ئاکامی گرێبەستێکە کە بە هۆی شەڕێکی هەمیشەییەوە پێك هاتووە و بەم شێوەیە لە ڕوانگەی ئەوەوە دیاردەیەکی سروشتییە.(١)

کۆمەڵگە لە زمانی فەڕەنسیدا (Societe) و لە زمانی ئینگلیزیدا (Society) کە هەردووکیان لە زاراوەی (Socieum) لاتینی وەرگیراون بە واتای دۆست، هەواڵ، هاوڕێ و هاوپەیمانە. کۆمەڵگە زیاتر بە گرووپێك لە خەڵك دەگوترێ کە بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییە ماددی و نامادیییەکانی خۆیان کۆ دەبنەوە و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لە نێوانیاندا دادەمەزرێت. مورتەزا موتەهەری دەڵێ:" کۆمەڵگە کۆمەڵەیەك لە مرۆڤەکانە کە لەبەر پێویست بوونی زنجیرەیەك پێداویستی و لەژێر کاریگەریی زنجیرەیەك بیروڕا و ئامانج لەگەڵ یەکتردا تێکەڵاو بوون و لە ژیانێکی هاوبەشدا دەژین."(٢) بابەتی هەبوونی هاوکاریی

نێوان ئەندامانی کۆمەڵگە لەو تایبەتمەندییانەیە کە زۆر لە بیرمەندان گرینگییان پێداوە. ئێدوارد ویستێر مارك (Edward Westermarck)مرۆڤناسی بەریتانی، کۆمەڵگە بە گرووپێك لە خەڵك دەزانێ کە بە هاوکاریی یەکتر ژیان بەسەر دەبەن. کۆمەڵگە دەبێ لەو کەسانە پێك بێ کە هاوکاریی یەکتر دەکەن و هەر ئەم هاوکارییەیە کە ئەوان وەك بەشەکانی پێکهاتەیەك لێك گرێ دەدات. ئەگەر هیچ کۆمەڵگەیەك نەتوانێ بەبێ کەسانێك کە ئەندامی بن، بوونی هەبێ، هیچ تاکێکیش ناتوانێ بەبێ کۆمەڵگەیەك بوونی هەبێ چونکە کۆمەڵگە کەسایەتی ئینسان دەخولقێنێ.(٣)

هەندێك لە کۆمەڵناسان لە پێناسەی کۆمەڵگەدا گرینگییان بە بابەتی هاوبەشێتی داوە و پێیان وایە کە کۆمەڵگە گرووپێك لە خەڵکە کە بە هاوبەشی دەژین و هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتر پێداویستییەکانی ژیانیان دابین بکەن و بەردەوامی بە وەچەکان ببەخشن. تاقمێك لە کۆمەڵناسان لەسەر ئەم بۆچوونەن کە کۆمەڵگە لە پەیوەندی و تێکەڵاویی گرووپە جۆراوجۆرەکان پێك هاتووە و بەم شێوەیە پێناسەی دەکەن: " کۆمەڵگە گرووپێکی بەربڵاو و بەردەوامە کە لە ژن و پیاو و منداڵ کە خاوەن ژیانی هاوبەشن پێك هاتووە و بۆ مانەوە و بەردەوامبوونی خۆیان هاوکاریی یەکتر دەکەن و ڕێکخراوگەلی جۆراوجۆر پێك دێنن.(٤)

هەبوونی پەیوەندییە مرۆییەکان لە کۆمەڵگەدا لە لایەن گرووپێکی زۆر لەکۆمەڵناسان جەختی لەسەر کراوەتەوە. لەڕاستیدا ئەو پەیوەندییانە، هۆکاری یەکگرتوویی و مانەوە و بەردەوامبوونی کۆمەڵگەن. ئۆگست کۆنت پێی وایە کە: " کۆمەڵگە لە گشت کەسانی زیندوو و هەروەها کەسانێك کە دنیایان جێهێشتووە، بەڵام بە کاریگەریی خۆیان لەسەر زەینی وەچەکانی داهاتوو درێژە بە ژیانی خۆیان دەدەن، پێك هاتووە." ناوبراو دەڵێ: کۆمەڵگەی مرۆیی بە ئاوەزمەندیی ئەندامەکانی جیاوازە، پەیوەندی و بەستراوەیی لە کۆمەڵگەی مرۆییدا تەنیا تاکەکانی سەردەمی هاوچەرخ بەیەکەوە نابەستێتەوە بەڵکوو پەیوەندی ڕابردووەکان و داهاتووەکان بە شێوەیەکە کە دەتوانرێ بگوترێ مردووەکان لە پێشەوە حکومەت بەسەر زیندووەکاندا دەکەن. ژیانی ئینسان لەژێر کاریگەریی میراتە کولتووری و ئەخلاقییەکانی ڕابردووەکان دایە و کۆمەڵگەی مرۆیی زیاتر مردووەکان لەخۆ دەگرێ هەتا زیندووەکان. بە بۆچوونی ناوبراو کۆمەڵگەی بە شێوەی کاروانێکی پێکهاتوو لە وەچەکانی ڕابردوو و ئێستایە کە بەرەو پێشوەچوون و کامڵبوون هەنگاو دەنێت.

له ڕوانگەی هەندێك لە كۆمەڵناسان، كۆمەڵگە كۆی ئەو پەیوەندییە مرۆییانەیە كە لە نێوان تاكەكاندا دادەمەزرێ، ئەم پەیوەندییانە دەتوانین بەسەر سێ جۆردا دابەش بكەین:

**پەیوەندییە دوولایەنە تاكەكەسییە سادەكان:** ئەم جۆرە پەیوەندییە بە شێوەی بڵاو و نارێكوپێك لەنێوان تاكەكاندا دروست دەبێ و لە پێكهاتنیدا مەبەست و ئامانجێكی تایبەتی ناخرێتەڕوو. ئەم جۆرە پەیوەندییە بە هۆی پاڵنەرە سۆزدارییەكان و هەندێكجار لەژێر كاریگەریی جۆرێك بەستراوەیی دوولایەنە و بە شێوەی گشتی لەسەر بنەمای ڕەوشی تایبەتی سروشتی مرۆیی شكڵ دەگرێ. سەردان و چاوپێكەوتنەكان، شەونشینییەكان، دیداری دۆستانە، یان ئەو هاتوچۆیانەی كە لە كاتەكانی ڕوودانی پێشهاتە خۆش و ناخۆشەكانی ژیان وەك لەدایكبوون، هاوسەرگیری، نەخۆشی، مردن و ... لەنێوان تاكەكان دێنە ئاراوە، لەم جۆرە پەیوەندییە دێنە ئەژمار. كاتێك كەسێك نەخۆش دەكەوێ، دراوسێ یان دۆستێكی سەردانی دەكا و لە حاڵ و ئەحواڵی دەپرسێ و بۆی نیگەران دەبێ و لە كاتی پێویستدا هاوكاریشی دەكا.

**پەیوەندییە دوولایەنە تاكەكەسییە جێگیرەكان:** ئەم جۆرە پەیوەندییە وەك پەیوەندیی جۆری یەكەم لەنێوان تاكێك لەگەڵ تاكێكی دیكەدا دادەمەزرێ، بەڵام چلۆنایەتییەكەیان لە باری كۆمەڵناسییەوە جیاوازی هەیە. لێرەدا پەیوەندییەكە لە حوكمی ئەركی تاكەكەسی و جۆرە خزمەتێكدا دێتە ئەژمار. تاك بۆ ئەنجامدانی كارێكی دیاریكراو كە پسپۆریی تێدا هەیە، ناوەندێكی پەیوەندیكردن لەگەڵ كەسانی دیكە دروست دەكا. وەها پەیوەندییەك زیاتر لە مامەڵە و ئاڵوگۆڕ و خزمەتگوزارییەكاندا دێتە كایەوە. پەیوەندیگەلێك كە بە مەبەستی خزمەتگوزاری پەروەردەیی، تەندروستی و كاروباری هاوشێوە ساز دەبێ و هەروەها پەیوەندییەك كە بۆ نموونە لەگەڵ بەرگدرویەك، قەسابێك، دوكاندارێك، سەرتاشێك، نانەوایەك و ... دادمەزرێ لەم جۆرەیە. ئەم چەشنە پەیوەندییانە هەرچەند پێویستی بە جێگرتن لە شوێنێكی تایبەت هەیە و یان لە ڕێگەی تەلەیفوون دروست دەبێ بەڵام جاری وایە لەلایەن گرووپی گەڕۆك وەك ، لێفەدروو، وەستا و بەزاز و وردەواڵەفرۆشەكان یان گرووپی گەڕۆكی تەندروستی دادەمەزرێ.

**پەیوەندیی بەكۆمەڵ:** جاری وایە خزمەتگوزاریی جۆراوجۆر لە شوێنێكی دیاریكراودا كۆ دەبێتەوە و پەیوەندییەكی بەكۆمەڵ دێنێتە كایەوە. پەیوەندیی بەكۆمەڵ لەگەڵ دوو جۆرە پەیوەندیی تاكەكەسیی سادە و تاكەكەسیی جێگیر كۆمەڵەیەك دروست دەكەن كە دەبێتە هۆی

پەیدابوونی پێداویستییە تایبەتەکانی مرۆڤەکان و یەکگرتووییەك بە کۆمەڵگە دەبەخشێ. بۆ نموونە پێویستی بە ئاسایش، بەرگریی کۆمەڵایەتی، پێویستی بە هاتووچۆ و سەفەرکردن، بەڕێوەبەرایەتی ڕێگەوبان، پێویستی بە ئەنجامدانی ڕێوڕەسمە ئایینییەکان، مزگەوت و خانەقا و پێویستی بە پەیوەندییەکان، خزمەتگوزارییەکانی پۆست لەم جۆرە لەقەڵەم دەدرێن. لێرەدا گرووپێکی ئاگادار بە هەبوونی خۆی کە خاوەن ئامانجگەلێکی دیارە، دەردەکەوێ. (٥)

## ٢- ماهییەتی کۆمەڵگە

دەربارەی ماهییەتی کۆمەڵگە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ گەلێك جیاوازی بیروبۆچوون لە ئارادا بووە و لە کۆمەڵناسیشدا باسی لەسەر کراوە. لە ڕوانگەی ئەرەستۆوە، کۆمەڵگە وەك بوونەوەرێکی زیندوو وایە کە یاسای لەدایکبوون و گەشە و مەرگی بەسەردا زاڵە. ئەم بۆچوونە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ زەینی زۆر لە بیرمەندانی بەخۆیەوە خەریك کردبوو و لەم بوارەدا باس و گفتوگۆیان کردووە.

پەیڕەوانی ڕێبازی ئۆرگانیسیزم(Organicisme) کۆمەڵگە بە ئۆرگانیزمێکی گەورە دەشوبهێنن. بۆ نموونە دەڵێن کۆمەڵ لە تاکەکان دروست دەبێ، بە هەمان شێوە کە جەستە لە خانەکان دروست دەبێ. هەندێك کەس پەرەیان بەم بۆچوونە داوە و هەوڵیان داوە کە لەنێوان دۆخی چینایەتی و ڕایەڵە پەیوەندییەکانی کۆمەڵگە، وەك تێلی تەلەفۆن لە جەستەدا، هاوتاگەلێك بدۆزنەوە. بۆ نموونە مرۆڤ سەری هەیە، هەوڵی ئەوان ئەوەیە کە لە کۆمەڵگەشدا سەر دیاری بکەن. کەوایە لە کۆمەڵگەدا لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی، دەستەی سەرکردایەتی یان سەرۆکی لە جێگە دادەنێن و بە کورتی هەرچی لە مرۆڤدا دەیانبینی، لە کۆمەڵگەشدا بەدوای هاوشێوەکەیدا دەگەڕان. ئەوانە لە ڕێگەی لێکچواندن و بەراوردکردن ئەم کارەیان ئەنجام دەدا. لە کاتێکدا کە دەزانین هیچ کات مرۆڤ ناتوانێ وەکوو کۆمەڵگە بێ و کۆمەڵگەش ناتوانێ وەکوو مرۆڤ بێ.

پەیڕەوانی ڕێبازی ڕەسەنایەتی تاك دەڵێن کۆمەڵگە کۆمەڵێك لە تاکەکانە و بۆ تێگەیشتنی تایبەتمەندییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، ناسینی تایبەتمەندییە دەروونی و ڕەفتارییەکانی تاکەکانی پێکهێنەری ئەو کۆمەڵگەیە تەواوە. ئەوانە لەم کارە بێئاگان کە چ لە سروشت و چ لە کۆمەڵگەدا کۆ(گشت) خاوەنی هەندێك تایبەتمەندی دیاریکراوە کە جیاوازە لە تایبەتمەندییەکانی بەشە پێکهێنەرەکانی ئەو (کۆ) گشتە. بۆ نموونە دەتوانرێ بگوترێ کە لە

دلۆپە ئاوێك كە بەشێك لە ئۆقیانووسە، ناتوانین بەلەم و كەشتی لێ بخورین و هەروەها گیاندارە گەورەكان ناتوانن ژیانی تێدا بكەن. ئینسان لە كۆمەڵێك لە خانەكان دروست بووە بەڵام تایبەتمەندییەكی هەیە كە خانەكان نییانە. بۆ نموونە تایبەتمەندیی بیركردنەوە، قسەكردن و ... هەڵەی لایەنگرانی تیۆرییەكەی سەرەوە ئەوەیە كە ئەوان گرینگی بە پرۆسەیەك كە دەبێتە هۆی پەیدابوونی تایبەتمەندییە نوێیەكان، نادەن. شتەكان لە توخمگەلێك پێك دێن بەڵام هەندێك تایبەتمەندی نوێیان هەیە كە لەگەڵ تایبەتمەندییەكانی توخمە پێكهێنەرەكانیان جیاوازی هەیە. كۆمەڵگە دەرخەری حەزە تاكەكەسییەكان نییە، بەڵكوو یاساگەلی تایبەت بە خۆی هەیە كە لەگەڵ یاسا فیزیۆلۆژییەكان جیاوازە. ناتوانرێ كۆمەڵگەی مرۆیی تەنیا وەك كۆمەڵەیەك لە تاكەكان لەبەرچاو بگرین یان بە ئۆرگانیزمێكی گەورەی لەقەڵەم بدەین یان بە هاوشێوەی كۆمەڵێكی ئاژەڵی وێنا بكرێ. لە كۆمەڵگەی مرۆییدا دیاردەی كۆمەڵایەتی بابەتی توێژینەوە و خوێندنەوەی كۆمەڵناسییە.

عەللامە تەباتەبایی دەڵێ: دەزگای خولقاندن سەرەتا زنجیرەیەك لە بەشە سەرەتاییەكان كە خاوەنی بەرهەم و تایبەتمەندیی تایبەتییە، دەخولقێنێ، دوایی تێكەڵاویان دەكا و بە تایبەتمەندییەكانیانەوە ئاوێتەی یەكتریان دەكا و سوودی نوێ بێجگە لەو سوودانەی كە هەر یەكێك لە بەشەكان هەیانبوو، دێنێتە كایەوە. كۆمەڵگە واقعییەتێكە كە لە باری ماهییەتەوە جیاوازیی لەگەڵ واقعییەتە تاكەكەسییەكان هەیە. ئەگەر بڵێین تاكەكان تەنیا فاكتەرەكانی دروستكەر و پێكهێنەری كۆمەلگەن و بۆ ناسینی كۆمەڵگە ناسینی تاكەكانی تەواوە و لە ئاكامدا دەگوترێ كە ئاخێزگەی سەرەتایی هێما كۆمەڵناسییەكان شتێكی جیا لە نیشانە و نما دەروونناسییەكان ناتوانێ ببێ. بەم بەڵگەهێنانەوەیە بە ئاسانی دەتوانرێ بگوترێ كە نیشانە و نما حەیاتییەكانیش بە هێما و نیشانە بێگیانەكان ڕوون دەكرێنەوە. چونكە لە خانەی زیندوودا شتێك بێجگە لە مولكولگەلێك لە ماددەی كاڵ بوونی نییە. بەڵام ئەم مولكولە كاڵانە لە ناوەوەی خانەی زیندوودا تێكەڵاوی یەكتر بوون و هەر ئەم تێكەڵبوونە هۆكاری نیشانەگەلێكی نوێیە كە دیاریكەری ژیانن كە تەنانەت تۆوێك لە هیچكام لە لە توخمە پێكهێنەرەكانیدا ناتوانرێ بدۆزرێتەوە. هۆكار ئەمەیە كە كۆ (گشت) بەرهەمی كۆبوونەوەی بەشە پێكهێنەرەكانی نییە.(٦)

كۆمەڵگە بەرهەمی كۆمەڵێكی سادەی تاكەكان نییە، بەڵكوو شتێكە كە تایبەتمەندییەكانی لەگەڵ تایبەتمەندییەكانی بەشە پێكهێنەرەكانی جیاوازی هەیە. كۆمەڵگە لە

تێکەڵاوبوونی تاکەکان پێك دێ و ناسێنەری ڕاستییەکی تایبەت و خاوەن تایبەتمەندیی تایبەت بەخۆیەتی. دیارە ئەگەر ویژدانە تاکەکەسییەکان نەبن هیچ شتێکی بەکۆمەڵ دروست نابێ. بەڵام ئەم مەرجە پێویستە، مەرجی تەواو نییە. دەبێ ویژدانە تاکەکەسییەکان تێکەڵی یەکتر بن و بە شێوەیەکی تایبەتی ئاوێتەی یەکتر بن. ژیانی کۆمەڵایەتی لەو پێکهاتە و تێکەڵاوبوونە دێتە کایەوە و بەم پێیە هەر ئەم ئاوێتە بوونە نیشاندەری ئەوەیە کە هزر، هەست و کرداری کۆمەڵگە لەگەڵ هزر و هەست و کرداری تاکە پێکهێنەرەکانی لە حاڵەتی جوودابووندا لێك جیاوازە. کۆمەڵگە کۆمەڵێك لە بەشەکان نییە، بەڵکوو گشتێگە کە هەرچەند لە کۆمەڵێك لە تاکەکان پێك هاتووە بەڵام خاوەنی تایبەتمەندیی تایبەت بەخۆیەتی و زنجیرەیەك تایبەتمەندیی کۆمەڵایەتی بەهێز دێنە کایەوە کە لە کاتەکانی دژایەتی و دژبەیەکی نێوان تاك و کۆمەڵگەدا بەسەر هێزی تاکدا زاڵە.(٧)

دۆرکایم کۆمەڵناسی فەڕەنسی پێی وایە کە تاك خاوەنی دوو جۆر ویژدانە، یەکێکیان ویژدانی ئەخلاقی و ئەوەی دیکە ویژدانی دەروونناسی. بە هەمان شێوە کە تاکەکان لە باری دەروونناسییەوە خاوەنی ویژدانن کۆمەڵگەش ویژدانی هەیە. ناوبراو گرینگییەگی زۆر بە ویژدان دەدا و دەڵێ لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا ویژدانی بایەخی زیاتری هەیە، بەڵام لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکان گرینگیی ویژدان دادەبەزێ و بۆچوون و بیروڕای تاکەکەس بایەخ پەیدا دەکات.

لەوانەیە بتوانرێ بگوترێ کە ویژدانی کۆمەڵگە لێرەدا ئەو شتەیە کە ئیبن خەلدوون بە ناوی " دەمارگیری " باسی دەکا کە لە کۆمەڵگە سادە عەشیرەتییەکاندا توندتر و بەهێزترە بەڵام لە کۆمەڵگەی شارنشیندا لاواز دەبێ و ئارام ئارام لەناو دەچێ و لەوانەشە دیاردەی " دەمارگیری " سەرچاوەگرتوو لە کۆویژدان بێ.

مورتەزا موتەهەری لە چوار تەوەردا ڕەخنە و هەڵسەنگاندن بۆ تیۆرییە جۆراوجۆرەکانی بیرمەندان و کۆمەڵناسان سەبارەت بە ماهییەتی کۆمەڵگە دەکات:

١ـ تیۆری یەکەم پەیوەندی بە لایەنگرانی ڕەسەنایەتی تاك بە واتای تەواوی هەیە و دەڵێ: " کۆمەڵگە بوونێکی ڕاستەقینەی نییە، ئەوەی کە "بابەتێت"ی هەیە تاکە و بۆ ناسینی کۆمەڵگە ناسینی تاکەکان بەسە".

٢ـ تیۆری دووەم: لایەنگرانی ئەم تیۆرەش بڕوایان بە ڕەسەنایەتی تاك هەیە و دەڵێن: کۆمەڵگە لە ڕێکخراو و دامەزراوەگەلی سەرەکی و لاوەکی پێك هاتووە. ئەم دامەزراوە و تاکەکانی سەر بەوان هەموویان بەستراوەی یەکترن. گۆڕان لە هەر دامەزراوەیەکدا دەبێتە هۆی

گۆڕان لە دامەزراوەکانی دیکەدا و ژیانی کۆمەڵایەتی وەك "گشتێك" ماشێنی کۆمەڵگە بەدی دێنێ و تاکەکان وەك بەشەکانی پێکهێنەری ئەو ماشینە دێنە ئەژمار کە چارەنووسی هاوبەشیان هەیە و کۆمەڵگە واتە ئەم کۆمەڵەیەی کە لە بەشە پێکەوە بەستراوەکان پێك هاتووە، لە ڕوانگەی پەیوەندیی تایبەتی هۆ و بەرهۆیی میکانێکی کە لە نێوان تاکەکاندا هەیە، پێناسەیەکی جیاواز لە پێناسەی هەر کام لە بەشەکانی هەیە.

٣ـ بە پێی تیۆری سێیەم هەم کۆمەڵگە ڕەسەنە و هەم تاك. تاکەکان لە کۆمەڵگەدا ناتوێنەوە بەڵام شوناسی نوێ لە کۆمەڵگەدا دروست دەکەن کە هەمان شوناسی کۆمەڵگەیە و لەگەڵ ئەوەی کە تاك بە تەنیایی و جیا لە کۆمەڵگە هەیەتی، جیاوازە. بە هۆی کاریگەرییە دوولایەنەکانی تاکەکان واقعییەتێکی نوێ دێتە ئاراوە کە خاوەنی نەست(شعور)، ویژدان و ئیرادە و ئەندێشەیەکی تایبەتە کە بەسەر شعوور و ویژدانی تاکەکاندا زاڵە.

٤ـ تیۆری چوارەم لەسەر بنەمای ڕەسەنایەتی کۆمەڵایەتی تەواوە. بە پێی ئەم تیۆرییە، هەرچی هەیە ڕوحی گشتی و ویژدانی گشتی، ئیرادە و ویستی گشتی و "من"ی گشتی یە. شعوور و ویژدانی تاکەکەسی هێمایەك لە شعوور و ویژدانی گشتییە. ئەمە لەڕاستیدا هەمان تیۆری کۆمەڵناسانێکی وەك ئەمیل دۆرکایم و پەیڕەوانییەتی. بە بۆچوونی موتەهەری، دۆرکایم لە ڕەسەنایەتی سرشتی مرۆیی کە سەرچاوەگرتوو لە کامڵبوونی زانی ئینسان لە ناخی سروشتە، تووشی بێئاگایی بووە. ئەم سرشتە جۆریك ئازادیی و دەرفەت و سەربەستی بە مرۆڤ دەبەخشێ کە بۆ ڕاوەستان لە بەرامبەر شتە داسەپێنراوە کۆمەڵایەتییەکان بەهێزی دەکەن. ناوبراو بۆ پشت ڕاست کردنەوەی تیۆریی سێیەم دەڵێ: ڕاستە کە کۆمەڵگە لە تاکەکان پێك هاتووە و خاوەنی ویژدان و ئیرادە و خواستی جیاواز لە تاکەکانە کە بەسەر تاکەکاندا پیادە دەکرێ، بەڵام سەربەخۆیی ڕێژەیی تاکەکانیش پارێزراوە. " تاکەکەمرۆییەکان واتە ڕۆحی تاکەکەسی، لە بەرامبەر کۆمەڵگە واتە ڕوحی گشتی مەجبوور و بێدەسەڵات نییە"(٨) بە دەستەواژەیەکی دیکە، لە پلەکانی خواروی سروشتدا، بەشەکان لە یەکتردا تێکەڵاو دەبن و بە تەواوەتی لەناو "گشت"دا دەتوێنەوە. بۆ نموونە ئۆکسیژن و هایدرۆژێن یان کولێروسدیۆم کە ئاو و خوێی خواردنە، هەر یەکێکیان گشتێگی سەربەخۆ لە بەشە پێکهێنەرەکانیانن، بەڵام بە هەمان ڕێژە کە تێکەڵاوبوونەکە لە ئاستێکی بەرزتردا جێبەجێ ببێ، بەشەکان لە

بەرامبەر گشت دا سەربەخۆییەکی ڕێژەیی پەیدا دەکەن. کۆمەڵگە بەرزترین بونـەوەری سروشتە و بەم پێیە سەربەخۆیی ڕێژەیی بەشە پێکهێنەرەکانی گەلێك زیاترە.

### ٣. ئاخێزگەی کۆمەڵگە

سەبارەت بە ئاخێزگەی کۆمەڵگەی مرۆیی و چۆنییەتی پێکهاتنی، گریمانەگەلی جۆراوجـۆر خراونەتـەڕوو و بـەم هۆیەشـەوە جیـاوازیی بۆچـوون لـەنێوان زانایـانی کۆمەڵایەتیـدا لەمـەڕ پەیدابوونی کۆمەڵگـە گـەلێك زۆرە. لـە بەرهەمـەکانی بیرمەنـدانی یۆنـان وەك ئـەفلاتوون و ئەرەستۆ بیروڕای کەم تا زۆر جیاواز لەمەڕ ژیانی کۆمەڵایەتی ئینسان دێنە بەرچاو. زاناکان لە بەرهەمەکانیاندا هەر یەك بە شێوەیەك قسەیان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ کردووە.

تۆماس هۆبز یـەکێك لـە بیرمەنـدە بەناوبانگـەکانی سـەدەی حەڤدەهـەم و هەژدەهـەمی بەریتانیا پێی وابوو کە مرۆڤ لە سەرەتادا بە شێوەی گۆشەگیر و تەریك کەوتوو ژیانی بەسـەر دەبرد و بەردەوام لەگەڵ هاوچەشنەکانی لە شەڕ و کێشەدا بووە. لە ژینگەیەکی پڕ لـە تـرس و خۆفدا دەژیا و هەمیشە لە لایەن کەسانی دیکەوە دەسدرێژی دەکرایە سـەر. بـەڵام بـە هێـزی عەقڵ و بیرکردنەوە تێگەییشت کە ئەگەر لەگەڵ کەسانی هاوچەشنی خۆی یەکگرتوویيەك پێك بێنێ، دەتوانێ لە ئاشتی و ئاسایشدا و لە ژینگەیەکی ئارام و دوور لە ترس و تۆقانـدن ژیـان بەسەر ببات و بەم شێوەیە کۆمەڵگەی ئارام و ڕێکوپێك بەدی هات.

جۆن لۆك فەیلەسووفی بەریتانی بە پێچەوانەی هـۆبز بـڕوای وایـە کـە ژیـانی ئینسـان لـە سەرەتادا پڕ لە ئارامی و ئاسایيش بوو، بەڵام مرۆڤ بۆ پێشکەوتن ناچار بوو بە جێگەی ئەوەی کە لە خێزانێکی گۆشەگیردا ژیان بکا، گرووپی گەورەتر پێك بێنێ.

جان جاك ڕۆسۆ فەیلەسووفی سەدەی هەژدەیەمی فەڕەنسا پێی وابوو کـە کۆمـەڵی مرۆیـی دەرەنجامی گرێبەستی کۆمەڵایەتییە واتە تاکەکان بە حەزی خۆیان لە دەوری یەکتر کۆبوونەوە و لـە ڕێگـەی گونجـان و پێکـەوە سـازانەوە لێـك نزیـك بوونـەوە و بـۆ پاراسـتنی قـازانج و بەرژەوەندییەکانیان دەستیان لە بەشێك لە بەرژەوەندییەکانیان هـەڵگرت. نـاوبراو پێـی وایـە ژیانی کۆمەڵایـەتی لەسـەر بنـەمای جـۆرە گرێبەسـتێك ڕاوەسـتاوە.(٩) ڕۆسـۆ بـڕوای وایـە شارسـتانییەت هۆکـاری زوڵـم و گەنـدەڵی نـاو کۆمەڵگـە و پەرەسـەندنی نایەکسـانی و هەڵاواردنەکانە. دەبێ لە ژینگەی سروشتی بە سادەیی ژیان بکەی و لە نفووزی شارسـتانییەت دوور بی. شارستانییەتی ماددی واتە دەرکەوتن و ئاشکرابوونی بەلاڕێداچوون و گوناهی مرۆڤ.

ئیبن خەلدوون فەیلەسووف و بیرمەندی ئیسلامی پێویستیی ئینسان بە خواردن و غەریزەی خۆخۆشویستن بە دوو پاڵنەری سەرەکی لە مەیلی ئینسان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵ دەزانێ.
سەبارەت بە پێویستیی مرۆڤ بە خواردن، ناوبراو پێی وایە کە خوا مرۆڤی خوڵقاندووە و بە شێوەیەك دروستی کردووە کە ژیان و مانەوەی بەبێ خواردن مەیسەر نابێ و هەر بە شێوەی سرشتی ئەوی بۆ گەڕان بەدوای خواردندا ڕێبەری کرد و لە پێکهاتەیی جەستەییشیدا توانایی بەدەسهێنانی خواردنی داناوە. بەڵام چونکە مرۆڤ ناتوانێ تەواوی پێداویستییەکانی خۆی دابین بکات پێویستی بە هاوکاریی کەسانی دیکە هەیە و بەم شێوەیە لەبەر ئەوەی قازانجی لە ژیان لەگەڵ کەسانی دیکەیە، بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگە هان دەدرێ. بە دەستەواژەیەکی دیکە چونکە بە تەنیایی ناتوانێ خۆراکی پێویست دابین بکات، بە ناچار پێویستی بە یاریدەی کەسانی ترە. بە هۆی دابەشکرانی کار هەر کەس ئەرکێکی لەسەر شانە، کەواتە هەموو کار دەکەن و ژیانی بەکۆمەڵ دابین دەکەن. ئیبن خەلدوون پێی وایە بەبێ هاوکاری و یارمەتی، مانەوە و بەردەوامیی کۆمەڵگە مەیسەر نابێ.

پاڵنەری دووهەم ئەو مەترسییانەیە کە هەڕەشە لە گیانی مرۆڤ دەکەن، چونکە ئینسان دوژمنی زۆری هەیە کە لەو بەهێزترن و ئامرازی بەرەوڕووبوونەوەی ئینسان، لاوازە و ئاژەڵە دڕندەکان لە مرۆڤ بەهێزترن. لە حاڵێکدا کە ئینسان لاوازە و توانای ئەوەی نییە بە تەنیایی لە بەرامبەر دڕندەکاندا خۆی بپارێزێ، بۆیە بە ناچاری بە هاوکاری کەسانی دیکە بەرەنگاری لە خۆی دەکا.

مورتەزا موتەهەری دەڵێ: بەکۆمەڵایەتیبوونی ئینسان لە ناخی خوڵقان و سرشتی ئەودا بناغەکەی دانراوە. لە قورئاندا هاتووە کە: ئەی خەڵکینە ئێوەمان لە پیاو و ژنێك خوڵقاندووە و ئێوەمان بە شێوەی گرووپی نەتەوەیی و قەبیلەیی داناوە بۆ ئەوەی یەکتر بناسنەوە.(١٠)

تەباتەبایی هەر لەم بوارەدا دەنووسێ:"بەکۆمەڵاتیبون لە سرشتی هەر تاکێکی مرۆییدا هەیە. یەکەمین کۆمەڵێك کە لە نێو مرۆڤایەتیدا پێك هاتووە، کۆمەڵی خێزانی بوو کە کۆمەڵێکی سروشتییە. چونکە ئەم کۆمەڵە بە هۆی هاوسەرگیرییەوە دروستبووە و هاوسەرگیری و پێکهێنانی بنەماڵەش بە مەبەستی مانەوەی وەچە و بەردەوامیی ژیانی کۆمەڵایەتییە. ئەگەر ئینسان چێشت خواردن و کارە هاوشێوەکانی دیکە دەتوانێ بە تەنیایی ئەنجام بدا،

زاوزوێ و منداڵبوون و لە ئاكامدا بەردەوامی ڕەگەزی مرۆیی بە تاكە كەسێك جێبەجێ نابێ، بەم پێیە بۆ ئەم مەبەستە زیاتر لە مرۆڤێك پێویستە."(١١)

## ٤ـ جیاوازیی نێوان ژیانی كۆمەڵایەتی مرۆڤ و ئاژەڵ

لەنێوان كۆمەڵگەی مرۆیی و كۆمەڵگەی ئاژەڵی جیاوازیگەلێكی زۆر و ئاشكرا بەرچاو دەكەون. زۆر لە جرۆجانەوەر و گیانلەبەران بە شێوەی گرووپی ژیان بەسەر دەبەن و تەنانەت لە نێو هەندێكیاندا ئێمە ژیانێكی گرووپیی ڕێكوپێك و فۆرم گرتوو دەبینین. هەندێك لەو جرۆجانەوەرانە كە بە جرۆجانەوەرە كۆمەڵایەتییەكان بەناوبانگن، خاوەنی ڕێكخستنێكی ڕێكوپێكن. مێش هەنگوین، مێروولە و مۆریانە لەم جۆرەن كە لە كۆمەڵەكانیاندا دابەشكردنی كار، هاوكاری و چینی كۆمەڵایەتی و هەندێك لە پەیوەندییەكانی دیكە تا ڕادەیەك شیاوی تێگەیشتنن.

نزیكترین هاوشێوەبوون (وێكچوون) لەنێوان مێروولەكان و كۆمەڵگە مرۆییەكاندا بەچاو دەكەوێ. مێروولەكان خاوەن پیشەگەلی پسپۆڕین، هەندێك خزمەتكار ڕادەگرن بۆ ئەوەی خواردن دابین بكەن، هەندێكی دیكە مێروولە لاوەكان دەسگیر دەكەن و وەك كۆیلە ڕایاندێنن بۆ ئەوەی كاریان بۆ بكەن. لەنێویاندا هەندێك ڕەگەزی باڵادەست هەن كە ژیانیان بە تەواوەتی بەستراوە بە كۆیلەكانە. لە هەندێك جاردا كاتێك لە ڕێگەدا تووشی یەكتر دەبن شەڕ و لێكدان دەست پێدەكا.(١٢)

لە كتێبی چیرۆكەكانی سروشت ناسێكدا لەژێر سەردێڕی" ئەو سەگانەی قووڵكەیان هەڵدەكەند" هاتووە كە: لە شوێنی كوشتنەوەی ئاژەڵ لە ناوشار لاشەی ئاژەڵە نەخۆشەكانیان لەناو چاڵی كەمێك قووڵدا دەشاردەوە. دەستەیەك لە سەگە بەرەڵڵاكان لاشەكانیان دەردەهێنایەوە و دەبوونە هۆی پیس بوونی ژینگە. بۆ پێشگرتن لەم كارە چاڵەكەیان قووڵتر كرد، تێڕامانەكان دەریانخست كە سەگەكان بە هاوكاریی یەكتر زەوییەكەیان هەڵدەكەند بۆ ئەوەی بە كەلاكەكە بگەن. شێوازی هاوكارییەكە بەم شێوەیە بوو كە سەرەتا سەگێك خەریكی كاركردن دەبوو، لەگەڵ ئەوەی كە هەستی بە ماندوویێتی دەكرد و هەناسەبڕكەی دەگەیشتێ، دەستی لە كار هەڵدەگرت و بۆ حەسانەوە لە پەنایەك درێژ دەبوو و سەگێكی دیكە خەریكی كاركردن دەبوو. كاتێك یەكێك لەوان لە كارەكەیدا بێتاقەت و ماندوو دەبوو، بە جێگەی ئەو سەگێكی دیكە كاری دەكرد. بەم شێوەیە جێ گۆڕینی سەگەكان بەبێ

ڕاوەستان درێژەی هەبوو. ئاژەڵەکان بە شێوەی بەکۆمەڵ و پێکەوەیی کاریان دەکرد بۆ ئەوەی بە کەلاکەکە بگەن.

ئەوەی کە ئاژەڵەکان ناچار بە ژیـانی کۆمەلایـەتی دەکـا، پێویسـتییە مادديیـەکانی وەك ڕاوکردن، بەرەنگاربوونەوە، بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمن و شـتی لـەم بابەتەیـە و پێداویسـتییە دەروونییەکان ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نییە. کۆمەڵی مرۆیی تەنیا لەبـەر دابینکردنـی پێداویسـتییە ماددییەکان نییە، بەڵکوو پێویستییە مەعنەوییەکانیش گرینگییان پێدەدرێ.

مرۆڤ خاوەن عەقڵە و کۆمەڵی مرۆیی بەهۆی ئاوەزمەندیی تاکەکانی لە کۆمـەڵی ئـاژەڵی بە تەواوەتی جیاوازە. ژیـانی ئاژەڵـەکان لـەو کاتـەوە کـە بـەدی هـاتووە هـەتا ئێسـتا هـیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتووە لە حاڵێکدا کـە مرۆڤـ قۆناغگـەلی مێـژویی جۆراوجـۆری تێپەڕاندووە. بۆ نموونە دەگوترێ مرۆڤی چاخی دارستان، بەرد، ئاسن، هەڵم، ئەتۆم و ... بـەلام ژیانی ئاژەڵەکان وەها پەرەسەندنێکی بەخۆیەوە نەبینیوە.

ڕۆژێ باستید(Roge Bastide) ، کۆمەڵناسی فەڕەنسی پێی وایە کە جیـاوازی کۆمەڵـە مرۆییەکان لـە کۆمەڵـە ئاژەڵییـەکان لـە هێـزی لێکجیاکردنەوە(هـەڵوەژاردن) و گشـتاندن و وردبینی ئاگایانەی مرۆڤە. جیـاوازیی دیکـەی مرۆڤـ لەگـەڵ ئـاژەڵ هێـزی قسـەکردنییەتی. هەرچەند ئاژەڵەکانیش لە کاتی ترس و شادی و ئازاردا هەندێك دەنـگ لـە خۆیـان دەردەبـڕن، بەلام هەمووی ئەوانە لایەنی غەریزەی هەیە و وەك یەکە. ئینسـان تـەنیا بـە دەنگـەکان ڕازی نابێ بەڵکوو لە سەدان هەزار ساڵ لەوەپێشەوە لە ڕێگەی هێما و نیشـانەگەلێکی وەك هـێڵ و هێماکانی دیکە کە دایناون، شوێنەواری زۆری لەدوای خۆی جێهێشتووە.

مرۆڤ خاوەن کەلەپووری کولتوورییە. ژیانی کۆمەلایەتی ئەم توانایییە بە مرۆڤ دەبەخشـێ کە پێداویستییەکانی ژیانی خۆی وەك پێویستی بە خۆراك، جلوبەرگ و شوێنی نیشـتەجێبوون بە ڕادەیەکی زۆرتـر لەوەیکـە بـۆ تـاك مەیسـەر دەبـێ، دابـین بکـا و بـۆ دابینکردنـی ئـەم پێداویستییانە، تاکەکان بۆ سوودوەرگرتنی زیاتر و باشتر لە ژینگە لە دەوری یەکتر کۆ دەبنەوە و پەیوەندیگەلێك دادەمەزرێنن و هەندێك شێوازیان لەنێودا دروست دەبن کە لە "کولتوور"یان پێدەگوترێ. بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە ئینسان خاوەنی کولتوورە بەلام ئاژەڵ کولتووری نییـە. زانیارییەکانی مرۆڤ لە ڕێگەی کولتوورەوە لە وەچەیەك بۆ وەچەیەکی دیکـە دەگوازرێتـەوە و وردە وردە بەربلاوتر، بەنرختر و زیاتر دەبێ. هەر وەچەیەك ئەم زانیارییانە لە وەچەی پێش خۆی بە میرات وەردەگرێ، پێیـان زیـاد دەکـا و بـۆ وەچـەی دواتریـان دەگوازێتـەوە. لـە کۆمەڵـە

مرۆییەکاندا، گونجان لەگەڵ ژینگە بە هۆی هەوڵ و کۆششەوەیە و ئینسان لە ڕێگەی ئامرازێك کە دروستی دەکا دەتوانێ دەسکاری ژینگەی خۆی بکات و بە پێی پێداویستییەکان، حەز و ویستەکانی خۆی بیگۆڕێ و بەستێنی ژیانی خۆی لەبار بکات.

ئاژەڵەکان ناتوانن ئامراز دروست بکەن و تەنیا لە قۆناغی بەرزی پێگەیشتووییدا لەوانەیە بتوانن کەڵك لە ئامراز وەربگرن. مرۆڤ ڕۆڵەی باڵغ و پێگەیشتووی سروشتە.(١٣) و لە توانایی داهێنان و خولقاندن بەهرەمەندە و ڕێگەی کاملبوون دەپێوێ. بەڵام ئەم توانایی پێگەیشتن و کامڵبوونە لە ئاژەڵەکاندا نییە و گۆڕانێك لە ژیانیاندا ڕوو نادات. لە ئیمتیازەکانی دیکەی مرۆڤ نوێگەری و داهێنانە. ئاژەڵەکان نە هێزی فێربوونیان هەیە و نە دەتوانن زانیارییەکانی خۆیان بگوازنەوە. هەرچەند هەندێك لە ئاژەڵەکان هەندێك دروستکراوی بە ڕواڵەت سەرسوڕهێنەریان هەیە وەك تەونی جاڵجاڵۆکە و شانەی هەنگ، بەڵام ئەم شتانە هەمیشە بە هەمان شێوەیە کە لە سەدان هەزار سال لەوەپێش هەبووە و هیچ چەشنە گۆڕانکارییەکیان تێدا نەکراوە. بەلام ئینسان لە دەسکرد و دروستکراوەکانی خۆیدا بە پێی پێویستیی ڕۆژگار، گۆڕانکاریی زۆری هێناوەتە کایەوە و لە ڕێگەی دۆزینەوە و داهێنانەکان، دژواری و ئاستەنگییەکانی ژینگە و شوێنی ژیانی خۆی لا دەبات و خۆی لەگەڵ دەگونجێ.

### ٥. جۆرەکانی کۆمەڵگە مرۆییەکان

پەرەسەندن و گۆڕان لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی کۆمەڵگەی مرۆیین. گۆڕانکارییە هزرییەکانی مرۆڤ، داهێنانەکان، دۆزینەوە و نوێگەرییە زانستییەکان و ... لەو هۆکارە کاریگەرانەن کە بەردەوام کۆمەڵەکان دەگۆڕن. بەم شێوەیە کۆمەڵگەی مرۆیی هەمیشە لە حاڵەتی گەشەکردن و گۆڕانکاری دایە و هەتا ئەمرۆ قۆناغگەلی جۆراوجۆری تێپەڕ کردووە.

کۆمەڵناسان باسی کۆمەڵگەیان لە قوناغگەلی جیاجیادا کردووە. یەکەمین دابەشکاری لە کۆمەڵگە بە شێوەی زانستی لە لایەن ئیبن خەڵدوون کۆمەڵناسی ئیسلامی سەدەی چواردەیەمی زایینی ئەنجام دراوە. ناوبراو کۆمەڵگە لەسەر بنەمای جۆری گوزەران بە دوو جۆر کۆمەڵگەی کۆچەری و کۆمەڵگەی شارنشینی دابەش دەکات و لەم دابەشکارییەدا بابەتی دەمارگیری دەخاتەڕوو. بە بۆچوونی ناوبراو لە کۆمەڵگەی کۆچەریدا دەمارگیری بەهێزە و دەبێتە هۆی یەکگرتوویی کۆمەڵگە. ئەم کۆمەڵگە گەشە دەستێنێ و ئارام ئارام دەوڵەمەندە سەحرانشینەکان کۆمەڵی گەورەتر پێك دێنن و شارەکان دروست دەبن و گەشە دەکەن. لە

درێــژەدا دەڵــێ: هاوتــەریب لەگــەڵ پەرەســەندنی کۆمەڵگــە لــە کۆچــەرییەوە بــۆ شــار، ئــەو دەمارگیرییەش بەرەو لاوازی دەڕوا و لەناو دەچێ. لە ئاکامدا بە هێرشێکی سەحرانشــینان بــۆ سەر کۆمەڵگەی شارنشین، تووشی نابووت بوون و لەناوچوون دەبێ و لێك هەڵدەوەشێ.

سپێنسەر (Spencer) بڕوای بەهەبوونی دوو جۆرە کۆمەڵگە هەیە: کۆمەڵگەی سەربازی و کۆمەڵگــەی پیشەســازی. کۆمەڵگــە کۆنــەکان لــە جــۆری ســەربازی بــوون، چــونکە لــەو کۆمەڵگەیانەدا یاسا و ڕیساکان بە شێوەی زۆرەکی بەســەر خەڵکــدا دەســەپێنران و ئــازادی و ڕێککەوتنێك لەگۆڕێ نەبوو. لە کۆمەڵگــەی پیشەســازی زۆربــەی کارەکــان بــە ڕێککــەوتن و ڕەزامەندی ئەنجام دەدران و لەسەر بنەمای دابەشکردنی کارە و تێیــدا زاناکــان، ئەنــدازیاران و خاوەن پیشەسازییەکان جڵەوی کاروبارەکانیان بەدەستەوەیە. دۆرکــایم بۆچــوونی سپێنســەر بــە شێوازێکی دیکە دەردەبڕێ و بڕوای بە دوو جۆر کۆمەڵگەیە. کۆمەڵگەیەك کە پەیوەندیی نێوان تاکەکانی میکانیکییە. واتە تاکەکان پێچ و مــۆرە و بەشــە پێکهێنــەرەکانی ماشــێنێکن کــە جیاوازیگەلی فکری، زەوقی، کۆمەڵایەتی و چینایەتی لەنێوانیاندا نییە. بۆ نموونــە کۆمەڵگــە سەرەتاییەکان لە کۆمەڵە خەڵکێك کە هەموویان خەریکی کۆکردنەوەی خواردن بوون یــان ڕاوە ماسییان دەکرد. لەو جۆرە کۆمەڵگایانە، دابەشکردنی کار لە ئارادا نەبوو بەڵام بە زیــادبوونی بەرەبەرەی حەشیمەت ئیتر ئەوە نەدەگونجا هەموویان خەریکی کارێك بن، بۆیە بە ناچاری هــەر گرووپێك مەجبوور بوون کارێکی جیاواز لە کاری ئەوانی دیکە ئەنجام بدەن. بەم شێوەیە لــەنێو گرووپە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان، دابەشکردنی کار و جیاوازیی پیشە پەیدا بوو و کەســایەتی تاکەکەسی گەشەی کرد و وردە وردە کۆمەڵگەیەك دروست بوو کە تێیدا تاکەکان بە شــێوازێك لەسەر بنەمای حەز و ڕێککەوتنیان پەیوەندییان دامەزراند و بەم شێوەیە کۆمەڵگە لە حاڵەتی یەکــەم کــە پەیوەنــدیی نێــوان تاکــەکان ماشــێنی و وەك بەشــەکانی ماشــێن بــوون، شــێوەی کۆمەڵگەیەکی بەخۆوە گــرت کــە پەیوەنــدیی نێــوان تاکــەکان لەســەر بنــەمای ڕێککــەوتن و ڕەزامەندیی نێوانیان بێ. واتە هاوپەیوەندیی و پەیوەندییە میکانیکییەکانی تاکەکان شێوازی پەیوەندیی و هاوپەیوەندیی ئۆرگانیکی بەخۆیەوە گرت.

لەم کۆمەڵگەیەدا تاك و گرووپەکان وەك ئەندامەکانی جەستە دەچــن کــە هــەر یــەکێکیان کارێکی تایبەت ئەنجام دەدەن و هەندێك پەیوەندییان لەنێودا هەیە.

ژان پیــاژێ(Jean Piaget) دەروونناســی کۆمەڵایــەتی سویســرایی بــڕوای بــە دوو جــۆر کۆمەڵگە هەیە:

**١ـ کۆمەڵگەیەك کە لەسەر بنەمای ناچارێتی یە. (اجبار)**

**٢ـ کۆمەڵگەیەك کە بناغەکەی لەسەر ئازادی و هاوکاری دامەزراوە.**

بەهەرحاڵ هەرکام لە کۆمەڵناسان بڕوایان بە هەبوونی دوو یان سێ جۆر کۆمەڵگە هەیە کە جۆرە پەیوەندییەکی مێژووییان لەنێودا هەیە، واتە لە حاڵەتێك بەرەو حاڵەتێکی دیکە چوون و گەشەیان ستاندووە.

نوێترین دابەشکاری لە لایەن جۆرج گۆرڤیچ کۆمەڵناسی فەڕەنسی کراوە. ناوبراو کۆمەڵگە لە ڕوانگەی ماددییەوە دابەش دەکا و پێی وایە دوو جۆر کۆمەڵگە هەیە:

**١ـ کۆمەڵگەی سەرەتایی یان کۆچەری**

**٢ـ کۆمەڵگەی پەرەسەندوو**

لە دابەشکردنی کۆمەڵگەی پەرەسەندوودا ٣ جۆر کۆمەڵگە دیاری دەکا: **یەکەم/** کۆمەڵگاکانی لە حاڵی گەشە، **دووەم/** کۆمەڵگە گەشەسەندووەکان، **سێهەم/** کۆمەڵگە پێشڕەوەکان. ئەم دابەشکارییە بەهەمان شێوە کە باس کرا زیاتر لایەنی ماددی هەیە، بەڵام لە باری مەعنەوی، کولتووری، دەروونی و کۆمەڵایەتی ڕوون نییە کە خەڵك لەم کۆمەڵانەدا لە چ ڕەوشێکدا ژیان بەسەر دەبەن. داخوا پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا کە هەمان لایەنی ماددیی کولتوور (شارستانییەت) پێك دێنێ، هاوئاهەنگی لەگەڵ کولتووری ناماددی هەیە و پێداویستییە ڕووحییەکانی خەڵك دابین دەکا یان دۆزەخێکی بۆ کۆمەڵگە دروست کردووە کە هەموویان تێیدا لە حاڵەتی سوتان دان.

بە شێوەیەکی گشتی بە ئیلهام وەرگرتن لە دابەشکارییەکەی گۆرڤیچ لە باری ئالۆزیی پێکهاتەییەوە دەتوانین کۆمەڵگەکان بە دوو دەستە کۆمەڵگەی پەرەسەندوو و سەرەتایی دابەش بکەین. کۆمەڵگە پەرەسەندووەکان ئەو کۆمەڵگایانەن کە هەزاران ساڵ لەمەوپێش قۆناغی کۆکردنەوەی خواردنیان تیپەڕ کردووە و بەرە بەرە پێکهاتەیەکی ئاڵۆزیان بەخۆوە گرتووە. ئەم کۆمەڵگەیانە دەتوانین بە دوو جۆری پەرەسەندووی پیشەسازی و نەریتی جیا بکەینەوە.

کۆمەڵگە پەرەسەندووە پیشەسازییەکان: ئەو کۆمەڵگە ئاڵۆزانەن کە لە شۆڕشی پیشەسازی بەهرەمەند بوون و بە خێرایی ڕێگەیی پێشکەوتنە زانستی و تکنیکییەکانیان بڕیوە. وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا لەم پلەیەدا جێ دەگرن. بەڵام کۆمەڵگە پەرەسەندووە نەریتییەکان: ئەم کۆمەڵگەیانە لەخۆ دەگرن کە بە هۆکارگەلێك قۆناغی شۆڕشی پیشەسازییان تێپەڕ نەکردووە و هەندێکیشیان ڕابردوویەکی درەوشاوەیان هەبووە و بە بەراورد لەگەڵ پێشینەی کۆمەڵگە

پیشەسازییەکانی ئەمڕۆکە پێکهاتەیەکی ئالۆزتریـان هـەبووە. کۆمەڵگـە ئاسـیاییەکانی وەك هیند، چین و ئێران لـەم دابەشـکارییەدا جێگـەیان دەبێتـەوە. کۆمەڵگـە گەشـەنەکردوو یـان سەرەتاییەکان: کە هەنووکەش لە هەندێك ناوچەی جیهان وەك ئوسـترالْیا و ئـەفریقیای ڕەشـدا نموونەگەلێکیان لێ ماوەتەوە، ئەو کۆمەڵگەیانەن کـە لـە قۆنـاغی کۆکردنـەوەی خـۆراك یـان سەرەتاکانی چاخی بـەردینی نـوێدا ماونەتـەوە و دابەشـکردنی کـاری کۆمەڵایـەتی تێیانـدا گەشەیەکی ئەوتۆی نەکردووە و لەڕاستیدا هەر ئەوانەن کە بە وتـەی دۆرکـایم لەسـەر بنـەمای یەکگرتوویی میکـانیکیین و مەودایـەکی زۆریـان لەگـەڵ کۆمەڵگـە پەرەسـەندووەکان هەیـە: دابەشکردنی کار، لەسەر بنەمای تەمەن و ڕەگەزە، گوزەران لە قۆناغی کۆکردنـەوەی خـۆراك و هەندێکیان لە سـەرەتای بەرهـەمهێنانی خـۆراك دان. خـەت و نووسـین بـوونی نییـە و بـیر و باوەڕەکان خوڕافین. ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانـە لـە لایـەن ئەنترۆپۆلۆژیسـت و خەڵکناسـەکانەوە توێژینەوە و موتالاّیان لەسەر دەکرێ.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی چوارەم

١ـ لغت نامه دهخدا، واژه جامعه، ص ٨٨.

٢ـ مرتضي مطهری، جامعه و تاریخ، انتشارات ملاصدرا، ص ١٢و١١.

٣ـ گوردون چایلد، (V.Gordon Child)، جامعه و دانش، ترجمه محمدتقی فرامرزی، سهروردی، ١٣٤٦، ص ١٠١.

٤ـ اگ برن و نمکوف، زمینه جامعه‌شناسی، اقتباس ا.ح. آریان پور، دانشگاه تهران، ١٣٤٤،ص.٩٤

5.Giovani-Hoyois Sociologie Rurale Editions UnniversitaireP.16.

٦ـ علامه طباطبایی، روابط اجتماعی در اسلام، انتشارات أری، ص.١٣

٧ـ رمون آرون، مراحل اساسی اندیشه در جامعه‌شناسی، ترجمه باقر پرهام، سازمان انتشارات آموزش انقلاب اسلامی، ١٣٦٣، ص١٧ـ٧٠.

٨ـ جمعه و تاریخ، ص ٣٤.

٩ـ ژان ژاك روسو، قرارداد اجنماعی، ترجمه غلامحسین زیرك زاده، چاپ سوم، ١٣٣٥.

١٠ـ سوره حجرات، آیه.١٢

١١ـ علامه طباطبایی، روابط اجتماعی در اسلام، انتشارات آذری، ص.٤

١٢ـ جون رابینسون، أزادی و ورت، ترجمه علی گلریز، ١٣٥٨،ص.٨

١٣ـ مطهری، اسلام و مقتیات زمان، اطلاعات ١٥ ١٣٦٢، شماره ١٧٢٧٤، ص ٢٠.

# بەشی پێنجەم

## میتۆدەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا

بە شێوەیەکی گشتی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان لەچەند بارەوە دەتوانرێ پۆلێن بەندی بکرێن:

### ئا ـ توێژینەوەی وەسفی و توێژینەوەی شیکاری

لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا دەتوانرێ جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە توێژینەوەیە بە شێویەکی بەرچاو نیشان بدرێ: لە بنەڕەتدا ئەو توێژینەوانەی کە بە گریمانە دەست پێدەکەن و ئێمە بە مەبەستی دروستی و نادرووستیی، سەلماندن یان ڕەتکردنەوەی گریمانە خەریکی توێژینەوە دەبین بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا بە تیۆرییەك یان یاسامەندییەك بگەین، توێژینەوەی شیکاری یان زانستی پێدەگوترێ. لە بەرامبەردا توێژینەوەیەك کە تەنیا بە مەبەستی ناسین و کۆکردنەوەی زانیارییەکان نەك گەیشتن بە تیۆرییەك ئەنجام دەدرێ و گریمانە یان گریمانەگەلێك لە سەرەتای کاردا ناخرێنەڕوو، توێژینەوەی دۆزراوەیی یان وەسفی پێدەگوترێ.

توێژینەوە وەسفییەکان ئەگەرچی بە تیۆری ناگەن بەڵام خۆیان لەوانەیە بەستێن خولقێنی گریمانەگەلێك بۆ توێژینەوەکانی دوایی بن و لە لایەکی دیکەشەوە ئەم جۆرە توێژینەوانە هەروەك لە ناونیشانەکەی دیکەی واتە "ناسین" دەردەکەوێ، لەو بابەتانەدا ئەنجام دەدرێن کە زانیارییەکانی ئێمە سەبارەت بە بابەتی توێژینەوەکە لاواز یان هیچ بێ و بەم پێیە سەرەتا بۆ ناسینی کۆمەڵگە یان بابەتی توێژینەوەکە خەریکی کۆکردنەوەی زانیارییەکان دەبین. لە ئێراندا زۆربەی ئەو توێژینەوانەی کە لە دامەزراوەکانی توێژینەوە ئەنجام دراون لە جۆری

توێژینەوە وەسفییەکانن کە ئاماجیان هەروەك ئاماژەی پێکرا، جۆرێك کۆکردنەوەی ئامار و داتا و زانیاریی دەربارەی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەیە. لەم جۆرە توێژینەوانەدا، پەیوەندییە هۆکردییەکان لەبەرچاو ناگیرێ و توێژەر تەنیا خەریکی جۆرێك وێنە هەڵگرتن لە ڕاستییەکانی ناو کۆمەڵگەی توێژینەوەیە لە حاڵێکدا کە لە توێژینەوە زانستی یان شیکارییەکان کە لەسەر بنەمای گریمانەن، هەوڵ بۆ ئەوەیە کە گریمانەکە تاقی بکرێتەوە و بسەلمێنرێ. دیارە لە حاڵەتی ڕەتبوونەوەی گریمانە توێژەر گریمانە یان چەند گریمانەیەکی دیکە وەك بنەمای کاری خۆی دەخاتەڕوو.

### ب: توێژینەوەی فراوان و توێژینەوەی چڕ

بە پێی ئەم پۆلێنکردنە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی گشتی بە دوو جۆری توێژینەوەی فراوان و توێژینەوەی چڕ دابەش دەکرێ. توێژینەوەی فراوان ئەو توێژینەوەیە کە توێژینەوە لەسەر کۆمەڵگە فراوان و بەربڵاوەکان دەکات کە زیاتر لە کۆمەڵناسیدا کەڵکی لێ وەردەگیرێ و ئامانجی ئەم جۆرە توێژینەوانە هەروەك پییەر بیسنییە دەڵێ: بریتییە لە بینینی کۆمەڵگە بەربڵاوەکان یان زنجیرەیەك لە کۆمەڵەکان و بەدەسهێنانی تایبەتمەندییە گشتییەکانە.

لە بەرامبەردا شێوازی توێژینەوەی چڕ تایبەت بە توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکانە و ئامانجی توێژینەوەکەی کۆمەڵگەیەکی تایبەتە کە لەسەر بنەمای دوو تایبەتمەندیی ڕاوەستاوە:

**ئا ـ کۆکردنەوەی بە تەواوەتی ئەو واقیعانەی کە لە کۆمەڵگەی توێژینەوەکەدا شیاوی دیتنن.**

**ب ـ ناسیارییەکی هەمەلایەنە یان بە دەستەواژەیەکی دیکە ناسینێکی قووڵی کۆمەڵگەیە.(١)**

### پ ـ توێژینەوەی مەیدانی و توێژینەوەی بەڵگەنامەیی

مەبەست لە توێژینەوە مەیدانییەکان ئەو توێژینەوانەن کە بابەتی توێژینەوەکە لەژێر سەیتەرەی توێژەردا بێ یان بە دەستەواژەیەکی دیکە توێژەر دەستی پێ ڕابگا. بۆ نموونە لە بابەتگەلێکدا کە ئامانجی ئێمە توێژینەوە لەسەر توێژێك لە توێژەکانی کۆمەڵگە شارنشینی، وەرزێرانی نیشتەجێی گوندێك، گرووپێك لە کرێکارانی دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنان و یان تایفەیەك لە کۆچەرە عەشیرەتییەکان بێ، ئەم جۆرە توێژینەوەیە توێژینەوەی مەیدانیی

پێدەگوترێ و بەم پێیــە پیوەلکانــدنی زاراوەی مەیــدانی بــە واتــای پەیوەنــدیی ڕاســتەوخۆ و ڕووبەڕووی توێژەر لەگەڵ ئەو دیاردانەیــە کــە توێژینــەوەیان لەســەر دەکــرێ. لــە بەرامبــەردا مەبەست لە توێژینەوە بەڵگەنامەییەکان، ئەو توێژینەوانەن کە بابــەت یــان دیــاردەی جێگــەی توێژینەوە لە ئیختیار و لەبەردەستی توێژەردا نییە یان ئەوەکە پەیوەندیی بە ڕابردوویەکی دوور یان نزیکەوە بێ. بەم پێیە توێژینەوە بەڵگەنامەییەکان یان پەیوەنــدییان لەگــەڵ بابەتگەلێکــدا هەیە کە لە سەردەمی ئێستادا لە ئیختیار توێژەردا نین و توێژەر ناتوانێ بــە ئاســانی دەســتی پێیان بکات یان ئەو بابەتانە دەگرێتەخۆ کە پەیوەندییان بە ڕابردوویەکی دوور یان نزیك هــەبێ و بــەم هۆیەشــەوە جــاری وایــە توێژینــەوە بەڵگەنامەییــەکان، توێژینــەوە مێژوویەکانیشــیان پــێدەگوترێ. لــە پەیوەنــدیی لەگــەڵ حاڵــەتی یەکەمــدا، دەتــوانرێ وەك نمونــە ئامــاژە بــە ڕێوڕەسمەکانی کرێکاران یان ڕۆڵی حیزب و سەندیکاکان لە بزووتنەوە کرێکارییــەکانی وڵاتــانی پیشەسازی بکرێ. لەم جۆرە توێژینەوانەدا، دەرفەتی ئەوەکــە توێــژەرێکی ئێرانــی، ڕاســتەوخۆ پەیوەندیی لەگەڵ کۆمەڵگەی کرێکارانی وڵاتانی پیشەسازی هەبێ، بــوونی نییــە و بــەم پێیــە تەنیا ئامرازێك کە بە هۆیەوە بتوانێ توێژینەوە لەم پەیوەندیی و ڕێوڕەسمانە لە دۆخی ئارایییــدا بکات، ئەو بەڵگە و دۆکیۆمێنتانەن ( کتێب، گۆڤار، نامیلکە، توێژینەوەی ئەنجامدراو و ...) کە توێژەر دەتوانێ بەدەستیان بێنێ.

لە پێوەندیی لەگەڵ حاڵەتی دووەم کە بابەتی توێژینەوە بــە هــۆی ئەوەکــە پەیوەنــدیی بــە ڕابردوویەکی دوور یان نزیکــەوە هەیــە، توێــژەر ناتوانــێ دەســتی پێیــان بگــات ( بــۆ نموونــە توێژبەندیی کۆمەڵایەتی لە سەردەمی سەفەوییەکان لــە ئێــران یــان ڕۆڵــی توێــژە جۆراوجــۆرە کۆمەڵایەتییەکان لە شۆڕشی مەشرووتەی ئێراندا) توێژینەوەکە لایەنی کۆمەلناسیی مێــژوویی بەخۆیەوە دەگرێ و هەر بۆیە لە وەها حاڵەتێکدا توێــژەر ڕێگەیــەکی بێجگــە لــە توێژینــەوەی بەڵگەنامە و دۆکیۆمێنتەکان بەدەستەوە نییە.

لە هەر دوو بابەتی ئاماژەپێکراودا بە سەرنجدان بەوەکە سەرچاوە ســەرەکییەکانی جێگــەی ســوود لێــوەرگرتن کتێــب، گۆڤارەکــان و بەلگەنامــەی دیکــەی بەردەســتن یــان لــە قۆناغــە مێژووییەکانەوە بەجێ ماونەتەوە، هەروەك دواتر شرۆڤەیان دەکەین، کەڵك لــە شــێوازی فــیش هەڵگرتنەوە وەردەگرین.

## یاسامەندیی لە کۆمەڵناسیدا

دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسی پێیان وابوو کە ئەم زانستەش دەتوانێ لە توێژینەوەکانیدا سوود لە میتۆدەکانی زانستە ئەزمونییەکان وەربگرێ. میتۆدەکانی زانستە ئەزموونییەکان لەسەر بنەمای تێڕامان، تاقیکردنەوە و ئەزموونە. توێژەر سەرەتا لە ڕێگەی توێژینەوەی تیۆریك، تێڕامان لە کاروبارەکان و شارەزابوون لە ئەزموونەکانی بەردەست، گریمانە یان گریمانەگەلێك دەخاتەڕوو و بە مەبەستی سەلماندن یان ڕەتکردنەوەی ئەو گریمانە یان گریمانانە دەست بە توێژینەوە دەکا. ئەگەر ئەزموونەکانی بەدەسهاتوو لە توێژینەوەکانی ئەو بابەتی توێژینەوەکە پشت ڕاست بکەنەوە و گریمانەکەی بسەلمێنن، بە یاسا دەگات.

لە نێوان ماهییەتی توێژینەوەکانی کۆمەڵناسانە بە پێی سروشتی تایبەتی کاروبار و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ توێژینەوەکانی زانستە سروشتییەکان هەندێك جیاوازی بوونی هەیە بەم واتایە کە زانای سروشت ناس دەتوانێ لە پەیوەندیی لەگەڵ بابەتی توێژینەوەکەی، لە تاقیگەدا دەستکارییان بکات و دەرەنجامە وەدەسهاتووەکان تۆمار بکا و بۆ ئەوەی ئاگاداری چۆنایەتییەکەی بێ. لەحاڵێکدا کە ئەو دەرفەتە بۆ کۆمەڵناسێك لە ئارادا نییە چونکە تاقیگەی کۆمەڵناسی هەر کۆمەڵگەیە. بۆ نموونە ئەگەر کۆمەڵناس بیهەوێ جۆری پەیوەندی نێوان ڕێژەی داهات و قەوارەی خێزان یان ژمارەی منداڵەکانی ناو بنەماڵە بدۆزێتەوە، لە کۆمەڵگەی توێژینەوەی خۆی ناتوانێ هیچ جۆرە دەستێوەردان و دەستکارییەك بکات و بۆ نموونە داهاتەکە وەك گۆڕاوێکی سەربەخۆ کەم یان زیاد بکا و ئاڵوگۆڕە وەدەسهاتووەکە لە لایەنی بنەماڵەوە وەك گۆڕاوێکی شوێنکەوتوو بدۆزێتەوە. خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە بابەتی جێی تاقیکردنەوەی توێژەرێکی سروشتناس کاریگەریی لەسەر ئەو دانانێ، کەچی بابەتی توێژینەوەی کۆمەڵناس کۆمەڵگەی مرۆییە و لەوانەیە بە شێوازی جۆراوجۆر کاریگەری لەسەر دابنێن یان بە هۆی ئەوەکە توێژەر سەبارەت بە کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی خۆی خاوەنی هەست و حەز و سۆزی تایبەتە وەها ئینتیما و بەستراوەبوونێك کاریگەری لەسەر دروستی و ڕاستی توێژینەوەکەی دادەنێ و دەبێتە کۆسپ بۆ ئەوەی دەرەنجامەکان بێلایەنانە و بە ڕاستی وەدەست بێن.

بەم پێیە کۆمەڵناس لە سەرەتای کاردا بە پشت بەستن بە زانیاریی و ئەزموونەکانی خۆی بە مەبەستی تاووتوێی بابەتێکی کۆمەڵایەتی گریمانەیەك دەخاتەڕوو و دواتر بۆ دڵنیابوون لە دروستی و نادروستی گریمانەکەی لە بیاقی کردەوەدا دەست بۆ تاقیکردنەوەی دەبا و ئەگەر لەم تاقیکردنەوە بە سەرکەوتوویی بێتەدەر، ئیعتیبار پەیدا دەکات و یاسای پێدەگوترێ.

بەڵام چونکە بابەتی کۆمەڵناسی، بابەتە کۆمەڵایەتییەکانن و ئەم جۆرە بابەتانە ڕۆڵیان لە ژیانی توێژەردا هەیە، زۆربەی کاتەکان توێژینەوەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر لە توێژینەوەکانی زانستەکانی دیکە، پەیوەندییان بە حەز و دەمارگیری و پێشینەی هزریی توێژەرەوە دەبێ. بەم هۆیەوە ئەم دەرەنجامگیرییانە جیاوازیگەلی بەرچاویان لەگەڵ دەرەنجامە زانستییەکان لە زانستە ئەزموونییەکان هەیە کە دواتر ئاماژەیان پێدەکرێ.

سیسرۆن (١٠٦ـ ٤٣ پ.ز) وتاربێژی گەورەی ڕۆمی، لەوانەیە لە یەکەم بیرمەندەکان بێ کە هەستی بەوە کردبوو کۆمەڵگەش وەك سروشت پەیڕەو و ملکەچی یاساکانە. مۆنتسکیۆ چەمکی یاسای بە شێوازێکی تایبەت لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا خستەڕوو و بە ڕاگەیاندنی ئەوەکە یاساکان پەیوەندییە پێویستەکانی سەرچاوەگرتوو لە سروشتی شتەکانن، توێژینەوەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی لەسەر بنەمای تاووتوێی پەیوەندییە هەمیشەییەکانی نێوان سروشتی مرۆڤ ( بە سەرنجدان بە فاکتەرە جەستەیی و فکرییەکانی مرۆڤ ) و سروشتی شتەکان واتە ژینگە دامەزراند.

لەنێو گشت بیرمەندانیشدا ئەم بیرە بەهێز بوو کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وەك دیارەی فیزیکی و کیمیاییەکان خاوەنی یاساگەلی تایبەت بە خۆیانن. دیارە پێویست بە شیکردنەوەیە کە یاسا فیزیکییەکان لایەنی مسۆگەربوونیان هەیە، لە حاڵێکدا کە یاسا کیمیاییەکان، پێویستییان بە بارودۆخی تایبەتی و بە تایبەت بوونی ڕێژەی دیاریکراو و توانایی پێکهاتەیی ماددەکانە.

لە بایۆلۆژیادا بەستراوەیی هەلومەرجەکان دەچێتەسەر چونکە پەرچەکردارەکانی بوونەوەرە زیندووەکان بگۆڕ و ناجێگیرن. هەروەك دەزانین لە فیزیادا دوپاتبوونەوەی تەواوەتی کارێکی فیزیکی بەردەوام دەگونجێ، واتە بۆ نموونە دەتوانرێ لە تاقیگەدا هەموو کردارە فیزیکییەکان دووپات بکرێنەوە و بە هەمان دەرەنجانی دیاریکراو بگەیت. بەڵام لە زانستەکانی دیکە بۆ نموونە بایۆلۆژی لەوانەیە لە ماوەی توێژینەوە و تاوتوێدا ڕووبەڕووی زنجیرە دیاردەیەك ببین کە دوای دوپاتکردنەوەی تاقیکردنەوەکە، دەرەنجامی دیاریکراو و چاوەڕوانکراو بەدەست نەیەت. واتە هۆکارگەلی نوێ وەك

گونجان لەگەڵ بارودۆخی نوێ و پێکهێنانی هەستیاری و شتی لەم بابەتە لەوانەیە لە تاقیکردنەوە جۆراوجۆرەکاندا، توێژەر لە گەیشتن بە یاسا یەکجارەکییەکان بگێڕنەوە.

هەر ئەم دژواری و ئاستەنگییانە لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکانیشدا دێنە پێشەوە، چونکە لێرەدا کاری توێژەر لەگەڵ مرۆڤەکانە و بەم هۆیەشەوە یاسا کۆمەڵایەتییەکان پێبەندی بارودۆخی شوێنی و کاتین، پەیوەندییان بە بەربڵاویی کۆمەڵگەوە هەیە و لە ڕوونکردنەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا سەروکارمان لەگەڵ زنجیرەیەك لە فاکتەرەکان هەیە.

دەتوانین تایبەتمەندییەکانی یاساکان لە کۆمەڵناسیدا بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

**١ـ سنووردارێتی کاتی**

لەبەر ئەوەی کە کۆمەڵگە مرۆییەکان بە خێرایی گۆڕانیان بەسەردا دێ، تێپەڕینی زەمەن یاسا کۆمەڵایەتییەکانیش دەگرێتەوە و بەم پێیە بە کۆکردنەوەی زانیارییەکان و بەڵگە پێویستەکان دەتوانرێ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە کاتێکی دیاریکراودا تاووتوێ بکرێن و پەیوەندییە هۆکارییەکانی نێوان ئەم دیاردانە بخرێنەڕوو. دەرەنجامە وەدەسهاتووەکان بەم شێوەیە لە پلەی یەکەمدا پەیوەندییان بە سەردەمێکی تایبەتەوە هەیە و شیاوی گشتاندن بۆ سەردەمێکی دیکە نابن.

لە زانستە ئەزموونییەکاندا، یاسا زانستییەکان بەم شێوەیە لەژێر کاریگەریی کاتدا نین و وەك نموونە کاتێك کە دەڵێین ئاو لە پلەی سەدی گەرمیدا دێتە کوڵ، ئەم یاسایە لە هەر کاتێکدا شایانی تاقیکردنەوەیە و لەڕاستیش نزیکە.

**٢ـ سنووردارێتی شوێنی**

دەرەنجامە زانستییەکان لە کۆمەڵناسیدا، خاوەنی سنووردارێتیی شوێنین و بە پێچەوانەی زانستە ئەزموونییەکان ناکرێ بۆ کۆمەڵگەکانی دیکەش بگشتێنرێن. بۆ نموونە، دەرەنجامە زانستییەکانی توێژەرێکی کۆمەڵناس دەربارەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی ئێران توانایی گشتاندنی بۆ وڵاتانی دیکەی نییە و جاری وایە دەرنجامەکە تەنیا شیاوی گشتاندن بۆ سنورێکی زۆر بچووکتر لە کۆمەڵگەی ئاماریی توێژینەوەکەیە. لە زانستە ئەزموونییەکاندا دەرەنجامە زانستییەکان زۆبەیان شیاوی گشتاندنن و لە ژینگە جۆراوجۆرەکاندا شیاوی گونجاندن و بەراوردکردنن بۆ نموونە لە پێوەندیی لەگەڵ نموونەکەی پێشوو، یاسای بەکوڵهاتنی ئاو لە پلەی سەددا، پەیوەندیی بە شوێنێکی تایبەتەوە نییە و لە تەواوی گۆی زەویدا ئاو لە پلەی گەرمیی سەددا دێتە کوڵ.

**٣ـ دەرەنجامـە زانسـتییەکان لـە کۆمەڵناسـیدا پەیوەنـدیی بـە قـەبارە و بـەربڵاویی کۆمـەڵگەوە** هەیە. لە کۆمەڵناسییدا ئەو یاسـایانەی کـە لـە تـاوتوێی کۆمەڵگـە بچـوکەکان بەدەسـت دێـن، شـیاوی گونجـان بـۆ کۆمەڵگـە گـەورەکان نـین. بێجگـە لەمـەش یاسـا کۆمەڵایەتییـەکان پەیوەنـدییان بـە لایەنـەکان، گرووپـەکان، توێـژەکان و ڕێکخـراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە.

**٤ـ جیاوازیی لە ڕێژە و ڕادەی کاریگەریی دیاردەکان.**

لە دیراسەی هەر یەك لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ڕووبەڕووی زنجیرەیەك لـە فاکتـەرەکان دەبین کە هەر یەکێکیان بە پلە و توانایییەکی دیـاریکراوەوە لـە هاتنـەدی ئـەو دیاردەیـەدا بەشدار بوون و بەم هۆیەوە ناتوانرێ دیاردەکان بە تەنیا فاکتەرێك ڕوون بکرێنـەوە، چـونکە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەرەنجامی کاریگەریی کۆمەڵێك لە هۆکارەکانن بەم جیاوازییە کـە لە بابەتێکدا لەوانەیە کاریگەریی فاکتەری ئابووری زیـاتر بـێ یـان لـە بابـەتێکی دیکـەدا فاکتەرە مەعنەوی و نامادییەکان زیاتر شوێندانەر بن. بۆ نموونە لەوانەیە لە کۆمەڵگەیەکدا فاکتەری ئابووری ببێتە هۆی زیادبوونی ڕێژەی منداڵبوون و لـە کۆمەڵگەیـەکی دیکـەدا بـە پێچەوانەوە، هەژاری و نەخوێندەواری لەم کارەدا کاریگەر بن. بەم پێیـە لـە کۆمەڵناسـیدا ناتوانرێ لە ڕوونکردنەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا تەنیا سوود لە دیتنی هۆکارێـك (تـاك فاکتەر بینی) وەربگیرێ. چونکە هەر وەك پێشتر گوترا، یاسا لە کۆمەڵناسی وەك یاسـا لـە زانستە سروشتییەکاندا نییە و تاکە هۆکارێك هەمیشە بەرهۆ یان بەرهۆ هاوشـێوەکان وەدی نایەنێت. چونکە پەیوەندیی هۆکاریی نێوان دیاردەکان لە کۆمەڵگەیەك بـۆ کۆمەڵگەیـەکی دیکە جیاوازە. (٢)

ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە پەیوەندیی لەگەڵ یاساکانی کۆمەڵناسیدا باسیان کرا سەلمێنەری کێشە و ئاڵۆزییەکانی کـاری توێـژەر لـە کۆمەڵناسـی دایـە. ئۆگسـت کۆنـت دامەزرێنـەری کۆمەڵناسی لە پۆلێنکردنی خۆی لە زانستەکان، بە هۆی ئاڵۆزیی لەڕادەبەدەر کۆمەڵناسی لـە دوایین پلە داناوە. پۆلێنبەندی کردنی ناوبراو بەم شـێوەیەیە کـە زانسـتەکان لـە ماتماتیکـەوە دەست پێدەکەن و دوای ئەو پشت سەری یەك ئەستێرەناسی، فیزیـا، کیمیـا، بایۆلۆژیـا و لـە کۆتاییدا کۆمەڵناسی هاتنەدی.

ئۆگست کۆنت ڕێکوپێکیی و دیسیپلینێك کە بەسەر ئەم پۆلێنبەندییەدا زاڵە، " گشـتێتی ڕوو لە کەم بوون، تێکەڵکاری و ئاڵۆزیی ڕوو بە زیادبوون" ناو دەنێ و پێی وایە هەرچـەند لـە

زانستەکانی پلەی سەروو بۆ لای زانستەکانی لای خوارووی پۆلێنبەندییەکە بچین، لە گشتێتی ئەوان کەم دەبێتەوە و بە ئاڵۆزییەکەیانەوە زیاد دەبێ و زانستی کۆمەڵناسی کە خودی کۆنت دامەزرێنەرێتی، بە سەرنجدان بەوە کە فاکتەر و دیاردەکانی توێژینەوە تێیدا بۆ مرۆڤەکان دەگەڕێتەوە و بە سەرنجدان بەوەکە گۆڕانکارییە هەمیشەییەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی و هەروەها بەستراوەیی گرووپە جیاوازە مرۆییەکان بە کولتوور و وردە کولتوورە جیاواز و فرەچەشنەکان و هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی ئەم ڕاستییە کە هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لەژێر کاریگەریی هۆکارە ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری، سیاسی و جوگرافییە جۆراوجۆرەکاندایە، لە گشت زانستەکان ئاڵۆزترە و بەشی هەر یەك لە هۆکارەکان تا ئەو جێگەیەی دەگونجێ، دەبێ دیاری بکرێ.

لە توێژینەوەکانی کۆمەڵناسی، دەبێ ئەو پێشداوەرییانەی کە دەرەنجامگیری زانستی تووشی هەڵە دەکەن، لەخۆ دوور بخرێنەوە و لە ڕوونکردنەوەی پەیوەندیی هۆکاریی نێوان دیاردەکان دەبێ خۆ لە " تاك فاکتەر بینی" دوور بگرین.

توێژەری کۆمەڵایەتی وەك زانایەکی بێلایەن و بەبێ هیچ جۆرە دادوەرییەك و ڕادەربڕینێکی تاکەکەسی، کاروبار و واقیعە کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەرییەکانی سەرچاوەگرتوو لێیان تاوتوێ دەکات و هەوڵ دەدا پەیوەندییەکانی نێوانیان بدۆزێتەوە. ئەگەر کۆمەڵناسێك ڕوانینێکی تایبەتی بۆ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی هەبێ و بچێتە ژێر کاریگەریی سوودە زانستییەکانییەوە، بێگومان ناتوانێ ڕاستیی بابەتەکان بدۆزێتەوە.

لێرەدا جیاکردنەوەی زانست لە کردار بەم مەبەستەیە کە لە توێژینەوە زانستییەکاندا نابێ لە سەرەتادا سوود و قازانجی زانستی بخرێتەڕوو. چونکە بابەتی توێژینەوە وەك ئەوەی کە هەیە، ناناسرێ و تەنیا دوای ناسینی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە کە دەتوانرێ کار بۆ چاککردنی بکرێ.

هۆی ئەوەکە هەندێك لە یاساکان کە بە مەبەستی باشترکردنی کاروبارەکانی کۆمەڵگە دادەنرێن، ڕووبەڕووی هۆکارە دژەکان دەبنەوە و تووشی شکست دەبن، ئەوەیە کە ڕیفۆرمیستی کۆمەڵایەتی و یاساداڕێژ بەبێ شارەزایی و ناسینی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە و پێداویستییەکانی، کار بۆ دانانی یاساکان و جێبەجێکردنیان دەکات. لە ئاکامدا یاسای دانراو لەگەڵ پێویستیی کۆمەڵگە گونجاو و هاوڕێك نییە و هەر ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەکە جێبەجێکردنی یاساکە تووشی کێشە و گرفت ببێتەوە.

لێرەدا گرینگیی، سوود و ڕۆڵی کۆمەڵناسی بە تەواوەتی ڕوون دەبێتەوە، چونکە کۆمەڵناس لەسەر بنەمای توێژینەوە و هەڵسەنگاندنە زانستییەکان، پێداویستییەکان و بارودۆخی کۆمەڵگەکە تێدەگات و دۆخی ئارایی کۆمەڵگە وەك ئەوەی کە هەیە، دەناسێ و دەسکەوتەکانی خۆی لەبەردەست ڕیفۆرمیستە کۆمەڵایەتییەکان و یاساداڕێژەران و جێبەجێکارانی کاروبارەکان دەنێت. بەم پێیە ئاشنابوون لەگەڵ کۆمەڵناسی بۆ کەسانێك کە کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان بە ئەستۆوە دەگرن کارێکی پێویستە و زاناکانی یاسا و ئاکار، کارناسانی کۆمەڵایەتی، بەڕێوەبەرە کۆمەڵایەتییەکان و یارمەتیدەرانی کۆمەڵایەتی هەموویان پێویستیان بە ناسینی کاروبار و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و هۆکار و شوێنەوار و دەرەنجامەکانیان هەیە.

تەنیا لە سایەی زانین و ئاگاداربوون لە دۆخی ئارایی کە دەتوانرێ بە کردەوە لە کۆمەڵگەدا بەشدار بی و بە بەکارهێنانی ڕێوشوێنی تایبەتی کە بە پێی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە جیاوازە، ڕەوشی ئارایی بگۆڕیت و بارودۆخێکی لەبار و گونجاو بەدی بێنێت.

## قۆناغەکانی توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا

توێژینەوە لە کۆمەڵناسیدا بە مەیدانی و بەڵگەنامەییەوە بە قۆناغگەلێکدا تێپەڕ دەبێ کە لە خوارەوە هەر یەك لەم قۆناغانە ڕوون دەکەینەوە:

١ـ دەستنیشانکردنی بابەتی توێژینەوە

٢ـ خستنەڕووی گریمانە

٣ـ کۆکردنەوەی زانیارییەکان

٤ـ دەرهێنان و پۆلێن بەندیی زانیارییەکان

٥ـ دروستکردن و ئامادەکردنی خشتەکان ( ئەگەر کەڵك لە شێوازی مەیدانیی وەربگیرێ).

٦ـ دۆزینەوەی پەیوەندیی هۆکردیی و گەیشتن بە تیۆری.

تەنیا جیاوازییەك کە لەنێوان توێژینەوە مەیدانی و کتێبخانەییەکاندا لە پەیوەندیی لەگەڵ قۆناغەکانی سەرەوە بوونی هەیە، پەیوەندیی بە شێوازەکانی کۆکردنەوەی زانیاری هەیە کە بە دووردرێژی قسەیان لەسەر دەکەین.

ئێستا باس لە دەستنیشانکردنی بابـەتی توێژینـەوە و خسـتنەڕووی گریمانـە و ڕێگاکـانی کۆکردنەوەی زانیاری دەکەین:

### ١. دەسنیشانکردنی بابەتی توێژینەوە

پێس هەر هەنگاوێك بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەیەك دەبێ بابـەتی توێژینەوەکـە لـە لایـەنی جۆراوجۆرەوە بناسین. لەم ناسینەدا ئەو خالانە گرینگییان پێدەدرێ:

**ئا ـ پێشینەی توێژینەوە:** توێژەر لە دەسنیشانکردنی بابەتی توێژینەوەکەی دەتوانێ سوود لە هەموو توێژینەوە ئەنجامدراوەکانی پێشووی وەربگرێ و زیاتر بەسەر بابەتەکەدا زالّ بێ.

هەروەها توێژەر دەتوانێ بە سوودوەرگرتن لە توێژینـەوەکانی پێشـوو بێجگـە لـە ناسـینی بابەتەکـە، لـەو کێشـە و گرفتانـەش تێبگـا کـە توێـژەرانی دیکـە لـە کـاتی ئەنجامـدانی توێژینەوەکانیان لەگەڵیان ڕووبەڕوو بوونەتەوە و بەم شـێوەیە خـۆی لـە هەڵـە و دووپاتـەکاری ببوێرێ و لە بەرامبەردا کەڵك لە ئەزموونەکانی پێشینیان وەربگرێ.

**ب ـ پێناسەکردنی چەمکەکان:** توێژەر بۆ ڕوونکردنەوە و شرۆڤەی بابەتی توێژینـەوە و دیاریکردنی ئەو گۆراوانەی کە پەیوەندییان بە بابەتی توێژینەکەوە هەیە، دەبێ چەمکەکانی ناو توێژینەوەکەی یەك بە یەك پێناسـە بکـات بـۆ ئـەوەی چـەمکەکان لـە یـەکتر بناسـرێنەوە و پرسیارکەران و هەموو ئەو کەسانەی کە هاوکاریی توێژەر دەکـەن بـە هۆشـیاری و سـەیتەرەی تەواو بەسـەر وردەکارییـەکانی بابەتەکـەدا خـەریکی کـاری توێژینەوەکـە بـن. لـە پێناسـەی چەمکەکاندا، زاراوە و وشەگەلی بەکارهاتوو دەبێ بە وردی پێناسە بکرێن.

بۆ نموونە لە توێژینەوەی تایبەت بە خێزان هەندێك چەمکی وەك خێزانـی فـراوان، خێزانـی ناوکی، خێزانی هەڵوەشاوە، باوك ناوی، باوك نشینی و... بـە وردی پێناسـە بکـرێن یـان لـە توێژینـەوەی تایبـەت بـە گرووپـی کۆمەلایـەتی زاراوە و چـەمکگەلی وەك "یـەکگرتوویی گرووپی"، کارلێکی دوولایەنە"، "شێوە گرووپ"، "بەشە گرووپ"، و ... پێناسە بکرێن.

**پ ـ دیاریکردنی سنووری توێژینەوە:** لە دەسنیشانکردنی بابەتی توێژینەوە، سـنووری بابەتەکەش بە شێوازێکی ڕوون و ئاشکرا دیـاری دەکرێـت و ئەمـە یـەکێك لـە بابەتـە هـەرە گرینگەکانە. چونکە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك کە سنوور و چوارچێوەیەکی ڕوونـی نـەبێ، بـە کردەوە مەیسەر نابێ و ئەگەر توێژینەوە لەسەر بابەتێك بـەبێ لەبەرچـاو گـرتنی کۆمەڵگـەی

ئاماری و سنووریکی دیاریکراو ئەنجام بدەین، دەرەنجامە وەدەست هاتووەکان بایەخێکی زانستییان نابێ.

بۆ نموونە ئەگەر بمانهەوێ توێژینەوە لەسەر خوێندکارانی زانکۆی تاران بکەین، بابەتی توێژینەوەکەمان بەربلاو و لە هەمان کاتدا زۆر لێڵ و ناڕوونە. چونکە دیاری نەکراوە کە توێژینەوەکەی ئێمە پەیوەندیی بە چ تایبەتمەندیگەلێکی کۆمەڵگەی خوێندکارانە و کام یەك لە کۆلێژ یان بەشەکان یان گرووپە تەمەنییەکانی لەخۆ دەگرێ و داخوا توێژینەوەکەی ئێمە تەنیا خویندکارە بە ڕەگەز نێرەکان دەگرێتەوە یان هەر دوو ڕەگەز لەخۆ دەگرێ و زۆر ناڕوونی و پرسیاری لەم جۆرە. بەم پێیە دەبینرێ کە ناڕوونی و پرسیاری بێئەژمار سەبارەت بە وەها بابەتگەلێك دەخرێتەڕوو کە وەڵامدانەوەی هەموویان لە لایەن توێژەرەوە پێش دەسپێکردنی توێژینەوەکە زۆر پێویستە.

دیاریکردن و سنووردارکردنی وردی کۆمەڵگەی توێژینەوە و دەسنیشانکردنی چوارچێوەی بابەتەکە، بێجگە لەوەکە دەرەنجامە وەدەسهاتووەکانی توێژینەوەکە پەسندتر و بەنرختر دەکات، توێژەر و پرسیارکەر و هەموو ئەو کەسانەی بەشداری لە توێژینەوەکەدا دەکەن، لە سەرلێشێواوی، دوودڵی و ناڕوونی ڕزگار دەکات.

**ت ـ ئامانجی توێژینەوە:** لە دەسنیشانکردنی بابەتی توێژینەوە، توێژەر دەبێ بە ڕوونی ئامانج یان ئامانجەکانی خۆی لە هەڵبژاردنی بابەت و ئەنجامدانی توێژینەوەکە ڕوون بکاتەوە و ئەو دەرەنجامانەی کە لە پەیوەندیی لەگەڵ گریمانە و گریمانەکانی توێژینەوەکە بەدوایان دایە، بە تەواوی ڕوون بکاتەوە. بەم شێوەیە ئەو و هاوکارانی لە سەرەتاوە دەزانن کە بە دوای چیدا دەگەڕێن و بۆچی؟ ئەم بابەتەش یەکێك لەو بابەتانەیە کە ڕوونبوونەوەی بۆ توێژەرەکان پێش ئەنجامدانی توێژینەوەکە گرینگییەکی زۆری هەیە. بەم پێیە بە سەرنجدان بەو چوار خاڵەی کە لە پەیوەندیی لەگەڵ دەسنیشانکردنی بابەتی توێژینەوە باسمان کردن، دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین و بە کورتی ئەوە بڵێین کە دەسنیشانکردنی بابەتی توێژینەوە بە واتای پێناسەی بابەتی توێژینەوە و ڕوونکردنەوەی ڕەهەند و تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکانییەتی.

## ٢. خستنەڕووی گریمانە

گریمانە چییە؟ پێناسەیەکی زۆر کورت و سادە کە دەتوانرێ لە گریمانە بخرێتەڕوو ئەوەیە کە بڵێین گریمانە تیۆرییەکی نەسەلمێنراوە یان بە دەستەواژەیەکی دیکە تیۆرییەکە کە ئێستا تاقی نەکراوەتەوە. بەڵام پێناسەیەکی وردتریش لە گریمانە دەکرێ بخەینەڕوو بەم شێوەیە: گومانێکە کە لە مێشکی توێژەر دەربارەی پەیوەندیی شیمانەیی هۆ و ئەنجام لە نێوان دوو یان چەند گۆڕاوێکدا بوونی هەیە. بەڵام هەر چەشنە گومانێك ناتوانرێ بە گریمانە دابنرێ، چونکە خستنەڕووی دەبێ لەسەر بنەمای هەلومەرجێك بێ کە دوای تاقیکردنەوە بتوانرێ وەك گریمانە قبووڵ بکرێ. بەواتایەکی تر ئەوەی کە ئێمە وەك گریمانە بە نیازین تاقی بکەینەوە، دەبێ لە لانیکەمی پتەوی و ئیعتبار بەهرەمەند بێ نەك وەها گومانێك کە هەر لە قۆناغەکانی سەرەتایی کۆکردنەوەی زانیاریدا بە تەواوەتی ڕەت بکرێتەوە و توێژەر بە ناچاری لە هەوڵی خستنەڕووی گریمانەیەکی دیکەدابێ. بەم پێیە بۆ خستنەڕوو و پێشکەشکردنی گریمانە یان گریمانەگەلێك کە بتوانرێ لەسەر بنەمای ئەوان توێژینەوەیەك دەست پێبکەین، دەبێ سەرنجی ئەم خاڵانەی خوارەوە بدرێ:

١ـ توێژەر دەبێ زانیاری زۆری سەبارەت بە بابەتی توێژینەوەکە هەبێ و ئەزمونگەلێکی لەم بوارەدا وەسەریەك نابێ. بۆ نموونە خستنەڕووی گریمانە دەربارەی دیاردەیەکی وەك لادانی هەرزەکارانی شاری یان گۆڕانکاریی خێزانی، پێویستی بە خاوەنڕابوون و هەبوونی ئەزموونی تەواو لە بواری توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بە تایبەت توێژینەوەکانی پێوەندیدار بە کۆمەڵناسیی شارنشینی و کۆمەڵناسی خێزانە. دیارە کەسانی ناشارەزا و ناپسپۆڕیش لەوانەیە لەم بوارەدا هەندێك گریمانە بخەنەڕوو بەڵام بە هۆی ئاگادارنەبوون و ناشارەزایی سەبارەت بە بابەتی توێژینەوەکە، شیمانەی ئەوە دەکرێ کە گریمانەکانیان تەنانەت پێش تاقیکردنەوە و بە هۆی ئەنجامدانی " بوار هەڵسەنگێنی " ڕەت بکرێتەوە. مەبەست لە " بوار هەڵسەنگێنی " قۆناخێکی کورتە کە زیاتر لە توێژینەوە مەیدانییەکان پێش خستنەڕووی گریمانە و سنووربەندی کردنی کۆمەڵگە تاووتوێ دەکرێ. لەم قۆناغەدا هەوڵ دەدرێ شارەزایی لەسەر تایبەتمەندییە

گشتییەکان و گشت ڕەهەندەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوەکە وەدەست بهێنرێت. لە توێژینەوە مەیدانییەکان جاری وایە بە جێگەی بوار هەڵسەنگێنی زاراوەی " ڕوانینی گشتی" بەکار دەهێنرێ کە مەبەست هەمان تێڕامانی گشتیی توێژەر پێش خستنەڕووی گریمانە و سنووردارکردنی کۆمەڵگەی توێژینەوەیە.

٢ـ گریمانە دەبێ بە پشت بەستن بە ژێدەر و سەرچاوەگەلێك بخرێتەڕوو کە بەکورتی باسیان لێ دەکەین:

### ئا ـ ئەزموونە کەسییەکان و زانیارییە بڵاوەکانی توێژەر

توێژەر لە کۆی زانیارییە گشتی و بڵاوەکانی کە لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوە هاوشێوەکانی خۆی لە پەیوەندیی لەگەڵ بابەتە هاوشێوەکان بەدەستی هێناوە و یان بە هۆی پەیوەندییەك کە لەگەڵ کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی هەیبووە، بۆ خستنەڕووی گریمانە دەتوانێ کەڵك وەربگرێ. بێجگە لە ئەزموونە کەسییەکان توێژەر کاتێك کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بابەتی توێژینەوەکەی نییە، دەتوانێ لە ئەزموون و زانیارییەکانی کەسانێك کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە کۆمەڵگەکەوە هەیە بۆ بەدەسهێنانی زانیارییە سەرەتاییەکان دەربارەی دیاردە و گۆڕاوەکانی کەڵك وەربگرێ. بۆ نموونە کاتێك کە بابەتی توێژینەوەکەی ئێمە لەسەر دژایەتی و پێکدادانی ڕۆڵەکان لەنێو فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتییەك یان نەخۆشخانەیەك بێ، بەبێ کۆکردنەوەی زانیارییە سەرەتاییەکان لە کەشی زاڵ بەسەر ئەو بەڕێوەبەرایەتی یان نەخۆشخانەیە، خستنەڕووی گریمانە مەیسەر نابێ. بەم پێیە لەم قۆناغەدا کە زانیارییەکانمان زۆر کەمە یان هیچ زانیارییەکمان نییە و وەها کارێکیش خراوەتە ئەستۆی ئێمە، ناچارین بۆ دەسپێکردنی کار بە ئەنجامدانی وتووێژ و پەیوەندی گرتنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لەگەڵ بەرپرسان و فەرمانبەرانی ئەو شوێنانە، کۆمەڵە زانیارییەك لەمەڕ کۆمەڵگەی توێژینەوەکەمان بەدەست بێنین بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای ئەم زانیارییانە بتوانین گریمانە یان گریمانەگەلێك بخەینەڕوو.

## ب ـ توێژینەوەکانی پێشوو

توێژینەوە ئەنجامدراوەکانی پێشوو لە بوارە هاوشێوەکاندا، لە زۆربەی بابەتەکاندا دەتوانێ هاوکارییەکی زۆری ئێمە بکات و لە زۆر لایەنەوە لە خستنەڕووی گریمانە و کاری توێژینەوەکە ڕێنوێنیمان بکات. بەم پێیە پێویستە کە توێژەر پێش خستنەڕووی گریمانە سەردانی توێژینەوە ئەنجامدراوەکانی دامەزراوە توێژینەوەییەکانی حکومی و غەیرە حکومی بکات، بۆ ئەوەی خۆی لە دووپاتەکاری یان ئەگەری خستنەڕووی گریمانەگەلێك کە پێشتر تاقی کراونەتەوە و ڕەت کراونەتەوە، دوور بگرێ. هەروەها توێژەر دەتوانێ لە تکنیك، ئۆلگوو و شێوازەکانی بەکارهاتوو لە توێژینەوەکانی پێشوو سوود وەربگرێ.

## پ ـ زانیارییە تیۆرییەکان

توێژەرێك کە بە مەبەستی گەیشتن بە پەیوەندییە هۆ و بەرهۆییەکانی نێوان گۆڕاوەکانی ناو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دەست بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەیەك دەبات، پێویستە بێجگە لە وردبوونەوەی تەواو لە کاری پرسیارکردن و سەردانی مەیدانیی و بە شێوەیەکی گشتی لە کۆکردنەوەی وردیی زانیارییەکان، بتوانێ ڕاستییەکانی ناو کۆمەڵگە یان دەرەنجامە وەدەسهاتووەکان بە زمانی کۆمەڵناسیی دەرببڕێ و بە ڕوانگەیەکی کۆمەڵناسانە ڕوونیان بکاتەوە.

لەڕاستیدا جیاوازیی نێوان بینەرێك کە ڕاستییەکان دەبینێ و توانای شیکردنەوەیانی نییە لەگەڵ بینەرێك کە هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بە وردبینی و تێفکرین و ڕوانگەیەکی زانستی هەڵدەسەنگێنێ، ئەوەیە کە بینەری یەکەم زانیاریی تیۆریکی دەربارەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان نییە لە حاڵێکدا کە بینەری دووەم خاوەنی زانیاریی تیۆریکی بەربلاو لەم بوارە دایە و هەر دیاردە یان ڕووداوێکی ناو کۆمەڵگە بە دەربڕینێکی زانستی پێناسە دەکات و لە پەیوەندییەکی هۆکردیدا بە دیاردەکانی دیکەیان دەبەستێتەوە.

بۆ نموونە زۆرجار ئەو توێژەرانەی کە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەکانی تایبەت بە کۆمەڵگەی گوندنشینی سەردانی گوند دەکەن، بەدوای ئەو کەسانەدا دەگەڕێن کە توانای دەربڕین و وەسفکردنی کێشە و ڕووداوەکانی ناو گوندەکەیان هەبێ و دەتوانن زانیاریی زۆر لەبەردەستی

توێژەرەکان بنێن. لەم نێوەدا کەسانێك هەن کە بە بەراورد لەگەڵ دانیشتووانی گوند، ئاستێکی بەرزی خوێندەواری و زانیاریی کۆمەڵایەتییان هەیە بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانی زۆر، بە دەگمەن شارەزایی تەواو و ڕوانینی قووڵیان لە دیاردە و ڕووداوەکان هەیە. زانیارییەکانی ئەوان لە کاروبار و ڕووداوەکانی ڕۆژانەی کۆمەڵگەی گوندنشینی لە ئاستێکی زۆر نزمدایە و جاری وایە بە هۆی نەبوونی ڕوانینێکی بەرفراوان و زانیاریی تیۆریك توانای شیکردنەوەی دیاردەکانی دەوروبەری خۆشیان نییە. ئاشکرایە کە هەبوونی زانیاریی تیۆریك و ئاشنابوون لەگەڵ چەمك و زاراوە و پێناسەی دیاردەکان و فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان تەنیا لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێب، وتار و دەرەنجامی توێژینەوە زانستییەکان بە سەرچاوە ناوخۆیی و دەرەکییەکانەوە مەیسەر دەبێ. توێژەرێك کە ڕوانین و ڕوانگە و هەڵسەنگاندنێکی تەواو کۆمەڵناسانەی نییە، لەوانەیە تێڕامان بۆ دیاردەکان بکا بەڵام توانای ڕوونکردنەوە و ئاراستەکردنی هۆکردیی ئەوانی نەبێ و تەنیا لە حاڵەتێکدا کە شارەزای شێوازەکانی توێژینەوە بێ لەوانەیە بتوانێ وێنەیەکی ناتەواو و ناکامڵ لە کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی بخاتە بەردەست و هیچی تر. پەرەنەستاندنی توێژینەوەکانی کۆمەڵناسانە لە ئێران دەتوانرێ زیاتر لە پەیوەندیی لەگەڵ ئەم ڕاستییە سەیر بکرێ کە بە هۆی لاوازیی زانیارییە تیۆریکەکان، کاری توێژەرانی دامەزراوەکانی توێژینەوە، لە توێژینەوەی وەسفی بەولاوەتر نەچووە.

### ٣. کۆکردنەوەی زانیاری

سێیەمین قۆناغ لە کاری توێژینەوە کە بە قۆناغێکی زۆر گرینگیش دێتە ئەژمار، ئەو کاتەیە کە دوای ئەنجامدانی کارە سەرەتاییەکان، واتە دەسنیشانکردن و دیاریکردنی کۆمەڵگەی توێژینەوە و خستنەڕوو و ڕێکخستنی گریمانەکان بە کەڵك وەرگرتن لە تکنیکە تایبەتەکان، زانیاریی و داتای پێویست لە کۆمەڵگەی توێژینەوەکە کۆ بکەینەوە.

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، تکنیکەکانی شێوازی توێژینەوەی چڕ کە لە خەڵکناسییدا بەکار دێن جیاوازییان لەگەڵ تکنیکەکانی شێوازی توێژینەوەی فراوان هەیە و لەبەر ئەوەی باسکردن و شیکردنەوەی هەموو تکنیکەکانی پەیوەندیدار بە شێوازی توێژینەوەی فراوان و چڕ لەم باسەدا ناگونجێ و خۆی لە خۆیدا پێویستی بە نووسینی کتێبی جیاواز و سەربەخۆیە، بۆیە ئێمە لێرەدا تەنیا باسی گرینگترینەکانیان دەکەین:

### ١. پرسیارنامە

پرسیارنامە یەکێك لە شێوازە باوەکانی کاری توێژینەوەیە و لە کۆمەڵناسیدا زیاتر لە هەر ڕێگەیەکی دیکە سوودی لێ وەردەگیرێ.

پرسیارنامە بە شێوازگەلی جۆراوجۆر کەڵکی لێوەردەگیرێ کە بریتین لە:

### ئا ـ ڕێکخستنی پرسیارنامە لەگەڵ چاوپێکەوتن

لەم شێوازەدا توێژەر خۆی پرسیارنامەکە بەدەستەوە دەگرێ و پرسیارەکان بەدوای یەکتردا دەخاتەڕوو و دوای وەڵامدانەوەی پرسیارەکان لە لایەن وەڵامدەرەوە لە پرسیارنامەکەدا دەیاننووسێ.

کەڵك وەرگرتن لەم جۆرە پرسیارنامەیە زیاتر لەو کۆڕ و کۆمەڵگەیانەدا باوە کە ئاستی خوێندەواری و زانیارییە گشتییەکان تا ڕادەیەك نزمە و وەڵامدەرەوەکان بە تەنیایی توانای خوێندنەوەی پرسیارەکان و تێگەیشتنی چەمکەکانیان نییە. لەو بابەتانەشدا کە وەڵامدانەوە بە پرسیارێکی دیاریکراو بۆ نموونە ڕێژەی داهاتی ساڵانەی بنەماڵەیەکی شاری یان ڕێژەی بەکارهێنانی مانگانە یان ساڵانەی قەند و شەکر یان برینجی بەکارهاتوو یان تەنانەت حسێب کردنی ڕادەی زەوییە داچێنراوەکانی بنەماڵەیەکی گوندنشین لەو ناوچانەی کە یەکە و پێوانەی فەرمی ئێستا بە شێوەیەکی باو سوودیان لێ وەرنەگیراوە، بۆ وەڵامدەرەوەکان زۆر دژوارە بە شێوەیەك کە بە تەنیایی ناتوانن وەڵامی وەها پرسیارگەلێك بدەنەوە.

بەم پێیە بەکارهێنانی وەها شێوازێك کە لە هەمان کاتدا دەتوانرێ سوود وەرگرتن لە "پرسیارنامە لەگەڵ چاوپێکەوتن"ی پێبگوترێ، لە باوترین شێوازەکانی سوود وەرگرتن لە پرسیارنامە لە ئێراندایە کە لە لایەن دامەزراوەکانی توێژینەوە بەکار هێنراوە. کەڵك وەرگرتن لە پرسیارنامە لەگەڵ چاوپێکەوتن بە زۆری و بە تایبەت لە کۆمەڵگە عەشیرەتی، گوندنشینی و کرێکارییەکاندا زۆر باوە.

### ب ـ ڕێکخستنی پرسیارنامە بەبێ چاوپێکەوتن

لەم شێوازەدا پرسیارنامە لە لایەن وەڵامدەرەوە تەکمیل دەکرێ و توێژەر چاوەدێری بەسەر کاری تەکمیل کردنی پرسیارنامەکەدا دەکات. زیاتر لە بابەتانەدا کەڵك لەم شێوازە وەردەگیرێ کە وڵامدەرەوەکان لە گرووپە خوێندەوارەکان و بەهرەمەند لەئاستێکی مامناوەندیی زانیارییە کۆمەڵایەتییەکان بن.

توێژەر، پرسیارنامەکەیان لەنێودا بڵاو دەکاتەوە و تەنیا لەو بابەتانەدا کە پێویستە ئەو ناڕوونییانەی کە لەوانەیە بێنەپێشەوە، بۆ وەڵامدەرەوەکان شی دەکاتەوە. دیارە لەم شێوازەدا پێش خستنەڕووی پرسیارەکان توێژەر بە پێشەکییەکی کورت کە لە لاپەڕەی یەکەمی پرسیارنامەکەدا دەیخاتەڕوو، ئامانج و بۆچوونەکانی خۆی لە پەیوەندیی لەگەڵ خستنەڕوو و تەکمیل کردنی پرسیارنامەکە و توێژینەوەکەی خۆی شی دەکاتەوە. وەڵامدەرەوە دڵنیا دەکاتەوە کە خستنەڕووی پرسیارەکانی پەیوەندییان بە توێژینەوەیەکی زانستییەوە هەیە و هیچ ئامانجێکی دیکەی لە ئەنجامدانی ئەو کارە نییە. دیارە بۆ وەدەسهێنانی متمانەی زیاتری وەڵامدەرەوەکان و لابردنی بەدگومانی یان ناڕوونییە شیمانەییەکان لە زەینی ئەوان باشترە کە پرسیارنامە، بەبێ نێو دابڕێژرێ و لە لاپەڕەی یەکەمی پرسیارنامەکەشدا دەستەواژەی " بەبێ ناو" بە دیاریکراوی بنووسرێ.

لەو بابەتانەی کە ئیمکانی ئەوە هەیە کە وڵامدەرەوەکان لە هۆڵ یان ژوورێکی دیاریکراودا کۆ بکەینەوە و پرسیارنامەکەیان لەنێودا دابەش بکەین و دواتر شیکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بە ئامانج لە تەکمیل کردنی پرسیارنامەکە و ئەنجامدانی توێژینەوەکە بخەینە ڕوو، کاری دڵنیاکردنی وەڵامدەرەوەکان ئاسانتر دەبێ و دابەشکردن و تەکمیل کردن و کۆکردنەوەی پرسیارنامەکەش ئاسانتر دەبێ.

### ج ـ ناردنی پرسیارنامە لە ڕێگەی پۆستەوە

لە هەندێك بابەتیشدا پرسیارنامەکە لە ڕێگەی پۆستەوە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوەکە ڕەوانە دەکرێ. زیاتر دامەزراوەکانی هەڵسەنگاندنی بیروڕاکان سەر بە دامودەزگا حکومییەکان یان ڕێکخراوە تایبەتییەکان، سوود لەم شێوازە وەردەگرن. بەڵام کاری

پرسیارنامەی پۆستی لە تەواوی کوڕ و کۆمەڵگەکان مەیسەر نابێ، چونکە لە زۆربەی بابەتەکاندا بە ئاسانی وەڵام وەرناگرنەوە. زیاتر ئەم جۆرە پرسیارنامەیە بە پرسیارگەلی کەمتر دەخرێتەڕوو و توێژەر دەبێ هەوڵ بدات بۆ ئەوەی لە پرسیارەکاندا، بچوکترین ناڕوونییەك بۆ وڵامدەرەوە نەیەتە پێش.

توێژەر پیشەکییەکی کورت کە ئامانجەکانی ڕوون دەکاتەوە، بەو پرسیارنامەیە زیاد دەکات و لەناو پاکەتێکدا کە ناونیشانی دامەزراوەی توێژینەوەکە یان توێژەرەکەی لەسەر نووسراوە و تەمری پۆستیشی لەسەر دراوە، بۆ وڵامدەرەوەکان ڕەوانە دەکرێ. کەڵك وەرگرتن لە پرسیارنامەی پۆستی لەو بابەتانەدا بە سەرکەوتوویی دەردەچێت کە وڵامدەرەوەکان ئاشنایەتییان لەگەڵ پرسیارنامە و توێژینەوە هەبێ و لە ئاستی خوێندەواری و زانیاریی تا ڕادەیەك بەرز بەهرەمەند بن. لە لایەکی دیکەوە وەها پرسیارنامەیەك دەبێ لەژێر ناونیشان و لە لایەن دامەزراوەیەکی زانستی خاوەن ئیعتبارەوە بنێردرێ بۆ ئەوەی وڵامدەرەوەکان لە وەڵامدانەوەیاندا کەمتر تووشی دوودڵی بن و لێی دڵنیا بن.

## جۆرەکانی پرسیارنامە

پرسیارنامە بە چەند جۆرێك دابەش دەکرێ کە بەناوبانگترینیان دابەشکردنی پرسیارنامە بە دوو جۆر پرسیاری کراوە و پرسیاری داخراوەوەیە.

**ئا ـ پرسیارنامە بە پرسیاری کراوە        ب ـ پرسیارنامە بە پرسیاری داخراو**

پرسیارەکان لە پرسیارنامەی جۆری یەکەم بە شێوەیەکن کە وەڵامدەرەوە ئازادە و دەتوانێ بە ئاسانی بۆچوون و بیروڕاکانی خۆی دەربڕێ. بۆ نموونە لەو کاتانەی کە بۆچوونی وڵامدەرەوە سەبارەت بە ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی دەپرسین و پرسیارەکانی خۆمان بە دەستەواژەی وەك " بە بۆچوونی ئێوە ..." یان " تکایە بۆچوونی خۆتان لەم بارەوە دەربڕن"، دەست پێدەکەین، پرسیارەکانی ئێمە لە جۆری پرسیارە کراوەکان دێنە ئەژمار.

بەڵام پرسیارێك کە پێشتر چەند وەڵامی بۆ هەڵبژێردراوە و دیاری کراوە، پرسیاری داخراوی پێدەگوترێ. پرسیارە چوار وڵامییەکان یان زیاتر کە زۆرجار لە تاقیکردنەوەکاندا سوودیان لێ وەردەگیرێ لە جۆری پرسیارە داخراوەکانن. بەڵام پرسیارە داخراوەکانیش چەند جۆرێکیان هەیە کە گرینگترینیان بریتین لە:

پرسیارە دوو وەڵامییەکان، پرسیارە چەند وەڵامییە سادەکان و پرسیارە چەند وەڵامییە پلەبەندیکراوەکان، پرسیارە زۆرەکانی هەڵسەنگاندنی بیروڕا، پرسیارەکانی پلەبەندی و لێهاتوویی.

## لایەنە باش و خراپەکانی پرسیارە کراوە و داخراوەکان

هەریەك لە پرسیارە کراوە و داخراوەکان خاوەنی کۆمەڵێك لایەنی باش و خراپن کە بە کورتی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

١ـ لایەنی باشی پرسیارە کراوەکان ئەوەیە کە وەڵامدەرەوە لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، لە ئازادیی کردەوەی بەرفراوان بەهرەمەندە و بە دوور لە هەر سنووردارێتی و لەمپەرێك وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە.

٢ـ لەو توێژینەوانەی کە توێژەر لایەنەکانی سۆزداری، هەستی، بیروباوەڕ یان پاڵنەرەکان لەبەرچاو دەگرێ، پرسیارە کراوەکان باشتر دەتوانن ئەو بە وڵامی خاترجەمتر و وردتر بگەیەنن. بۆ نموونە، لە توێژینەوە دۆزینەوەییەکان بێجگە لەو پرسیارانەیکە داخراوبوونیان خێرایی بە کاری پرسیارکردن دەبەخشن و پێش لە بەفیڕۆچوونی کات دەگرن ( وەك تەمەن، ڕەگەز، ژمارەی منداڵەکان، پلەی خوێندەواری، ڕەوشی خێزانداری و ...) دەبێ زیاتر لە پرسیارە کراوەکان کەڵك وەرگیرێ.

٣ـ دەرهێنان و پۆلێنکردنی وەڵامەکانی پرسیارە داخراوەکان هەم بە شێوازی دەستی و هەم بە ئامرازی دیکە زۆر ئاسانتر و خێراتر لە پرسیارە کراوەکان ئەنجام دەدرێ. لە حاڵێکدا کە دەرهێنان و پۆلێنکردنی وڵامی پرسیارە کراوەکان بە هۆی ئەوەکە وڵامەکان زۆر جۆراوجۆر و فرەچەشنن، کارێکی زۆر ئەستەمە.

٤ـ یەکێکی دیکە لە کەموکوڕییەکانی پرسیارە داخراوەکان ئەوەیە کە لەوانەیە وڵامی دیاریکراو بە زەینی وڵامدەرەوەدا بێنێ. لە حاڵێکدا کە لە پرسیارە کراوەکاندا، وەڵامدەرەوە بە هیچ جۆرە وڵامێك هان نادرێ بەم پێیە زەینی وڵامدەرەوە سەربەخۆ و دوور لە هەر چەشنە تەڵقینێك، بەدوای وڵامەکەدا دەگەڕێ.

## ڕێکخستنی پرسیارنامە و ژمارەی پرسیارەکان

لــە ڕێکخســتنی پرســیارنامە دەبــێ زۆر بــە وردیــی کــار بکــرێ، چــونکە کۆکردنــەوەی زانیارییەکان لە ڕێگەی پرسیارنامە یەکێك لە قۆناغە هەرە گرینگەکانــە کــە ســەرکەوتن یــان سەرنەکەوتن لە توێژینەوەدا تا ڕادەیەکی زۆر بــە گرینگیــدان بــە دروســتکردن و ڕێکخســتنی پرسیارەکان بەستراوەتەوە. لە خوارەوەدا ئاماژە بە چــەند خــاڵێکی گــرینگ لــەم پێوەندییــەدا دەکەین:

١ـ یەکێك لەو خاڵە گرینگانەی کە دەبێ لە ڕێکخســتنی پرســیارنامەدا بــە تــەواوی لەبەرچــاو بگیرێ، شێوازی دانانی پرسیارەکان لــە پرســیارنامە دایــە ( لــە ســەرەتا یــان لــە کۆتــایی دانــانی پرسیارەکان). بەم شێوەیە کە ئەو پرسیارە سادانەی کە وەڵامدەرەوە دەتوانێ خێراتر وڵامیان بداتــەوە لە سەرەتادا بهێنرێن و بە دەستەواژەیەکی دیکە، لە خستنەڕووی پرسیارەکان دەبێ هــەوڵ بــدرێ لــە پرسیارە سادەکانەوە دەست پێبکرێ و وردە وردە بە پرسیارە ئاڵۆزترەکان بگەین.

٢ـ گرینگیدان بە پرسیارە هەستیارەکان، لە ڕێکخستنی پرسیارنامەدا بە هێنانــەوەی دوو دەستە پرسیار کە ئێمە لەژێر ناوی پرسیارە هەستیار و پرسیارە دژوارەکان ناویان دەبەین، دەبێ گرینگییەگی زیاتر بدرێ.

پرسیارە هەستیارەکان ئەو پرسیارانەن کــە زۆربــەی کاتــەکان وڵامــدەرەوەکان حــەزیان لــە وڵامدانەوەیان نییە و بەم پێیە وڵامی دروست وەرگرتنەوە لە وەها پرسیارگەلێك کارێکی ئاسان نییە. ئەم پرسیارانەش بەسەر دوو جۆردا دابەش دەبن:

**یەکەم**/ ئەو پرسیارانەی کە لە باری کولتوورییەوە هەستی کەسەکان دەورووژێنن. دووهەم/ ئەو پرسیارانەی کە لە باری ئابووری و داراییەوە هەستیارن.

پرسیارەکانی جۆری یەکەم بە تایبەت لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا و هەروەها ســەبارەت بــە کەسانێك کە شارەزاییان لە توێژینەوە و ئامانجەکانی نییــە، لەوانەیــە هەنــدێك کێشــە بێننــە کایەوە و کاری توێژینەوەکە تووشی گرفت و ڕاوەستان بکەن.

لەو کاتانەدا پێویستە بە سەرنجدان بە کۆمەڵگەی توێژینەوە و تایبەتمەندییە کولتــووری و دەروونییەکانی وەڵامدەرەوەکان، ڕێکوپێکی و پاش و پێشیی بابەتەکانی جێگــەی پرســیار بــە تەواوی ڕەچاو بکرێن. بۆ نموونە کاتێك کە توێژەر بە نیازی تەکمیلی پرســیارنامەی خێزانێکــی گوندنشینی هەیە، دەسپێکی پرسیارکردنی ناوبراو نابێ بە خستنەڕووی پرسیارگەلی تایبەتی و

بنەماڵەیی وەڵامدەرەوە بێ. وا باشترە ئەو جۆرە پرسیارانە کاتێك بخرێنەڕوو کە متمانە و خاترجەمییەکی دوولایەنە پێك هاتبێ و شك و گومانی شیمانەیی نێوانیان بسڕێتەوە. لە غەیری ئەم حاڵەتەدا کەسانێك کە ئامانج لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانیان بۆ ڕوون نییە و یان خاوەنی ڕووحییەیەکی کۆنەپارێزانەی توندن، لەوانەیە تووشی ترس و دڵەڕاوکێ ببن و لە وڵامدانەوەی پرسیارەکانی دیکە خۆ دوور بگرن یان جۆرە وڵامێك بدەنەوە کە بەبۆچوونی خۆیان جێی دڵخۆشی و پەسندی پرسیارکەرن. ڕۆشکرایە کە ئەم جۆرە وەڵامانە خاوەن وردیی و ئیعتباری پێویست نین.

٣ـ پرسیارە دژوارەکان

پرسیارە دژوارەکان بەو پرسیارانە دەگوترێن کە وەڵامدانەوەیان پێویستی بە ئەنجامدانی هەڵسەنگاندنێکە کە وەڵامدەرەوە بە ئاسانی ناتوانێ وەڵامیان بداتەوە و بە سەرنجدان بەوەکە وەڵامدانەوەی هەر یەك لەم پرسیارانە کاتێکی زۆری پێویستە، لە لایەك دەبێتە هۆی ماندوویێتی وەڵامدەرەوە، و لە ئاکامدا چلۆنایەتی کارەکە دادەبەزێ و لە لایەکی دیکەوە، کاری پرسیارکردنیش دوور و درێژ دەکاتەوە. پرسیارگەلێك لە پەیوەندیی لەگەڵ ڕادەی داهات سەبارەت بەو کەسانەی خاوەنی پیشەی ئازادن، ڕادەی بەکارهێنانی ساڵانە یان مانگانەی هەندێك لە ماددە بەکارهاتووەکانی خێزانێك، گۆڕینی پێوانە و پێوەرە ناوچەییەکان بە پێوەرە فەرمییەکان، هەڵسەنگاندنی دەرەنجامی کار (بازدە) لە هیکتاردا و داهاتی بەرهەم هاتوو لە زەوییە داچێنراوەکانی خێزانێکی وەرزێر، چەند نموونەیەك لەپرسیارە دژوارەکانن. لە وەها بابەتگەلێکدا لەکاتی دروستکردن و ڕێکخستنی پرسیارنامەدا پێویستە گرینگییەکی ورد و تەواو بدرێ و هەتا دەکرێ هەوڵ بدرێ ئەم جۆرە پرسیارانە نەك لە سەرەتای کاردا، بەڵکوو بەرەبەرە و لە ناوەڕاست یان کۆتایی پرسیارنامەکەدا بگونجێنرێن.

" موریس دوورژە" کۆمەڵناسی فەڕەنسی لە بواری مەرجەکانی ڕێکخستنی پرسیارنامەدا دەنووسێ:" پرسیارنامە زنجیرە پرسیارێك نییە کە بە هۆیانەوە لە سەرەوە هەتا خوارەوەی کاغەزێك بێئەوەی کە گرینگییەك بە ڕێکوپێکییەکەیان بدرێ، پڕ کرابێتەوە. بە پێچەوانەوە، ڕێکخستنی پرسیارنامە لەسەر بنەمای ڕێکوپێکییەکە کە بە شێوەیەکی جیددی تاوتوێ کرابێ..."

هەر لەم بوارەدا "موریس دوورژە" ئەوەش زیاد دەکا کە " زۆربەی کاتەکان لە سەرەتای پرسیارنامەکاندا، جۆرە پرسیارێك دادەنێن کە بۆ تاووتوێکردن گرینگییەکی ڕاستەوخۆیان نەبێ

و ئامانجیان ئەوە بێ کە وڵامدەرەوە بێنێتە زەوق و متمانەی ئەو ڕابکێشێ. دیارە توێژەران دەبێ بە تەواوی ئاگادار بن و بە هەر شێوەیەك بێ ئەم ژینگە پڕ لە متمانەیە دروست بکەن. کاتێك کە بڕیار بێ هەندێك پرسیاری هەستیار بخەنەڕوو، بە گشتی لە کۆتایی پرسیارنامەکەدا دەیانهێنن. لە کۆتایی پرسیارنامەدا وەڵامدەرەوە متمانەی لەلا دروست بووە و توێژەر شانسی زیاتری هەیە کە وەڵامی دروست بەدەست بێنێ. لە هەر حاڵەتدا ئەگەر وەڵامدەرەوە نارەحەتیش بێ، ئەم نارەحەتییە لەسەر ئەو پرسیارانەی کە پێش ئەوە لێی کراوە، کاریگەریی نەرێنی دانانێ. ئەگەر چەندین پرسیاری هەستیار بوونیان هەبێ، دەبێ لەنێوان پرسیارەکانی پرسیارنامەدا وەها بڵاو بکرێنەوە کە هەر یەکێکیان ڕەوشێکی هێدیتر بەخۆوە بگرن ...(٤)

### ٢. تێڕامان

تێڕامان یەکێك لەو شێوازانەیە کە زیاتر لە توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکاندا سوودی لێوەردەگیرێ، لە هەمان کاتدا هەندێکجار لە کۆمەڵناسیشدا، بەکار دێت. دیارە لە تکنیکی تێڕامان لەو بابەتانەدا زۆرتر کەڵك وەردەگیرێ کە نموونەوەرگرتن و بەکارهێنانی پرسیارنامە بە کردەوە جێبەجێ نەکرێ. بۆ نموونە کاتێك کە بە نیازی توێژینەوەی جێگۆڕینە وەرزییەکانی یەکێك لە عێلەکان لە کوێستان بۆ گەرمێن بین، کەڵك لەم شێوازە وەردەگرین.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ تێڕامان بە دوو جۆر دابەش بکرێ:

**یەکەم**/ تێڕامان بە بەشداریی ڕاستەوخۆ و چالاکانەی توێژەر لە کۆمەڵگەی توێژینەوە.

**دووەم**/ تێڕامان بەبێ بەشداریی توێژەر.

١ـ تێڕامان لە جۆری یەکەم لە بابەتێکدا دروست دەردەچێ کە توێژەر خۆی ئەندامێکی کۆمەڵگەی توێژینەوەکە بێ و بەم پێیە وەك تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە لەڕاستیدا خۆیشی لە چوارچێوەی توێژینەوەیەکدا جێدەگرێ کە دەیهەوێ ئەنجامی بدات. بۆ نموونە، توێژەرێك کە خۆی دانیشتووی ناوچەیەکە و بە نیازە توێژینەوە لەسەر هەندێك لە ڕەفتارەکانی گرووپێك یان ڕێوڕەسمێکی تایبەتی خەڵکی ئەو ناوچەیە بکات، زۆرجار بەبێ ئەوەی کە ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگەیە ئاگاداری توێژینەوەی ئەو بن، ڕەفتاری خەڵك دەخاتە ژێر چاوەدێری و بە کەڵك وەرگرتن لەهەندێك ئامرازی وەك کامێرای وێنەگرتن، کامێرای فیلم هەڵگرتنەوە و فیشەکانی تۆمارکردنی ڕووداوەکان و ... خەریکی تاوتوێ و توێژینەوەی ئەو کۆمەڵگەیە دەبێ.

لەم جۆرە تێڕامانەدا توێژەر وەك ئەندامێکی کۆمەڵگەیە، بێجگە لەوەکە دەرەتانێکی زۆری بۆ سەرنج و وردبوونەوە لە ڕەفتارە گرووپییەکانی خەڵکی خۆی هەیە، لەم ئیمتیازەش بەهرەمەندە کە تاکەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی، لە بەرامبەر ئەودا ڕەفتاری سروشتی خۆیان لەدەست نادەن و بەم پێیە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ڕووداوەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بەو شێوەیە کە هەن، دەبێتەوە. لە وەها شێوازێکدا کاتی کۆکردنەوەی زانیارییەکان، کاتێکی دیاریکراو نییە بەڵکوو توێژەر لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە لە کۆمەڵگەی توێژینەوەکەیدا بەسەر دەبات، دەتوانێ خەریکی تێڕامان بێ.

٢ـ لە جۆری دووەمی تێڕاماندا، تویژەر ئەندامی کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی نییە، بەڵکوو لە دەرەوە دەچێتە ناو ئەو کۆمەڵگەیەوە.

لە وەها بابەتگەلێکدا کێشە و گرفتەکانی توێژینەوە زۆر زیاتر لە جۆری پێشوویە، چونکە هاتنەناوەی توێژەر بۆ کۆمەڵگەی توێژینەوەکەی، هەندێك پەرچەکردار لەنێو تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە دێنێتە کایەوە کە گۆڕان لە ڕەفتاری سروشتیی ئەوانی لێ دەکەوێتەوە. تێڕامانی جۆری یەکەم دەتوانێ بە جۆرێك فیلم هەڵگرتنەوە و وێنەگرتن بشوبهێنرێ کە بەبێ پێشەکی و لەناکاو لە لایەن کەس یان کەسانێکەوە ئەنجام دەدرێ، بەم پێیە ڕەفتاری خەڵکێك کە لە پێش کامێرای فیلم هەڵگرتنەوە ڕاوەستاون، بە تەواوی سروشتییە. بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا پەرچەکرداری سەرچاوەگرتوو لە ترس، دوودڵی، گومان و ناڕوونی دەبێتە هۆی ئەوەکە دەرەنجامەکانی توێژینەوە ئیعتبار و دڵنیایی خۆی تا ڕادەیەك لەدەست بدات. بۆ لابردنی ئەم کێشەیە، توێژەر لە سەرەتای هاتنەناوی بۆ کۆمەڵگەیەك کە بە نیازە توێژینەوەی لەسەر بکات، دەبێ بۆ وەدەسهێنانی متمانەی خەڵکی ئەو کۆمەڵگەیە هەوڵ بدا و ئەو شك و دوودڵییەی کە لەوانەیە بە هاتنەناوەوەی ئەو بۆ کۆمەڵگەکە بێتە ئاراوە، لە زەینەکان بسڕێتەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، توێژەر دەبێ کاتێك کاری خۆی دەست پێبکا کە تاکەکانی کۆمەڵگە لە ئامانج و مەبەستی زانستیی ئەو تێبگەن و بەبێ ترس وڵامی پرسیارەکانی بدەنەوە.

لەڕاستیدا چونکە شێوازی تێڕامان زیاتر لە لایەن ئەنترۆپۆلۆژییەکان و لە توێژینەوەی کۆمەڵگە سەرەتایی و سنووردارەکان بەکار دەهێنرێ، پێویستە ئەو توێژەرانەی کە سوود لەم تکنیکە وەردەگرن، بارودۆخ و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی توێژینەوەکە و خەڵکەکەی بە

وردی لەبەرچاو بگرن و پێش هەر جۆرە نزیکبوونەوەیەك لە خەڵك، کەشێکی دۆستانە و پڕ لە دڵنیایی بۆ درێژەدانی کاری خۆیان پێك بێنن.(٥)

لە هەر دوو جۆری تێڕامانـدا، زانیارییـەکان کـە لـە سـەرەتادا بـە شـێوە یادداشـتگەلی پرش‌وبڵاو کۆکراونەتەوە، دەبێ لە فیشە بابەتییە تایبەتـەکان کـە بـۆ ئـەم مەبەسـتە ئامـادە کراون، بگوازرێنەوە و دواتر پۆلێنبەندیی بکرێن. شـێوازی کـەڵك وەرگـرتن لـەم فیشـانە لـە شێوازی بەڵگەنامەییدا شی دەکرێتەوە.

### ٣ـ کەڵك وەرگرتن لە فیش (بەرگە) لە توێژینەوە بەڵگەنامەییەکاندا

هەروەك پێش ئێستا ئاماژەمان پێکرد، لەو توێژینەوانەدا کە توێژەر ناتوانـێ بـە شـێوەی ڕاستەخۆ پەیوەندیی لەگەڵ دیاردەکۆمەڵایەتییەکان یان کۆمەڵگـەی توێژینەوەکـە هـەبێ، لـە کۆکردنەوەی زانیارییەکاندا سوود لە بەڵگەنامە و دۆکیۆمێنت و کتێبەکان وەردەگرێ کـە ئـەم جۆرە توێژینەوانە بە بەڵگەنامەیی یـان کتێبخانـەیی ناسـراون. لـەم جـۆرە توێژینەوانـەدا بـۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان، سوود لە ئامرازێك بە ناوی "فیش" وەردەگیرێ و شێوازەکەش فیش هەڵگرتنەوەی پێدەگوترێ. فیشی بەکارهێنراو لە توێژینـەوە کتێبخانەییەکانـدا بـە دوو جـۆر دابەش دەبێ:

**یەکەم/ فیشی سەرچاوەکان ( ژێدەرەکان)** **دووهەم/ فیشی بابەتی (بابەتەکان)**

### ئا ـ فیشی سەرچاوەکان ( ژێدەرەکان)

فیشی سەرچاوەکان فیشێکە کە ناسنامەی کتێب، نامیلکە یان بەڵگـەی بـەکارهێنراو لـە توێژینەوەکاندا لەسەری دەنووسرێ. لە کوتە کاغـەزێك یـان کارتۆنێـك بـە درێـژایی دوازدە و پانایی هەشت سانتی میتر دەتوانرێ فیشێکی سەرچاوەکان دروست بکرێ. فیشی سەرچـاوەکان ئەم خاڵانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێ:

ـــ ناوی نووسەر

ـــ ناوی کتێب

ـــ ناوی وەرگێڕ ( لە حاڵەتێکدا کە کتێبەکە لە زمانێکی بیانییەوە وەرگێڕدرابێ)

ـــ شوێنی بڵاوکردنەوە

ـــ ناوی ناوەندی بڵاوکردنەوە

ــ چاپ ( له حاڵەتێكدا كه كتیبه‌كه دوو یان چه‌ند جار چاپ كرابێته‌وه، ده‌نووسرێ)
ــ ساڵی بڵاوبوونه‌وه
ــ قه‌واره ( گیرفانی، وه‌زیری و ...)
ــ ژماره‌ی لاپه‌ڕه‌كان
له بابه‌تێكدا كه كتێبه‌كه ده‌گمه‌نه، ده‌بێ ناوی كتێبخانه یان شوێنێك كه كتێبه‌كه‌ی تێدا ده‌ست ده‌كه‌وێ، بنووسرێ)

توێژه‌ر دوای ده‌سنیشانكردنی بابه‌تی توێژینه‌وه و هه‌ڵبژاردنی كۆمه‌ڵگه‌ی توێژینه‌وه و ئه‌نجامدانی قۆناغه سه‌ره‌تاییه‌كان ده‌بێ گشت ژێده‌ر و سه‌رچاوه‌گه‌لێك كه له په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ بابه‌تی توێژینه‌وه‌كه بوونیان هه‌یه، كۆ بكاته‌وه و به دیاریكراوی هه‌ر یه‌كێكیان له‌سه‌ر فیشێك بنووسێ. به‌م شێوه‌یه له په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵ بابه‌تی توێژینه‌وه‌كه به ده‌یان و جاری وایه به سه‌دان فیشی سه‌رچاوه كۆ ده‌كرێته‌وه كه سه‌رچاوه‌كانیان به ڕیزبه‌ندییه‌كی تایبه‌ت كه‌ڵكیان لێ وه‌رده‌گیردرێ.

## ب ـ فیشی بابه‌تی

فیشی بابه‌تی فیشێكه كه بۆ ده‌رهێنانی ناوه‌ڕۆكی كتێب و نامیلكه‌كان سوودی لێ وه‌رده‌گیردرێ. له ئه‌ندازه‌ی جیاجیادا دروست ده‌كرێ به‌ڵام باوترینیان ئه‌و فیشه‌یه كه به درێژایی پازده و پانایی ده سانتی مه‌تر دروست ده‌كرێ. ناوه‌ڕۆكی ئه‌و كتێب و نامیلكانه‌ی كه پێشتر وه‌ك توێژینه‌وه له فیشی سه‌رچاوه‌كان دیاری كراون، به پێی بابه‌ته سه‌ره‌كی و لاوه‌كییه‌كان له فیشه بابه‌تییه‌كانیاندا ده‌نووسین و به‌م شێوه‌یه ده‌توانین له كۆتایی قۆناغی كۆكردنه‌وه‌ی زانیارییه‌كان، پوخته‌ی سه‌رچاوه ده‌رهێنراوه‌كانمان به شێوه‌ی سه‌دان و هه‌زاران فیشی بابه‌تی له‌به‌رده‌ست دابێ.

پۆلێنكردنی فیشه بابه‌تییه‌كان: دوای كۆتایی هاتنی كاری فیش هه‌ڵگرتنه‌وه، پێویسته كه به مه‌به‌ستی كه‌ڵك لێوه‌رگرتنیان له ئاماده‌كردنی ڕاپۆرتدا پۆلێنبه‌ندییان بكه‌ین. پۆلێن به‌ندیكردنیان ده‌توانێ له‌سه‌ر بنه‌مای بابه‌تی سه‌ره‌كی بێ به ده‌سته‌واژه‌یه‌كی دیكه ئه‌گه‌ر بابه‌تی فیشه ده‌رهێنراوه‌كان، له‌سه‌ر بنه‌مای ده بابه‌تی سه‌ره‌كی بێ، ئه‌م بابه‌ته سه‌ره‌كییانه ده‌توانرێ وه‌ك پێوه‌ری پۆلێنبه‌ندیكردنی فیشه‌كان دابنرێ. بۆ نموونه ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ توێژینه‌وه‌یه‌ك بكه‌ین له‌سه‌ر به‌شدارییه‌ك كه هه‌ر یه‌ك له توێژه كۆمه‌ڵایه‌تییه‌كانی سه‌رده‌می

قاجار لە سەرکەوتنی شۆڕشی مەشرووتەی ئێراندا هەیانبووە لەژێر ناونیشانی جۆراوجۆری وەك بازرگانەکان، پیاوانی ئایینی، ڕۆشنبیران، کاسبکاران، وەرزێران، خاوەن ملکە گەورەکان، توێژی سەربازی، سەرۆك عەشیرەتەکان و ... دەتوانین زانیاریی پێویست لە کتێب و بەڵگەنامەکانی پەیوەندیدار بەو سەردەمەوە دەربهێنین و لەسەر فیشە بابەتییەکانیان بنووسین و بەم پێیە هەر یەك لە توێژە ناوبراوەکانی سەرەوە وەك ناونیشانی بابەتی سەرەکی، دێنە ئەژمار کە دەکرێ بەسەر بابەتی لاوەکیتردا دابەش بکرێن. فیشە ئامادەبووەکان سەرەتا بە پێی بابەتە سەرەکییەکان و دواتر لە پەیوەندیی لەگەڵ بابەتە لاوەکییەکان پۆلێن بەندی دەکەین. لە کۆتاییدابە پێی هەر دەستە لە فیشە پۆلێن بەندی کراوەکان دەتوانرێ یەکێك لە بەشەکانی ڕاپۆرتی توێژینەوەکە ڕێك بخەین.

پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کە ڕاپۆرتی کۆتایی کاتێك پڕبایەخ و خاوەن ئیعتیبارە کە سەرچاوە و ژێدەرە سوودلێوەرگیراوەکان بە شێوازێکی تەواو لە کۆتایی هەر بەشێك یان لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەدا بهێنرێن.

لە شێوازی فیش هەڵگرتنەوە لەگەڵ تێرامان لە توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکانیشدا دەکرێ سوود وەربگیرێ، بەم شێوەیە هەر یەك لە بابەتەکانی جێگەی تێڕامان یان چاوپێکەوتن سەرەتا لە دەفتەرچەی یادداشت تۆمار دەکەین و دواتر لە دەرەتانێکی گونجاودا بۆ ناو فیشەکە دەیانگوێزینەوە. فیشە کۆکراوەکان لە ماوەی سەفەرە توێژینەوەییەکاندا پۆلێنبەندیی بابەتی دەکرێن و دواتر لە راپۆرتی کۆتایی سوودیان لێ وەردەگیرێن. لە توێژینەوە مەیدانییەکانیش زانیارییە کۆکراوەکانی بە هۆی فیشە بابەتییەکان، دەتوانن وەك تەواوکەری زانیارییەکانی دەرهێنراو لە پرسیارنامە هاوکارییەکی باشی دەرەنجامگیرییەکان و شیکردنەوەکانی توێژەر بکات.

### ٤. نموونەوەرگرتن (نموونەی توێژینەوە)

نموونەوەرگرتن یەکێك لەو شێوازە باوانەیە کە لە بابەتگەلێکدا کە کۆمەڵگەی توێژینەوە زۆر بەربڵاوە، بەکار دەهێنرێ. بەم شێوەیە بە هۆی بەربڵاویی کۆمەڵگەی توێژینەوە، تێچووی زۆری توێژینەوە، پێویست بوونی توێژەری زۆر و تەرخانکردنی کاتی زۆر، نموونەیەك لە ئاستی پێنج یان دە لە سەد یان هەر ئەندازەیەك کە ئامارناس پێشنیاری بکات، هەڵدەبژێردرێ و دوای تاوتوێکردن،

دەرەنجامەکەی بۆ گشت کۆمەڵگە دەگشتێنرێ. یەکێك لەو بابەتانەی کە لە نموونەوەرگرتندا گرینگ و پڕبایەخە، وێکچوونی کۆمەڵگەی نموونەکە لەگەڵ کۆمەڵگەی گشتییە، بە شێوەیەك کە تایبەتمەندییەکانی نموونەکە هاوشێوەی کۆمەڵگەی گشتی بێ. ئەم وێکچوون و گونجانە نە تەنیا لە باری قەبارەی دوو کۆمەڵگەکە دەبێ لەبەرچاو بگیرێن، بەڵکوو لە بابەت سیفات و گۆڕاوەکانیشدا دەبێ بوونیان هەبێ. بۆ نموونە ئەگەر کۆمەڵگەی سەرەکی ئێمە خوێندکارانی زانکۆی تاران بن و ئێمە نموونەیەك بە قەبارەی لەسەدا دە لەم کۆمەڵگەیە هەڵبژێرین، تایبەتمەندیی و گۆڕاوەکانی ناو کۆمەڵگە گشتییەکە وەك تەمەن، ڕەگەز، بەش، ڕەوشی خێزانداری و ... لە نموونەکەشدا بە هەمان ڕێژە دەبێ بوونیان هەبێ بۆ ئەوەی بتوانین دەرەنجامەکان بەسەر کۆمەڵگەی سەرەکیدا بگشتێنین.

نموونەوەرگرتن زۆر جۆری هەیە کە باوترینیان بریتین لە:

- نموونەی هەڕەمەکی سادە
- نموونەی ڕێکخراوی هێڵی
- نموونەی چینایەتی
- نموونەی هەڕەمەکی ناوچەیی

### ٥. مۆنۆگرافی یان تاکنووسی

مونۆگرافی یان تاکنووسی یەکێك لەو شێوازانەیە کە لە شێوازی چڕدا بۆ توێژینەوەی کۆمەڵگە سنووردارەکان کەڵکی لێ وەردەگیرێ. لە تاکنووسیدا کۆمەڵگە بچووك و سنووردارەکان بە شێوەیەکی هەمەلایەنە تاوتوێ دەکرێن و توێژینەوەیان لەسەر دەکرێ. بە دەستەواژەیەکی دیکە، تاکنووسی وەسفێکی قووڵ و هەمەلایەنەیە لە گوند یان بنەماڵە یان تایفەیەك. بۆ نموونە، لە مونۆگرافی گوندێکدا، بارودۆخی کۆمەڵایەتی، دێموگرافی و کولتووری، دامەزراوەکان، نۆرمەکان و بە شێوەیەکی گشتی هەموو وردەکارییەکانی ژیانی خەڵکی گوندەکە تاوتوێ دەکرێن.

مۆنرگرافیی گوندنشینی زۆرتر لەو ناوچانە بەکار دەهێنرێ کە زانیاریی تەواو لە بواری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری ئەو ناوچانە بوونی نەبێ و لە وەها بابەتگەلێکدا هەڵبژاردنی گوندێکی نموونە و مامناوەندی کە تایبەتمەندییەکانی تا ڕادەیەکی زۆر ناسێنەری کۆمەڵگەی گشتی بێ، دەتوانێ سیمایەکی گشتی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری ناوچەکە نیشان بدات.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی پێنجەم

١ـ پیربسن یه، ڕوش مردم شناسی، ترجمه علی محمد کـاردان، موسسـه مطالعـات و تحقیقـات اجتمـاعی دانشگاه تهران.

٢ـ برای اطلاع بیشتر از قانون و ویـژگیهای آن در جامعه‌شناسـی رجـوع شـود بـه کتـاب جامعه‌شـناس عمومی نوشته دکتر منوچهر محسنی انتشارات  ص ٣٠٤ تا .٣١٥

٣ـ برای اطلاع از جزئیات و چگونگی این نوع سوالات و کاربرد آنها رجوع شود به کتاب روشهای تحقیـق و امار در علوم سیاسی و جامعه‌شناسی، نوشته دکتر حسن محمدی نژاد.

٤ـ موریس دووروژه، روشهای علوم اجتماعی، ترجمه خسرو اسدی، ص ١٧٠ و ١٧٢.

# بەشی شەشەم

## کـولتوور (Culture)

### پێناسەکان

کولتــوور لــە کۆمەڵناســی و مرۆڤناســیدا وەرگێــڕدراوی وشــەی کولتــوور (Culture)ی فەڕەنسی و کاڵچێری ئینگلیزییە. ئەم وشەیە کە لە سەرچاوەی لاتینی وەرگیراوە، لە بنەڕەتــدا بە واتای کشتوکاڵ، ئاوەدانکردنەوە، داچـاندنی زەوی و بەرهــەمهێنان بــوو کــە بەرەبــەرە لــە ئــەدەبیات و زانســتەکانی دیکەشــدا بــەکار هــات و لــە ســەدەی ١٨ نووســەران بــە واتــای پەروەردەکردنی دەروونی و مەعنەوی بەکاریان دەهێنا.

لەو کاتەوە کولتوور لەسەر بنەمای پێناسە فەڕەنسییەکەی بە واتای پــەروەردەکردنی ڕوح و جەستە بەکار هاتووە و بەرەبەرە لە زمانی فەڕەنسییەوە چۆتە ناو زمــانی ئــەڵمانی و هەنــدێك گۆڕانیشی بەسەردا هاتووە و وەك پێشوەچــوونی هــزری و کۆمەڵایــەتی مرۆڤــ و کۆمەڵگــە و مرۆڤایەتی لەقەڵەم دراوە. زاراوەی مێژوویی ئاڵوگۆڕی کولتــووری لــە نێــوان ئەڵمانییــەکان و فەڕەنسییەکان و ئینگلیزی زمانەکان کولتووری لە پێناسە سەرەکییەکەی کە چاندن و کێڵانــی زەوی بوو، دوور کردەوە و واتایەکی نوێی پێبەخشی.

زاراوەی کولتوور بە واتا کۆمەڵناسی و مرۆڤناسانەکەی یەکەم جار لــە لایــەن مرۆڤناســی بریتانی، ئیدوارد بارێنت تایلۆر (Edward Barnet Tylor) لە ساڵی ١٨٧١ لە کتێبێکــدا لەژێر ناوی کولتووری سەرەتایی (Primitive Culture) بەکار هاتووە.

ناوبراو له پێناسەی کولتووردا دەڵێ: کولتوور بریتییه لـه گشـتێکی ئـاڵۆز لـه زانسـت و زانیاری، هونەر، هزر و بیروباوەڕ، یاسا و دیسیپلین، دابونەریت و ترادیسیۆنەکان و هەر چەشنە توانایيەکی دیکەیە کە مرۆڤ وەك ئەندامێك لە کۆمەڵگە وەریدەگرێت.

تایلۆر لە کتێبێکی دیکەدا کە بە ناوی مرۆڤناسی (Anthropologie) بڵاوی کردۆتـەوە، ئـەوە دەردەخا کە کولتوور لە تایبەتمەندییەکانی ژیانی مرۆییە و ئاژەڵەکان بێکولتوورن. پێناسـەکەی تـایلۆر بـۆ کولتــوور چــەند ڕەخنەیــەکی ئاراســتە کــراوە کــە یــەکێکیان ئەوەیــە کــە کارلێکــە دوولایەنــە کۆمەڵایەتییەکانی لەبەرچاو نەگرتووە. ئەوەی تر ئەوەکە فـۆرمی ئـەو چـالاکییانەی کـە لـەژێر نـاوی کولتووردا گونجاندوویەتی، ناتەواوە.(١) لەگەڵ ئەمەشـدا، پێناسـەی کلاسـیکی تـایلۆر بـۆ کولتـوور باس‌وخواسی زۆری لە بواری کولتووردا هێناوەتە ئاراوە و کۆمەڵناسان و مرۆڤناسـان بـە پێـی ڕوانگـە جیاوازەکانیان پێناسەی جۆراوجۆریان لە کولتوور خستۆتەڕوو.

هێرسکۆویتس (Herskovits)، ژمارەی ئەم پێناسانەی بە نزیکەی ٢٥٠ پێناسە دانـاوە. هەندێك کەسی دیکە دەڵێن نزیك بە ٤٠٠ پێناسە هەیە. دوو کەس لە مرڤناسە ئەمریکییەکان بە ناوەکانی کرۆبێر (Kroeber) و کلاکۆن (Kluckohn) کتێبێکیان سەبارەت بە کولتـوور کۆ کردۆتەوە کە ١٦٤ پێناسەی لە کولتوور لەخۆ گرتووە کـە لـە لایـەن یـەکێك لـە توێـژەرە ئێرانییەکان لەژێر ناوی پێناسـەکان و چـەمکی کولتـوور وەرگێـڕدراوە. لـەم وەرگێڕانـەدا ٩٣ پێناسە هەڵبژێردراون و لە ٦ بەشی وسفی یان شـیکاری، مێـژوویی، نـۆرمی، دەروونناسـانە، پێکهاتەیی و ژێنێتیکیدا پۆلێنبەندی کراون. (٢)

لێرەدا نموونەگەلێك لەم پێناسانە دەخەینەڕوو:

### ١ـ پێناسە وەسفی یان شرۆڤەییەکان (Descriptive)

پێناسە وەسفییەکان پشت بە فاکتەرە پێکهێنەرەکانی کولتوور دەبەستن و بوارەکەی زۆر بەرفراوانە. خودی تایلۆر بە یەکێك لەو مرۆڤناسانە دێتە ئەژمار. ئەم کەسانە پێناسـەگەلێك کـە بـۆ کولتووریـان خستۆتەڕوو، لایەنی شرۆڤەیی پێوە دیارە. ( لە ڕەهەندی شیکارییەوە پێناسەی کولتووریـان کـردووە). نموونەیـەك لـەم پێناسـەیە لـە لایـەن ویسـلێر (Wissler) کـراوە کـە دەڵـێ: " تـەواوی چـالاکییە کۆمەڵایەتییەکان بە بەربڵاوترین واتاکەی وەك زمان، هاوسـەرگیری، سیسـتەمی خاوەنـداریێتی، وێـژە، شتە دەسکردەکان، هونەر و ... بەشێك لە کولتوور دێنە ئەژمار."

مالینۆفسکی پێناسەیەکی هاوشێوە لە کولتوور دەخاتەڕوو. بەپێی پێناسەکەی ناوبراو:

" کولتوور بە سادەیی بریتییە لە گشتێکی یەکدەست و یەکپارچە لە کەرەسە و شـتومەکە بەکارهێنراوەکان، تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی گرووپە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان، وێناکان، باوەڕەکان و ڕێوڕەسمە مرۆییەکان."

## ٢. پێناسە مێژووییەکان

لە پێناسە مێژووییەکاندا، کولتوور وەك کەلەپووری کۆمەڵایەتی و نـەریت (Tradition) لەقەڵەم دراوە. بۆ نموونە بواس (Boas) دەڵێ: دەتوانرێ کولتوور بەو کردەوانە بزانرێ کە لەنێو گرووپێك لە مرۆڤەکاندا هاوبەشن و لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دیکە و لە کۆمەڵگەیەکـەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەگوازرێنەوە. پێناسەی "ڕاڵف لینتۆن"یش هەر لەم چوارچێوە دایە، بـە پێی پێناسەکەی ناوبراو کولتوور تێکەڵاوێك لە ڕەفتاری وەدەسهاتوویە کە لە ڕێگەی ئەندامانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراوەوە لە وەچەیەك بۆ وەچەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە و لەنێو تاکەکانـدا هاوبەشە.

## ٣. پێناسە نۆرمییەکان (نۆرماتیڤ) (Normative)

پێناسە نۆرمییەکان بە ڕێسا و ڕێباز و میتۆدەکانی ژیـان پشـت ئەسـتوورن. لـەم بـوارەدا هێرسکویتس دەڵێ: کولتوور، ڕێگە و شێوازی ژیانی قەومێکـە. لـە کاتێکـدا کـە کۆمەڵگـە کۆمەڵەیەکی ڕێکخراوی تاکەکەسانێکە کە وەشوێن ڕێ و ڕێبازی دیاریکراوی ژیان دەکەون. بە واتایەکی سادەتر کۆمەڵگە لە خەڵك پێکهاتووە و ڕێوشوێن و کردەوەی ئەوان کولتوورییانە.

## ٤. پێناسە دەروونناسییەکان (Psychological)

جۆرێکی دیکە پێناسەی کولتوور لایەنی دەروونناسانەی هەیە کە تێیدا هەندێك لەتوێژەران پشـت بـە عـادەت دەبەسـتن. یـانگ (Young) لـەم بـارەوە دەڵـێ: " کولتـوور حاڵەتـە ڕەفتارییەکانی عادەتێکی هاوبەش لە گرووپێکی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵگەدایـە و لـە توخمـە ماددی و ناماددییەکان پێك هـاتووە." و هەنـدێکی بـە فێربـوون پشـت ئەسـتوورە وەك ئـەم پێناسەیە لـە ویسـلێر: دیـاردەی کولتـووری دەتـوانرێ بـە کۆمـەڵێکی ئـاڵۆز لـە چـالاکییە فێرکارییەکانی گرووپە مرۆییەکان بزانرێ.

هەندێکیش وەك ئامرازێك بۆ گونجان و چارەسەکردنی مەسەلەکان جەخت لەسەر کولتوور دەکەنەوە. وەك ئەم پێناسەیە لە فۆرد (Ford) کە دەڵێ: کولتوور بریتییە لە شێوازە نەریتییەکانی چارەسەرکردنی کێشەکان. یان کولتوور گشتێك لە ئامراز و کەرەسە ماددی و هزرییەکانە کە قەومێك بەهۆیانەوە پێداویستییەکانی خۆی دابین دەکات و خۆی لەگەڵ ژینگە دەگونجێنێ. لەگەڵ ئەم پێناسەیە لە پیدێنگتۆن (Pidington) کە دەڵێ: کولتوور ئەو داهێنان و تایبەتمەندییانە دەگرێتەوە کە لە سیستەمێکدا بە شێوەی کامڵ و یەکپارچە بوونی هەیە و لە نێوان بەشەکانیدا بە شێوەی جۆراوجۆر پەیوەندیی دوولایەنە هەیە.

### ٥- پێناسە پێکهاتەییەکان (Structural)

پێناسەی تری کولتوور لەسەر بنەمای پێکهاتەی کولتووری (Structure) و ئۆلگوو(نموونە)سازییە.

ویلی (Willy) دەڵێ: " کولتوور، سیستەمێکە لە نموونە عادەتییەکان و وەڵامدانەوە کە هاوپێوەندییان لەگەڵ یەکتر هەیە." بە بۆچوونی ئۆگبێرن (Ogburn) و نیمکۆف (Nimkoff) کولتوور ئەو تایبەتمەندییە ماددی و مەعنەوییانە دەگرێتەخۆ کە بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ رێك خراون.

### ٦- پێناسە ژێنێتیکییەکان (Genetics)

لەم پێناسانەدا وەك دروستکراو یان بەرهەمی مرۆڤ جەخت لەسەر کولتوور کراوەتەوە. بۆ نموونە کلاکۆن دەڵێ: " دەتوانرێ کولتوور بەو بەشە لە ژینگە دابنرێ کە دروستکراوی دەستی مرۆڤە." واتە کولتوور بەو بەشە لە ژینگە دەگوترێ کە مرۆڤ خۆی خوڵقاندوویەتی و خۆی لەگەڵ دەگونجێنێ.

## کولتوور وەك فاکتەری جیاوازیی ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ

زۆر لە خاوەنڕایان و بیرمەندانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، کولتوور بە فاکتەری جیاوازیی ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ دەزانن. ئیشپینگلێر (O.Spengler) کولتوور بە بنەمای سەرەکی کۆمەڵگەی مرۆیی دەزانێ. ناوبراو کە قوتابخانەکەی لەسەر ڕەسەنایەتی کولتوور (کولتوورالیزم Culturalism) دامەزراندووە، پێی وایە کە ژیان و گەشەی کۆمەڵگە بە گەشەی کولتوور بەستراوەتەوە و مەرگی کۆمەڵگە، پێوەندیی بە مەرگی کولتووری ئەو کۆمەڵگەیە هەیە.(٣) هەندێك لە مرۆڤناسەکان مرۆڤبوون بە واتای هەبوونی کولتوور لێك دەدەنەوە. لەبەر ئەوەکە کە کولتوور بە واتای ڕواڵەتە ماددی و مەعنەوییەکانی چالاکییە مرۆییەکان بۆگونجان لەگەڵ ژینگە بەکار دێت، وەك سنوورێکە کە مرۆڤ لە گشت بوونەوەرەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.(٤) میراتی ئاژەڵ میراتێکی جەستەییە کە بە دژواری دەگۆڕدرێت، بەڵام میراتی مرۆڤ میراتێکی کۆمەڵایەتییە و لە حاڵی گۆڕان و گەشەسەندن دایە و بە تێپەڕینی زەمەن پڕبارتر، دەوڵەمەندتر و بەربڵاوتر دەبێت و لە درێژەی زەمەندا بەردەوام دەبێت و لەوەچەیەك بۆ وەچەیەکی دیکە و لە کۆمەڵگەیەك بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە. ڕەفتاری حەیوان کەموزۆر جێگیر و غەریزییە. بۆ نموونە کەڵەشێرەکان لە سەرەتایماڵیبوونەوە هەتا ئێستا بە شێوەیەك شەڕ دەکەن، بەڵام لە شێوازەکانی شەڕکردنی مرۆڤدا هەتا ئێستا گۆڕانکاریی فرە ڕووی داوە. ئەم شێوازانە نە گشتین و نە یەکسانن. هەروەها هەنگ لەگەڵ هەموو سەرسووڕهێنەرییەکەی لە سەرەتاوە هەتا ئێستا گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە. لە حاڵێکدا شکڵی شوێنی نیشتەجێبوون و خانوو و بینای مرۆڤ ڕۆژ بە ڕۆژ لە حاڵی گۆڕان و پەرەسەندن دایە و ئینسان بۆ ئاسوودەیی زیاتر و شوێنی حاوانەوەی باشتر شێوازگەلی جۆراوجۆری بەکار هێناوە و نەخشە و نیگاری نوێی خستۆتەڕوو.

مرۆڤ خاوەن پێداویستییە کولتوورییەکانە. بوونەوەرەکانی دیکە بە ڕادەی دابینکردنی پێویستییە ژیانییەکانی خۆیان چالاکی دەکەن و پێداویستییە سەرەتاییەکانی خۆیان دابین دەکەن، بەڵام ئەمە بۆ مرۆڤ بەس نییە چونکە بە قەولی سوفوکێل نووسەری بەتوانای یۆنانی " مرۆڤ شاکاری سروشتە" بەم پێویستیانەی ژیان قەناعەت ناکات و وەك بوونەوەرێك کە خاوەنی شعوورە، بەوەیکە هەیەتی ڕازی نییە و تەنیا بە دابینکردنی پێداویستییە

سەرەکییەکان ڕازی نابێ. ئاژەڵەکان توانای ئەوەیان نییە ئـامراز دروسـت بکـەن و سـوود لـە ئەزمونەکانی کەسانی دیکە بە تایبەت ڕابردووەکان وەربگرن. لەحاڵێکـدا کـە مرۆڤــ ئـامراز دروست دەکات و لە سەرەتای لەدایکبوونەوە لەگەڵ دونیایەك لە ئەزموونی وەچەکانی ڕابـردوو بەرەوڕوو دەبێتەوە و بەکەڵك وەرگرتن لەم ئەزموونانە دەتوانێ بە جۆرێکی باشتر لە پێشـینیان بەرەنگای سروشت ببێتەوە و بۆ ژیان و گوزەرانی خۆی ئامادەی بکات.

مرۆڤەکان لە بەربەرەکانی بەدژی هۆکارە نالەبارە سروشتییەکان هاوکاریی یـەکتر دەکـەن و لەگەڵ ئەنجامدانی کار و چالاکی شێوازی ژیانیش فێر دەبن. مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییـە و بۆ هێنانەکایەی ژیانێکی باشتر لەگەڵ کەسانی دیکە یاریدەی یەکتر دەکەن. بەڵام ئاژەڵـەکان لە شەڕی مانەوە و دەرگیربوون لەگەڵ فاکتەرە سروشتییەکان بە مەبەسـتی پاراسـتنی گیانیـان تەنیا پشت بە خۆیان دەبەستن.

لینتۆن (Linton) دەڵێ: لە ژیانی مرۆڤدا کۆمەڵگە لەجێگەی تاك، "یەکـەی سـەرەکی" خەبات بۆ مانەوەی مرۆڤە. ئینسان بە تەنیایی لەگەڵ سروشت بەربەرەکانی ناکات بەڵکوو هەر یەکێك بە جۆرێك بە هاوکاریی تاکەکانی دیکە و بە شێوەی گرووپی بەربەرەکانی دەکەن.

کۆمەڵگەی مرۆیـی لـە سـەرەتاییترین شـێوازی خۆیـدا بـەپێی پێداویسـتییەکانی ژیـان، تایبەتمەندییە ئیقلیمییەکان و ژینگەی سروشتی کەڵك لە شێوازگەلی تایبەت بۆ سازان لەگـەڵ ژینگە وەردەگرێت.

مرۆڤـ دەستەکانی ئازادن و ئەم کراوەبوونی دەستەکانی ئەو توانایییە بەو دەبەخشن کـە سـوود لە هێزی فکری خۆی وەربگرێ و ئامراز دروست بکات، جلوبەرگ دابـین بکـات و خـۆی لەگـەل ژینگە بگونجێنێ و بەرەبەرە و بە تێپەڕینی زەمەن کەڵك لە ڕێگە و شێوازی ڕابردووەکان وەربگرێ و خۆی تەیارتر بکات. ئەم شێوازانە کە بە پێـی بـارودۆخی سروشـتی و جوگرافیـایی لـە ناوچـە جیاوازەکان بە شێوازی جۆراوجۆر بوونی هەیە، کولتووری پێدەگوترێ. (٥)

مرۆڤەکان هاوکاری، لاساییکردنەوە و شەڕ دەکەن و لەگەڵ ئەم چالاکییانە ڕێوشوێنی ژیـان فێر دەبن. بەڵام گیانلەبەران ئەم جۆرە چالاکییانە بە پێی غەریزەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن.(٦)

کولتووری ڕێنیشاندەری هەموو چالاکییە مرۆییەکانە. کولتوور فاکتەری ئاشکرای ڕەفتاری مرۆییە و تایبەت بە مرۆڤە. کولتوور توانایی تایبەتی مرۆڤە. (٧)

تایلۆر دەڵێ: لـەنێوان نـزمترین مرۆڤــ و بـەرزترین و پێگەیشـتووترین ئـاژەڵدا کـەلێن و بۆشاییەکی هزری و زەینیی قووڵ بوونی هەیە. هەندێك لە جووڵەکان وەك باوێشك هـاتن، خـۆ

لێك كێشانەوە لە نموونەی كارە مرۆییەكان نین، بەڵكوو كاردانەوەن و لەسەر بنەمای كردەوەكانی ژیانن. مرۆڤبوون و خاوەن كولتوور بوون دوو شتی لێك جیانەكراوەن.

ئێوێلین رید (Evelyn Read) دەڵێ: ئاژەڵەكان كۆیلەی سروشتن و لە بەرامبەر هێزە سروشتییەكان و ئەو پێشهاتانەی كە لە كۆنترۆڵی ئەوان بەدەرە، ملكەچن. مرۆڤ ئەم پەیوەندییەی پێچەوانە كردۆتەوە. ئەو لە ڕێگەی كار، كاریگەریی لەسەر سروشت داناوە و نە تەنیا لە كۆنترۆڵ بوونی ڕاستەوخۆی لە لایەن ئەوەوە پارێزراوە، بەڵكوو كۆنترۆڵی ئەم حاكمە گەورەیەی پێشوو واتە سروشتیشی كردووە. دەتوانین بڵێین كە مێژووی ئاژەڵەكان لە پێشترەوە بۆ ئەوان نووسراوە، بەڵام مرۆڤ مێژووی خۆی بە دەستی خۆی دروست دەكات.

ئاژەڵ توانای فێربوونی نییە، دیارە هەندێك لە ئاژەڵان بە پێی لاساییكردنەوە دەنگەكانی مرۆڤ دووپات دەكەنەوە، وەك تووتی كە لە ڕێگەی لاساییكردنەوە هەندێك لە وشەكانی مرۆڤ دەڵێتەوە، بەڵام توانای فێربوونییان نییە و ناتوانن زانیارییەكانی خۆیان بۆ كەسانی دیكە بگوازنەوە.

مرۆڤ لە ڕێگەی خەت و نیشانە و هێماكان، سەمبولەكان (Symboles) و وێنەكان دەتوانێ هەست و هزرەكانی خۆی بە كەسانی دیكە نیشان بدات. بۆ نموونە بە جووڵاندنی سەر خەم و نارەحەتی خۆی پیشان دەدات و بە بزاوتنی دەست، سڵاو و ڕێز دەردەخات. بۆ بڕوای بروس كوهین (Broous Queen) ئەوەی كە مرۆڤەكان لە ئاژەڵەكان جیا دەكاتەوە، توانایی مرۆڤ لە دامەزراندنی پێوەندی لە ئاستێكی زۆر ئاڵۆز دایە. ئەم پەیوەندییە هێماییە وەرگرتنی كولتوور ئاسانتر دەكات و گواستنەوەی كولتوور لە وەچەیەك بۆ وەچەیەكی تر مەیسەر دەكات. مرۆڤ بە سوودوەرگرتن لە هێماكان بە سێ شێوەی سەرەكی خوارەوە پەیوەندیی لەگەڵ یەكتر دەبەستێ: ١ـ زمانی قسەكردن و ئاخافتن ( گوتەیی) كە بەو مۆدێل و نموونە دەنگییە فرەچەشنانە دەگوترێ كە فێربوون و پەیوەندیی ئاسان دەكات. ٢ـ زمانی نووسین (نووسراوەیی) كە لە ڕێگەیەوە زمانی ئاخاوتن تۆمار دەكرێ و دەنووسرێ و لە ئاكامدا میراتی كولتووریی كۆمەڵگە دەپارێزرێ. مرۆڤەكان لە ڕێگەی زمانی نووسینەوە توانیویانە ئەو بەشانەی كولتوورەكەیان كە گرینگە وەك شێوەكانی چارەسەركردنی نەخۆشی، تكنیكەكانی وەرزێری، ئامرازەكان و بیناسازكردن تۆمار بكەن. ٣ـ زمانی جەستەیی: كە ئاڵوگۆڕی واتاكان وكولتوور لە ڕێگەی ئەنجامدان و دۆخی جەستەیی مەیسەر دەكات.

بە پێی ئەوەی كە گوترا دەتوانین بڵێین كولتوور لە تایبەتمەندییەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی مرۆڤە، كە كۆمەڵگەی مرۆیی لە كۆمەڵگەی ئاژەڵی جیا دەكاتەوە.

ئەم هۆکارانەی جیاوازی دەتوانرێ لەسەر بنەمای چوار تایبەتمەندیی خوارەوە بخرێنەڕوو:

**١ـ بیرکردنەوە و توانایی فێربوون**

**٢ـ قسەکردن**

**٣ـ تەکنۆلۆژیا**

**٤ـ کۆمەڵایەتیبوون ( ژیانی گرووپی)**

هەندێك لە خسڵەتەکانی سەرەوە دەتوانرێ بە ڕادەیەکی زۆر لاواز لە ئاژەڵەکانیشدا ببینرێن کە ئەتوانرێ بە کردەوە و جووڵەی غەریزی ناو بنرێن نەك تایبەتمەندیی کولتووری وەك: غەریزەی دایك بوون، هێلانەسازکردن و... کولتوور غەریزە مرۆییەکان کۆنترۆڵ دەکات و بەم هۆیەوە ئەگەر کولتوور لە مرۆڤ بستێنن، جیاوازییەك لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا نامێنێتەوە. وەرگرتنی کولتوور لەڕاستیدا هاوئاهەنگی و سازانی تاك لەگەڵ گشت بارودۆخ و تایبەتمەندییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییە و زیاتر بە دوو شێوە لەوانەیە بێتە پێشەوە: یەکەم بە شێوەی سروشتی و بەرەبەرەیی کە هەمان گەشەی تاکەکان لە ناو ژینگەی کۆمەڵایەتی تایبەتە. دووەم بە شێوەی پێك گەیشتنی دوو کولتوور کە بە شێوازگەلی جۆراوجۆر لەوانەیە بێتەپێشەوە.

بە سەرنجدان بەوەیکە گوترا، ڕوون دەبێتەوە کە کولتوور هەموو ئەو شتانە لەخۆ دەگرێت کە ئێمە لە کەسانی دیکە فێریان دەبین و پێیانەوە زیاد دەکەین و بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەریمان لەسەر دادەنێت و کار و کردەوەی ئێمە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت. دەتوانرێ بگوترێ کە پەیوەندیی کولتوور و مرۆڤ وەك ئاو و ماسییە، ئێمە لە کولتووردا دێین و دەچین وەك ماسییەك کە لە ناو ئاو دایە. ژیانی ماسی بە ئاو بەستراوەتەوە، ژیانی مرۆڤیش بە کولتووری کراوە بەستراوەتەوە.

هێرسکۆویتس بە مەبەستی دەربڕینی واتا، سنوور و توخمە پێکهێنەرەکانی کولتوور، تایبەتمەندییەکانی خوارەوەی بۆ دەستنیشان دەکات: (٨)

## تایبەتمەندییەكانی كولتوور

### ١ـ كولتوور، گشتی، بەڵام تایبەتە

دەتوانرێ بگوترێ كە كولتوور وەك مەعریفەی مرۆیی لە هۆكارەكانی جیاوازیی ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ دێتە ئەژمار و لە تەواوی كۆمەڵە مرۆییەكاندا هەیە و گشتییە. چونكە تەواوی هێما و توخم و بەشەكانی لە هەموو بوارەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی ئینسان، لە سازكردنی ئامرازەوە بگرە هەتا دابینكردنی جلوبەرك و خواردن، ئالوویرەكان، یاسا و ڕێساكان، كاروبارە سیاسی و ئابووری و حكومییەكان، فەلسەفە، بیروراكان لەمەڕ "هەبوون" و جیهانی بان سروشتی، زمان، هێما، ئاوات و ئارەزوو و شێوازی دەربڕینیان، گۆرانییەكان، ئەفسانەكان، مەتەڵەكان، نۆرمەكان و بەها كۆمەڵایەتییەكان، ڕێورەسم و دیاردەكانی دیكەی ژیانی كۆمەلایەتی مرۆڤ، بوونیان هەیە.

بەڵام ئەم پەیوەندییانە لە كۆمەڵە مرۆییەكاندا وەك یەك و هاوشێوە نییە. بەڵكوو هەر كۆمەڵگەیەك سیمای تایبەت بە خۆی هەیە كە بەرهەمی مێژووی ئەو كۆمەڵگەیە و لەژێر كاریگەریی بارودۆخی ئابووری و كۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆی دایە. بۆ نموونە لە هەر كۆمەڵگەیەكدا مرۆڤ بۆ پاراستنی خۆی لە سەرما، جلوبەرگ لەبەر دەكا. ئەم دیاردەیە لە هەموو كۆمەڵگە مرۆییەكاندا بوونی هەیە و گشتی بوونی كولتوور نیشان دەدات. بەڵام هەر كۆمەڵگەیەك لە هەر چاخ و سەردەمێكدا جۆرێكی تایبەت لە جلوبەرگ بۆ خۆی دابین دەكات كە لەگەڵ كۆمەڵگە و سەردەمی دیكەدا جیاوازی هەیە.

هەروەها جیاوازیی نێوان جلوبەرگە ناوچەییەكانی: كوردی، قەشقایی، توركمەن، بلووچ و خەڵكی ناوچەكانی دیكە تایبەت بوونی كولتوور دەردەخەن كە دیارە لە چوارچێوەی كولتووری نەتەوەیی وڵاتێكی وەك ئێران دەتوانرێ ئەم تایبەتمەندییانە لەژێر ناوی وردە كولتوور، یان بەشە كولتوور بەكار بهێنرێن، بەڵام خستنەڕوویان لە ئاستێكی بەربلاوتر بەڵگەیە لەسەر تایبەت بوونی كولتوور. فرەچەشنیی جلوبەرگ لەنێوان خەڵكی خۆجێیی ئەمریكای لاتین، ئەفریقیا، ئەورووپا، هیندو عەرەب و تورك دەرخەری ئەم ڕاستییەیە.

لەهەموو كۆمەڵگە مرۆییەكاندا بۆ دەربڕینی چەمكە زەینییەكان و دامەزراندنی پەیوەندیی لەگەڵ یەكتر، زمان و خەت بوونیان هەیە. بەم پێیە خەت و زمان، لە فاكتەرە پێكهێنەرەكانی

کولتوور دێنە ئەژمار و گشتیین. بەڵام دەزانین کە هەر کۆمەڵگەیەك خەت و زمانی تایبەت بە خۆی هەیە کە لە کۆمەڵگەکانی دیکەی مرۆڤایەتی جیاوازە و ئەم کارە دەرخەری تایبەت بوونی زمان لە کۆمەڵەی کولتووری کۆمەڵگەیە. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا مرۆڤ بۆ ژیان پێویستی بە خواردن هەیە و چێشت و خواردن ئامادە دەکات. خواردن پێویستییەکی جەستەیی و بایۆلۆژییە. بۆ زیندوومانەوە دەبێ خواردن بخورێ. بەڵام کاتێك پرسیار دەکرێ دەبێ چ بخورێت؟ بە چ شێوەیەك بخورێت؟ کارتێکەری کولتووری تایبەت لە کردەوەکانی ئینساندا دەردەکەوێ. دابینکردنی پێویستییە غەریزییەکان لە مرۆڤدا کۆمەڵێك کردەوەی ئاڵۆزی لەگەڵە و ئەم کردەوانە لە لایەن کولتووری تایبەتی هەر کۆمەڵگەیەکەوە شکڵ دەگرن. سەبارەت بە دابین بوونی پێویستیی خۆراك لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکاندا، شێوازی جیاواز بەرچاو دەکەون و چوارچێوە، یاسا و ڕێسا و شێوازگەلێك هەیە کە تاکەکانی هەر کۆمەڵگەیەك لەژێر کاریگەری خۆی دادەنێت کە بۆ نموونە چ شتێك دەبێ بخورێت و لە خواردنی چ شتێکیش دەبێ دووری بکرێت. لە هەندێك لە کۆمەڵەکاندا خەڵك لە خواردنی بەشێك لە خۆراکەکانی وەك کولۆی دەریایی خۆ دەپارێزن، بەڵام لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی نە تەنیا خواردنی قرژاڵ و بوونەوەرە دەرياییەکان شتێکی ئاساییە، بەڵکوو بە بەشێك لە باشترین خۆراکەکان دێنە ئەژمار. یان لە کۆمەڵگەیەکدا خواردنی جرۆجانەوەرەکان شتێکی ئاساییە، بەڵام لە هەندێك کۆمەڵگەی دیکەدا کارێکی قێزەونە. تەنانەت تامی چێشتیش پەیوەندیی بە کولتووری تایبەتی هەر کۆمەڵگەیەك هەیە. لە هەندێك کۆمەڵگەی وەك هیند تامی تیژ و توند پەسند دەکرێ و چێشتەکانیان زۆر تیژن. لە حاڵێکدا کە چێشتەکانی وڵاتانی باکووری ئەورووپا تیژییەکەیان کەمترە. بەم پێیە، بەکارهێنانی تامی تیژی لە خواردندا یان کەڵك لێوەرنەگرتنی دەتوانرێ وەك لایەنی تایبەتی کولتوور لەقەڵەم بدرێت. ئەوەکە بە چ شێوەیەك دەبێ بخورێ و ڕێوشوێنی خوارد چۆنە، ئەوەش بابەتێکە کە پەیوەندیی بە تایبەت بوونی کولتوور یان وردەکولتوورەوە هەیە.

لە شوێنێکدا سفرە لەسەر زەوی پان دەکرێتەوە، لە وڵاتی وایە لە دەوری مێز خواردن دەخۆن، لە شوێنێکی دیکەدا بە کەوچك و چەنگاڵ یان داری باریك و ناسك. لە چۆنییەتی دابەشکردنی چێشت و شێوەی دەسپێکردنەوە بگرە هەتا شێوەی خواردن و دوای ئەویش و تەنانەت کاتەکانی نانخواردنیش هەموویان لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازن و دەرخەری تایبەت بوونی کولتوور لە وڵاتانی جۆراوجۆرە.

چنینی فەرش و مافووره وەك یەكێك لە گرینگترین پیشەسازییە دەستییەكانی ئێران و دیاردەیەكی كولتووری گشتیی لە كۆمەڵگەی ئێمەدا لەقەڵەم دەدرێ. بەڵام ئەگەر سەرنجی چنین و نەخشەی فەرشەكە و ڕەنگ و ... بدەین، دەبینین كە لەم بارەیەوە فەرشەكان لێك جیاوازن. ئەم جیاوازییەش نیشاندەری ئەوەیە كە لە هەر ناوچەیەك بە شێوازێكی تایبەت دەچندرێ كە پەیوەندی بە ڕابردووی خەڵك و مێژووی ئەو خەڵكەوە هەیە و لە ماوەی كاتێكی دوورودرێژدا شكڵی گرتووە و دەتوانین بڵێین لە خەسڵەتە جیاوازەكانی خەڵكی ئەك ناوچانەیە و لەم بارەوە لێكیان جیا دەكاتەوە. فرەچەشنی چنین و نەخشەی فەرشەكە لەم ناوچانە دیاردەیەكە كە تایبەت بوونی ئەم لایەنە لە كولتووری دەردەخات. لە هەمان كاتدا دەتوانرێ لە چوارچێوەی كۆمەڵگەی نەتەوەیی ئێراندا هەر یەك لەم تایبەتمەندییانە لەژێر ناوی بەشە كولتوور یان وردەكولتوور لەقەڵەم بدرێن.

## ٢ـ كولتوور، گۆڕاو، بەڵام جێگیرە

تەواوی دیاردە كۆمەڵایەتییەكان لە بەردەم ئاڵوگۆڕ و گۆڕان دان. وەك شێوازی جلوبەرگ لەبەركردن، لیباس دروین، نان خواردن ( بە دەست یان كەوچك)، شێوەی ئاڵوگۆڕی كاڵا، شێوازی بەرهەمهێنان، دیتنەوە و هەڵبژاردنی هاوسەر، ڕێوڕەسمەكان، میوانداری كردن و دەمارگیریی خزمایەتی و ناوچەییەكان و ... لە بەردەم گۆڕان دان. بەڵام گۆڕانكاریی كولتووری لەسەرەخۆ و شاراوەن و لە درێژخایەندا دەردەكەون و لە كورت خایەندا هەستپێكراو نین. ئەگەر بمانهەوێ ئەم گۆڕانكارییانە بپێوین و بە تەواوی هەستیان پێبكەین، لانیكەم لە بڕگەیەكی زەمەنی ٤٠ بۆ ٥٠ساڵیدا مەیسەر دەبێت.

## ٣ـ كولتوور، بەناچاری، بەڵام ئارەزوومەندانەیە

كولتوور گشت لایەنە جیاوازەكانی ژیانی مرۆڤ لەخۆ دەگرێ و مرۆڤ لە سەرەتای لەدایكبوونەوە دیاردە كۆمەڵایەتی ـ كولتوورییەكان، نۆرم و بەها كۆمەڵایەتییەكان فێر دەبێ و بەم شێوەیە لەگەڵ بارودۆخی كۆمەڵگەكەی دەگونجێ. چونكە ئەم فێركارییانە بەرەبەرە و بە تێپەڕینی كات ئەنجام دەگرن، ئەگەرچی گوشار دەخاتە سەر تاك و وەك كردەیەكی بەزۆری دێتە ئەژمار، بەڵام بۆ ئەو شتێك نییە كە تەحەممول نەكرێت و، تاك بە حەزی خۆی قبووڵیان دەكات

و ئەنجامیان دەدات. بۆ وێنە ئەگەر کەسێك لەباری تەمەنەوە، لە ئێمە گەورەتر بێ، ئەرکی ئێمەیە کە ڕێزی بگرین و سلاو لیٚ بکەین. ئەم دیاردە کولتووری کۆمەڵایەتییە لەسەر بنەمای بەهای کۆمەڵایەتی تەمەن لە کۆمەڵگەی ئێمە دایە بە تایبەت لە کۆمەڵگە بچوکەکانی وەك گوند کە پێوەندییەکانی نێوان تاکەکان زیاتر لێك نزیك و ڕووبەڕوویە، زیاتر ڕاست دەردەچێ. بە شێوەیەك کە ئەگەر کەسێك دەرحەق بەم کارە بێموبالات بێ، لە لایەن کۆمەڵگەوە سەرکۆنە و لۆمە دەکرێ. بەم پێیە دەبینین کە ئەم کارە بۆ تاکێك کە ناچار بە جێبەجێکردنی دەکرێ، تا ڕادەیەك گوشار و ناچارکردنی پێوە دیارە. ئێستا ئەگەر ئەم کارە قورستر و گرینگتر بێ، هەستکردن بە گوشارەکەش زیاتر دەبێ. بەڵام مەسەلە لەوە دایە تاك ئەم دیاردە کولتوورییانە لە ڕێگەی بنەماڵە و کۆمەڵگە بە تێپەڕینی زەمەن فێر دەبێ و وردەوردە شێوەی عادەتێك بەخۆوە دەگرێ کە خۆی لە خۆیدا و لە هەندێك بابەتدا بە شێوەی ناخودئاگا و نەزانستە جێبەجێیان دەکات. بەڵام ناکرێ ئەم ڕاستییەش لەبەرچاو نەگیرێ کە تاك لە بەرامبەر ناچاریدا، خاوەن توانایی و دەسەڵاتیشە و ئەم دەسەڵاتەشی لیٚ نەستێنراوەتەوە ئەگینا ئەم هەموو داهێنان و نوێگەرییانە نەدەهاتنە کایەوە، ئەمانە نیشانەی ئازادیی کردەوە و دەسەڵاتی تاکن کە دەتوانێ خۆی لە چوارچێوەی زۆر و ناچاری بێنێتەدەر و یان چوارچێوەکە بە حەزی خۆی بگۆڕێت. تاك لە بەرامبەر زۆری و ناچارکردنی کولتووردا، بێدەسەڵات و بێتوانا نییە.

## کولتووری ماددی و کولتووری ناماددی(مەعنەوی)

لە هەر کولتوورێکدا دوو بواری جیاواز لە یەکتر بوونیان هەیە: یەکێکیان کولتووری ماددی (Material Culture) و ئەوەی دیکە کلتووری ناماددی یان مەعنەوی.

### ١ـ کولتووری ماددی

کولتووری ماددی ئەو بەشە لە توخمە کولتوورییەکان لەخۆ دەگرێ کە شایانی دەست لێدان و ئەندازەگرتن (پێوان) و هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنن. شتومەکە ماددییەکان، ئامرازەکانی کار، کەرەسەکانی پیشەسازی، وەرزێری، وێنەگری، موسیقا، فێرکاری و کەلوپەلەکانی ناوماڵ کە لە ژیانی ڕۆژانەدا کەڵکیان لێوەردەگیردرێ، وەك: جلوبەرگ، جانتا، قەندان، ئوتۆمبێل،

خانوو، تەلەویزیۆن و بە گشتی ئەو بەشە لە کولتوور کە لایەنی چەندایەتی لەگەڵە بە بەشێك لە کولتووری ماددی دێتە ئەژمار.

کلتووری ماددی لەڕاستیدا گشت بەرهەم و دەسکەوتە ماددی و تەکنۆلۆژییەکانی هەر کۆمەڵگەیەك لەخۆ دەگرێ. لۆئیس مۆمفۆرد(L.Mumford) لە باسی تەکنۆلۆژیا و کولتووردا دەنووسێ:"تەکنۆلۆژیا لە دەرەوەی کولتووردا جێناگرێ بەڵکوو بەشێك لە کولتوورە".

هەندێك لە توخمەکانی کولتووری ماددی لە هەندێکی دیکەیان پێشکەوتووترن بۆ وێنە: تەلەویزیۆنی ڕەنگی لە تەلەویزیۆنی ڕەش و سپی پێشکەوتووترە و یان هەندێك کەرەسە و ئامرازی پزیشکی یان زانستەکانی دیکە لە هەندێك تەکنیك و فەننەکانی دیکە پێشکەوتووتر یان بێهێزترن. بەم پێیە بە سەرنجدان بەم بابەتە کە کۆمەڵگەکان لە باری ئابوورییەوە بەسەر کۆمەڵگە دواکەوتوو، لە حاڵی گەشە، پێشکەوتوو و پێشڕەودا دابەش دەبن، سەرنجی کۆمەڵناس بۆ لای لایەنی ماددی کولتوور بووە. ئەم لایەنە لە کولتوور، "شارستانیەت"یشی دەگوترێ.

## ٢ـ کولتووری نامادی یان مەعنەوی

ئەو بابەتانە لەخۆ دەگرێ کە لایەنی چۆنایەتییان هەیە. شایانی پێوان و بەراوردکاری نین. بێجگە لەمەش پێوانەیەکی جێگیر بۆ پێوانیان بوونی نییە. دەتوانرێ بگوترێ کە ئەوەی کە ماددی نییە، کولتووری مەعنەوی پێدەگوترێ. بەرهەمە ئەدەبی، هونەری، هزرییەکان، دابونەریتەکان، ڕێوڕەسمەکان، ئاکار و باوەڕەکان، بیروڕا و بۆچوونەکان، پەروەردە و بارهێنان و بە شێوەیەکی گشتی سامانی مەعنەوی کۆمەڵگەیەك بە بەشێك لە کولتووری نامادی ئەو کۆمەڵگەیە دێتە ئەژمار. لە نێوان لایەنە ماددی و نامادییەکانی کولتوور کارلێکی دوولایەنە بوونی هەیە، گۆڕانی یەکێکیان گۆڕانی ئەوی دیکەی بەدوادا دێت. هەندێك لە کۆمەڵناسان پێیان وایە کە ئەم گۆڕانە لە شتومەکە ماددی و ئامرازەکانەوە دەست پێدەکات و دواتر کاریگەرییەکەی پەرە دەستێنێ و لایەنی مەعنەوی کولتووریش دەگرێتەوە.

ئۆگبێرن دەڵێ: هێزی هێنانەئارای گۆڕان لە شتەکاندا شاراوەیە، چونکە خێرایی گۆڕان هەڵگرییان لە بیر و ئەندێشەکان زیاترە و لەوانەیە کە هزر و ئەندێشەکان لە کاریگەرییەکانی ئەم گۆڕانکارییانە ڕزگاریان بێ ئەگینا ئاڵۆزی لە سیستەمی

کۆمەڵایەتیدا لێدەکەوێتەوە. ناوبراو بۆ سەلماندنی تیۆرییەکەی خۆی ڕەوشی فێربوون بە نموونە دێنێتەوە کە بەردەوام پێشکەوتنی پیشەسازی و تکنیکی بەدواوە بووە.(٩) بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە تکنیك و ئامرازی کاردا دێتە کایەوە بەرهەمی بیرکردنەوە و ئەندیشەی مرۆڤەکانە.

ئاشکرایە کە بیر و هزری پێشکەوتنخوازانە و داهێنەرانەی مرۆڤە کە دەبێتە هۆی گۆڕان لە بارودۆخی ماددیدا، بەم پێیە کاریگەریی لایەنە مەعنەوی و نامادییەکانی کولتوور لەسەر لایەنە ماددییەکانی کولتوور کە وادێتە بەرچاو زاراوەی "شارستانییەت" بۆ ئەو زۆر گونجاو بێت، ناتوانرێ لەبەرچاو نەگیردرێت.

بەڵام لەبەر ئەوەکە لایەنە ماددی و نامادییەکانی کولتوور هەردووکیان لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانن و دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش کاریگەریی دوولایەنەیان لەسەر یەکتر هەیە و ئەم کارلێکە دوولایەنە لەناو کۆمەڵگەدا دێتە پێشەوە، ناتوانرێ ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە دیاردە کولتووری، کۆمەڵایەتی، ئابوورییەکاندا دێنە کایەوە، بە فاکتەرێکی دیاریکراو ڕوون بکرێنەوە، بەڵکوو لێرەشدا ئێمە لەگەل کۆمەڵە هۆکارێك بەرەوڕووین. بێجگە لەمەش لە هەندێك لە بوارەکاندا لەوانەیە گۆڕانیی فکری (یان گۆڕانی چلۆنایەتی) واتە لایەنی مەعنەویی کولتوور هۆکاری گۆڕان لە تکنیك دابێ و تکنیك کە خۆی بەرهەمی هزری مرۆڤە، بە نۆبەی خۆی وەك هۆکارێکی نوێ، دەبێتە هۆی گۆڕانکاریی فکریی تاکەکان لە کۆمەڵگەدا. بۆ نموونە بەکارهێنانی تکنیکە نوێیەکان لە فێربووندا دەرخەری ئەم ڕاستییەیە.

## بەکۆمەڵایەتیبوون - وەرگرتنی کولتوور

کۆمەڵگە مرۆییەکان بەردەوام لە حاڵی ئاڵوگۆڕ و گۆڕان دان و وەچەکان بەدوای یەکتردا لە جووڵەدان، گرووپێك لەنێو دەچن وگرووپێکی دیکە لەدایك دەبن و جێگەی ئەوان دەگرنەوە. کۆمەڵگەی مرۆیی زیندووە و بە وتەی ئۆگۆست کۆنت وەك کاروانێکە لە وەچەکانی ڕابردوو و ئێستا کە لە حاڵی تێپەڕبوون دان و بەرەوپێش دەچن. ئەوانەیکە دەڕۆن، ئەو شتانەی کە لە ڕابردووەکانیان وەرگرتووە و خۆشیان بە نۆرەی خۆیان پێیانەوە زیاد کردوون، بە تازە پێگەیشتووەکانیان دەسپێرن. ڕەوتی کار و ژیان بەم شێوەیە. وەچەی نوێ دەبێ تۆخمە کولتوورییەکان قبووڵ بکات بۆ ئەوە بتوانێ خۆی لەگەڵ نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بگونجێنێ.

چونکە بۆ ژیان و باشتر ژیان دەبێ لەگەڵ کۆمەڵگە بگونجێت و بۆ سازان و گونجـان، فێربـوون و وەرگرتنی تایبەتمەندییە کولتوورییەکان لە پێشینیان پێویستە.

گواستنەوەی کولتوور بە دوو شێوازی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ جێبەجێ دەبێت:

١ـ شێوازی یەکەم ئەوەیە کە وەچەی نوێ لـە پەیوەنـدیی لەگـەڵ وەچـەی کـۆن بـە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ فێر دەبێت و ئەم شێوازەش خـۆی دوو جـۆری هەیـە: یەکـەم لـە ڕێگەی فێربوونەوە جێبەجێ دەبێت. لەم شێوازەدا باوك و دایك بە ئیزن پێدان و ڕێگـە پــێگرتن و بکــە و مەکــە، منداڵەکــە لەگــەڵ نۆرمــە کۆمەڵایەتییــەکان و ڕێســا ئەخلاقییەکان و بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ کولتوور ئاشنا دەکەن و بـەم شـێوەیە ئـەو وەك کەسێکی هەڵکەوتوو و خاوەن کولتوور پەروەردە دەکـەن. شـێوازی دووەم ئەوەیـە کە منداڵەکان، خۆیان بە بینین، بیستن، دەست لێـدانی تایبەتمەندییـە کولتوورییـەکان و بینینی بەردەوامی کار و کردەوەکانی باوك و دایك لەناو خێـزان و کەسـانی دیکـە لـە کۆمەڵگەدا فێریان دەبن. بۆ نموونە منداڵ نوێژکردنی دایك و باوکی دەبینێت، لاسـاییان دەکاتەوە و ئەم ئەرکە فێر دەبێ و بەرەبەرە بە قووڵی ڕێوشوێنی نوێژکردن فێر دەبـێ و لەم بارەوە پەروەردە دەبێ و پێدەگات.

٢ـ دووهەمین شێوازی گواستنەوەی کولتوور بە شێوەی میکانیکییە کە لە ڕێگەی ئامرازی دەنگی و ڕەنگی جێبەجێ دەبێت.

گونجان و سازگاریی لەگەڵ نۆرمەکانی کۆمەڵگە و یاسا ئەخلاقییەکان دوو لایـەنی هەیـە: یـەکێکی سـادە و ڕووکەشـی و رواڵـەتی. ئـەویتر قـووڵ، ئـاڵۆز و نـاوەوەیی. جـۆری یەکـەم بەکۆمەڵایەتیبوون (Socialisation) و جۆری دووەم وەرگرتنی کولتوور یـان بـەکولتووربوون (Acculturation)ی پێدەگوترێ.

### ١. بەکۆمەڵایەتیبوون

بەکۆمەڵاتیبوون پرۆسەیەکە کە لە ڕیگەیەوە تاك لەگەڵ نۆرمەکانی کۆمەڵگە ئاشنا دەبێت و فێریان دەبێ و جێبەجێیان دەکات بۆ ئەوەی بتوانێ هاوڕێك لەگەڵ نۆرمەکانی ئەو گـرووپ و کۆمەڵگەیەی کە تێیدا دەژی، ژیان بەسەر ببات. جـاری وایـە تاکـەکان لـە کـاتی وەرگـرتنی نۆرمەکاندا تووشی نۆرمە لێك دژەکان لە کۆمەڵگەدا دەبنەوە، لە ئاکامـدا تـاك نازانـێ کـام نۆرمە وەربگرێت. هـەر بۆیـە تووشـی دژبەیـەکی دەبێتـەوە. ئـەم دیاردەیـە لـە کۆمەڵگـەی

پیشەسازیدا کە هەندێك لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان سست و لەرزۆکن و دژبەیەکییان لەنێودا هەیە، بە تەواوی دەبینرێ.

بەم هۆیەوە لە زۆر بابەتدا لەنێوان وەچەکان نەسازانی دەروونی، کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی بوونی هەیە و یەکێتی و یەکرەنگیی کۆمەڵایەتی تووشی مەترسی دەبێتەوە. بەکۆمەڵایەتیبوون هەروەها بۆ گرووپێك لە تاکەکان کە بۆ کۆمەڵگەکانی دیکە کۆچ دەکەن، یان بە شێوەی کاتی بۆ ماوەیەك لە کۆمەڵگە بیانییەکاندا ژیان بەسەر دەبەن، ڕاست دەردەچێ. چونکە ئەم تاکانە کە خاوەن کەسایەتییەکی دروستکراو و فۆرم گرتوون و لە کۆمەڵگەی خۆیاندا کولتوور و نۆرمگەلی پتەوییان هەیە، بە شێوەی کاتی و ڕواڵەتی بۆ هەمان ماوەی سەفەر یان کۆچی کاتی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی خانەخوێ قبووڵ دەکەن و بۆ سازان لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەیە جێبەجێیان دەکەن.

## ٢. وەرگرتنی کولتوور

وەرگرتنی کولتوور پرۆسەیەکە کە تاك تەواوی بوارە کولتوورییەکان دەناسێ و بە شێوەیەکی قووڵ و ورد قبووڵیان دەکات و خۆیان لەگەڵ دەگونجێنێ. وەرگرتنی کولتوور یان قبووڵکردنی تایبەتمەندییە کولتوورییەکان بە دوو شێواز ئەنجام دەدرێت:

### ئا ـ وەرگرتنی کولتوور بە شێوەی یەك لایەنە

منداڵێك کە لەدایك دەبێت، بێکولتوورە. بەڵام ئەو لە دڵی کۆمەڵگە و کولتووردا لەدایك دەبێت. کاتێك دێتە سەر دونیا، خۆی لە چوارچێوەی کولتوورێکدا دەبینێ. دیاردە کولتوورییەکان، بەها کۆمەڵایەتییەکان، نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، ئایدیالەکان، داب‌ونەریت و خوو و خدەکان و زۆر لە تایبەتمەندییە کولتوورییەکان ئەویان لە هەر لایەکەوە لەناوخۆ گرتووە. منداڵ بەرەبەرە توخمە کولتوورییەکان بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ فێر دەبێ و لەبەر ئەوەکە خۆی شتێکی نییە بۆ ئەوەی بە کۆمەڵگەی ببەخشێ، وەرگرتنی کولتووری لەم جۆرەدا یەك لایەنەی پێدەگوترێ. منداڵ لە بەرامبەر قبووڵکردنی نۆرم و بەها نوێیەکاندا پاسیڤ و ناچالاکە. واتە پرۆسەی کارتێکردنی نۆرم و بەهاکان یەك لایەنەیە و تەنیا لە لایەن کۆمەڵگەوە بەرەو منداڵەکەیە و ئەویش هیچ چەشنە بەرگرییەك لە بەرامبەر دیاردە کولتوورییەکان لە خۆی

نیشان نادات و ناتوانێ لە کۆمەڵگەدا کاریگەریی دوولایەنەی هەبێت. منداڵ لە ڕێگەی بنەماڵەوە وەك ناوەنجیکارێك لەگەڵ نۆرمەکان، دامەزراوەکان و کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان ئاشنا دەبێت... و وردەوردە گەشە دەکات و گەورەتر دەبێ و تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی کۆمەڵگە دزە دەکەنە ناو زەینی ئەو و بە ئاسانی بەسەریدا سەیتەرە پەیدا دەکەن و کەسایەتی ئەو هاوڕێك لەگەڵ نۆرمەکانی کۆمەڵگە دروست دەکەن. ئەم دیاردەیە، کولتوور وەرگرتنی یەك لایەنەی پێدەگوترێ. ئێستا ئەگەر ئەم منداڵە لەکۆمەڵگەیەکی بیانیشدا ژیان بەسەر ببات، کولتووری بێگانە هەر بەم شێوەیە وەردەگرێت.

وەرگرتنی کولتووری لەلایەن منداڵ و لە ڕێگەی خێزانەوە بە دوو شێوە ئەنجام دەدرێت: نائاگایانە و ئاگایانە. گواستنەوەی نائاگایانەی نۆرمەکان بۆ منداڵ لە ڕێگەی بە ئۆلگوودانان و وەرگرتنی ڕەفتار و کردەوە و وتەکانی دایك و باوکەوە دێتە کایەوە و بەم شێوەیە بەبێ ئەوەی کە دایك و باوك، خۆیان پێبزانن، منداڵەکە وردەوردە ئاشنای مۆدێلە ڕەفتاری و کردەییەکان دەبێ کە لە دەوروبەر دەیانبینێ.

ئەمە قۆناغێکی هەستیارە کە کەسایەتی منداڵ لە ڕێگەی ئە نموونە ڕەفتاری و کردەوەیی و وتەییانەوە بەرەبەرە شکڵ دەگرێ و بناغەی دادەنرێت.

لەلایەکی دیکەوە گواستنەوەی نۆرمەکان بۆ منداڵ بە شێوەی ئاگایانە بەم واتایەیە کە دایك و باوك بە فێرکردنێکی ڕاستەوخۆ و هاندان و ڕێگەپێدان یان پێش پێگرتنی، بە گشتی لەگەڵ نۆرم و ڕێساکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئاشنای دەکەن و بە شێوەیەك کە خۆیان پێیان باشە و بە سەرنجدان بە تێگەیشتنێك کە لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانیان هەیە، هەوڵ دەدەن ئەو بە شێوەی کولتووری و کۆمەڵایەتی پەروەردە بکەن. ئاشنایی و هاودەنگیی قووڵی منداڵ لەگەڵ نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان لە دوو حاڵەتی سەرەوە ( ئاگایانە و نائاگایانە) لەم ڕووەوە گرینگیی زۆری هەیە کە ئەم پرۆسەیە، ڕەوتێکی یەك لایەنەیە و بەم پێیە زەینی منداڵ بۆ هەر شتێك کە دەیبینێ و هەستی پێدەکات، گونجاو ئامادەی وەرگرتن و قبووڵکردنە.

دوبرۆولسکی (K.Dobrowolski) لە توێژینەوەیەك کە سەبارەت بە کولتوور لە کۆمەڵگەی گوندنشینی لەهێستان کردوویەتی، لە گواستنەوەی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان و میراتی کولتووری لە وەچەیەك بۆ وەچەیەکی دیکە دوو شێوازی سەرەکی دەخاتەڕوو:

**یەکەم**/ گواستنەوەی کولتوور لە ڕێگەی گوتار و کردار و ڕەفتار و ئامرازە زارەکییەکانی تری گواستنەوەیە کە لە ڕێگەی چاو و گوێ و هەستەکانی دیکە بە تاك دەگات. لە ڕەوتی

گواستنەوەی نێوان منالْ و تاکەکانی دیکەدا پەیوەندیی ڕاستەوخۆ دادەمەزرێ. شێوازی دیکە گواستنەوەی کولتوور و نۆرمە کۆمەلاّیەتییەکان لە ڕێگەی ئامراز و کەرەسەکانی وەك خەت، نۆتەکانی موسیقا و هەموو تکنیکە ڕەنگی و کامێراکانی وێنەگرتن و فیلم هەلْگرتنەوەیە کە بۆ تۆمارکردن و پاراستنی بیر وهزر و بەرهەمە کولتوورییەکانی کۆمەلْەکان ( مۆسیقا، هەلْپەڕکێ و ...) بەکار دێن و لایەنێکی هەمیشەییان پێدەدەن. (١٠)

## ب ـ وەرگرتنی کولتوور بە شێوەی دوو لایەنە

کاتێك کەسایەتی تاك جێگیر و پتەو ببێ، تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی کۆمەلْگە لەخۆیدا کۆ دەکاتەوە و کەسایەتییەکەی لەسەر بنەمای ئەم تایبەتمەندییانە ڕاوەستاوە. لەم ڕووەوە وەرگرتنی کولتوور سەبارەت بە کەسانێکی پێگەیشتوو، کارێکی ئالْۆزە و خاوەنی دوو لا یان لایەنە. بەم شێوەیە ئەگەر تاکێکی پێگەیشتوو لە کۆمەلْگەی خۆی بچێتە کۆمەلْگەیەکی دیکە، کولتووری کۆمەلْگەی خانەخوێ کە لەگەلْ کولتووری ئەو نامۆیە، ناتوانێ بە ئاسانی کاریگەری لەسەر دابنێ و ئەو لەژێر ڕکێفی خۆی باوێت. کۆچکردنی گرووپێك لە تاکەکانی کۆمەلْگەیەك بۆ کۆمەلْگەیەکی دیکە دەبێتە هۆی ئەوەکە دوای چەندین سالْ مانەوە و ژیان لەو ولاّتەدا، هەندێك لە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی کۆمەلْگەی خانەخوێ وەك زمان، تەکنۆلۆژیا و شێوەکانی بیرورِا و بۆچوونەکان و هەندێك لە لایەنە ڕەفتارییەکان وەربگرێ. بەلاّم لە بەرامبەر ئەم وەرگرتنەدا زۆر لە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی خۆیشی بۆ ئەو کۆمەلْگەیە دەگوازێتەوە.

ئەم دیاردەیە وەك نموونە سەبارەت بەو کۆچبەرانە دەتوانرێ ببینرێ کە لە ولاّتانی باشووری ڕۆهەلاّتی ئاسیا وەك ژاپۆن (یابان)، ویێتنام، کامبوج و هەروەها ولاّتی هیند بۆ ئەمریکای باکوور ڕۆیشتوون و بۆ ماوەی سالاّنێکی زۆر لە ئەمریکا ژیاون و شوناسی ئەمریکییان وەدەست هێناوە و لەگەلْ بالاّدەستیی کولتووریی ئەمریکا، ئێستا بەستراوەیی خۆیان بە کولتووری کۆمەلْگەکەی خۆیان لەدەست نەداوە و تەنانەت زۆر لە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی کۆمەلْگەی خۆیان وەك: خواردن، جلوبەرگ و مۆسیقایان بۆ کۆمەلْگەی خانەخوێ گواستۆتەوە. ئەم دیاردەیەی گواستنەوەی دوولایەنەی تایبەتمەندییە کولتوورییەکان، کولتوور وەرگرتنی دوولایەنەی پێدەگوترێ. کۆمەلْناسان و خەلْکناسان گرینگییان بەم لایەنەی

وەرگرتنی کولتوور داوە و گەلێك خاڵی سەرنجڕاکێشیان دەست کەوتووە. بۆ نموونە دەتوانرێ ئاماژە بە هەبوونی تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی کولتوور لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان بکرێ.

بابەتێکی دیکە وەرگرتنی کولتوور لە ڕێگەی پێکدادانی دوو سیستەم لەنێوان قەومە جۆراوجۆرەکانە. لەم بوارەدا بابەتی سەرنجڕاکێش گرینگیی و دەوڵەمەندیی کولتوورەکەیە. چونکە زۆر لە قەومە کۆچبەرەکان بە هۆی بەرتەسکیی و لاوازیی کولتووری خۆیان، تەنانەت دوای زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگەیەکیش، کولتووری کۆمەڵگەی شکست خواردوویان قبووڵ کردووە. وەك نموونە دەتوانین باسی هێرشی مەغۆلەکان بۆ سەر ئێران بکەین. مەغۆلەکان کولتووری ئیسلام و ئێرانیان وردەوردە قبووڵ کرد. جێگرەوەگانی چەنگیزخان بەرەبەرە دەستیان لە داب‌ونەریتەکانی مەغۆلی هەڵگرت و یەکسەرە ئیسلامیان قبووڵ کرد و کولتووری ئێرانیان وەگرت.

گواستنەوەی کولتوور و باڵادەستیی کولتووری داگیرکەران لە جیهانی سێهەمدا لە لایەن زۆر لە کۆمەڵناسان بایەخ و گرینگیی پێدراوە. داگیرکەران بە مەبەستی لەنێوبردنی کولتووری کۆمەڵگەی خۆجێیی و دەسەڵاتی داگیرکاری، بەنیاز بوون کولتووری خۆیان لە وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان پیادە بکەن و کولتووری پێشووی ئەو کۆمەڵگایانە بسڕنەوە.

لە هەندێك لەم جۆرە بابەتانەدا، زاڵبوونی کولتووری داگیرکاری لەگەڵ بەرگری و بەرەنگاری ڕووبەڕوو بۆوە. دەتوانرێ ئەمە لە ئەلجەزایر ببینرێ. خەڵکی ئەم وڵاتە بە بەئیسلامی کردنی بەهاکان و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان و بەعەرەبی کردنی زمانەکەیان، وەك یەکێك لە شێوازە سەرەکییەکانی خەباتی دژە داگیرکاری بەسەر فەرەنسەدا سەرکەوتن. ئاشکرایە کە لەم بوارەدا زمان و بیروڕا و بە گشتی دەوڵەمەندیی کولتووریی خەڵکی ژێر دەسەڵاتی داگیرکەر، ڕۆڵێکی گرینگی لە خەبات و خۆڕاگری و سەرکەوتن بەسەر داگیرکەردا هەبووە. لە بەرامبەر ئەم بارودۆخەدا هەندێك لە وڵاتان نەیانتوانیوە لە بەرامبەر نفووزی کولتووری داگیرکەران بەرگری لە کولتووری خۆیان بکەن و بیپارێزن. لە ئاکامدا کولتووری داگیرکەر لەنێو خەڵکی ئەو وڵاتانەدا جێی کردۆتەوە و ئەو کۆمەڵگەیەی لەژێر دەسەڵاتی داگیرکاریی خۆیدا ڕاگرتووە.

وەرگرتنی کولتوور بە شێوەی دوولایەنە دەتوانرێ بە نموونەگەلی جۆراوجۆر نیشان بدرێت کە ئێمە لێرەدا تەنیا ئاماژە بە چەند دانەیەکیان دەکەین:

### ١ـ کۆچکردنە نێونەتەوەییەکان

کەسانێك کە وڵاتی خۆیان بەجێ دەهێڵن و بۆ هەمیشــە ماڵئــاوایی لــە زێــد و نیشــتمانی خۆیان دەکەن و ڕەوانەی وڵات یان کیشوەر (قارە)یەکی دیکــە دەبــن، لــە لایــەك هــەوڵ دەدەن کولتووری پێشووی خۆیان لەبیر بکەن و لێی جیا ببنەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بــۆ گونجــان و هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ نۆرم و ڕێسا کولتوورییە نوێیەکان تێدەکۆشن.

بەم هۆیەوە و بە سەرنجدان بەوەکە کولتووری پێشوو لە بەرامبەر کولتووری نوێ بەرگری دەکا و بــە سادەیی خۆی بەدەستەوە نادات، ڕەوتێکی ئاڵۆز و لەسەرەخۆ دێتە ئاراوە کە لەوانەیە تــا دوایــین کــاتی ژیان، کاریگەریی لەسەر تاکی کۆچبەر دابنێت. تەواوی توخمەکانی کولتووری پێشــوو بــە ڕادەیــەك لــە بەرامبەر کولتووری نوێدا دەمێننەوە. توخمە پێکهێنەرەکانی کولتوور بە وەرگرتن لە تیۆری یــەکێك لــە مرۆڤناسەکان بە ناوی لیسلی وایت (Lesli White) دەتوانین بە جۆرەکانی خوارەوە دابەش بکەین:

**ــ ئایدۆلۆژیا**

**ــ تەکنۆلۆژیا**

**ــ دامەزراوەکان، ڕێکخراوەکان و نموونە ڕەفتارییەکان**

**ــ هەست، جەوهەر و ڕوانگە و بۆچوونەکان**

**ــ زمان**

لێرەدا باس لە گرینگیی و ئیعتیبار، دروســتی و نادروســتی پۆلێنبەندییەکــەی ســەرەوە نییە، بەڵکوو مەبەستی ئێمە لە خستنەڕووی دابەشکارییەکەی سەرەوە ئەوەیە کە لەنێوان ئــەم فاکتەرە باســکراوانەدا تــەنیا چــوارەمین گــرووپ، توخمگــەلێك لــە کولتــوور دەگرێتــەخۆ کــە لەبەرامبەر کولتووری نوێی تاك بەرگری لەخۆ نیشان دەدەن و دەبنە هۆی ئەوەکە تاك تا دوایین ساتەکانی ژیانیش لەگەڵ چەند بەشێك لــە کولتــووری پێشــوو هــاوڕێ و هــاودەم بێــت. واتــە لەڕاستیدا لەبارەی ئەو کۆچبەرانەی کە دوای چەندین ساڵ دووری لە کولتووری پێشوو و گەیشتن و پەیوەست بوون بە کۆمەڵگە و کولتووری نوێ، هەنووکەش پەیوەندیی مەعنــەوی و ڕوحییــان لەگەڵ کولتووری پێشووی خۆیان هەیە و وەك دەڵێن: " لەگەڵ شــیر دەچــێتە ژوورەوە و لەگــەڵ گیان دێتەدەر".

نموونەی وەها واقعییەتێك دەتــوانرێ لــەنێو کۆچــبەرانی باشــووری ڕۆژهــەڵاتی ئاســیا وەك ژاپۆنییەکان، وێتنامییەکان، کامبوجییەکان و هەروەها خــەڵکی هینــد و زۆر ناوچــەی دیکــە

ببینرێ. ئەم قەومانە کە لە ئێستادا وەك کەمینەیەکی قـەومی لـە کۆمەڵگـەی خانـەخوێ ( ئەمریکا) خەریکی ژیـانن و لەڕاسـتیدا میللییـەت و شوناسـی ئـەمریکاییان هەیـە، لەگـەڵ کاریگەریی و باڵادەستییەك کە کولتووری خانەخوێ لە باری ماددی و مەعنەوی لەسەر ژیـانی ئەوانی هەیە، بەڵام هەتا ئێستاش بەستراوەیی و هۆگریی خۆیان دەرحەق بە کولتـووری وڵاتـی خۆیان ( بە تایبەت لایەنی مەعنەوی) لەدەست نەداوە و تەنانەت لە هەندێك کاتـدا هەنـدێك لە نموونە کولتوورییەکانی خۆیان بەسەر کۆمەڵگەی خانەخوێدا سەپاندووە. ( جـۆری خـواردن، جلوبەرگ، مۆسقا و ...).

هاوئاهەنگیی کۆچبەران لەو جۆرە کۆمەڵگەیانە لەگـەڵ تـەکنۆلۆژیا، دامـەزراوە و ڕێکخراوەکان و تەنانەت ئایدۆلۆژیای کۆمەڵگەی خانـەخوێ کارێکـە کـە لـە هەنـدێك بابەتدا بە ئاسانی و بە خێرایی و لە هەندێك بابەتدا بە هێواشی ئـەنجام دەدرێ. بـەڵام جیابوونەوەی تاك لە شێوەی بۆچوون و ڕوانگەکانی کە لە ماوەی ساڵانێکی دوورودرێژ و لە سەرەتای لەدایکبوونەوە لە تاکدا شکڵی گرتووە و خۆی قاییمکردووە و جێگیر بووە، کارێکی ئاسان نییە. بەم هۆیەوە لەوانەیە هاوئاهەنگی لەگەڵ چوار دەستە لە فاکتـەرە کولتوورییـەکان واتـە تەکنـەلۆژیا، دامـەزراوە کۆمەڵایەتییـەکان، زمـان و تەنانـەت ئایدولۆژیا بە شێوەی لەسەرەخۆ و بەرەبەرە بگونجێ. بەڵام جیابوونەوە لە هەنـدێك لـە ڕوانگە و بۆچوونەکان کە لە ژێر کاریگەریی کولتووری دێرین دایـە، ڕەوتێکـی ئـاڵۆز، لەسەرەخۆ و زۆر دژوارە و لەوانەیە بە شێوەیەکی تەواو مەیسەر نەبێ.

## ٢- وەرگرتنی کولتوور لە ڕێگەی بەریەککەوتنی مێژوویی قەومەکان

کاتێك کە دوو قەوم بە هۆی هێرشە سەربازییەکان ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە و و یـەکێکیان بەسەر ئەوەی تردا سەرکەوێ، لە وەها ڕەوشێکدا دوو کولتوور لە بەرامبەر یەکتردا ڕادەوەستن. بەڵام ئەم ڕووبەڕووبوونەوە کولتوورییە جیاوازییەکی زۆری لەگـەڵ ڕوبەڕووبوونـەوەی سـەربازیی هەیە و ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە قەومێك کە بەهێزترە، لە بـاری کولتووریشـەوە سـەرتر و سەرکەوتووتر نابێت. بەڵکوو مێژوو شایەتی ئەوە دەدا کە لە زۆر بابەتدا هێرشبەران بە هێـزی سەربازیی زۆرەوە بە هۆی دەوڵەمەنـدیی کولتـووری قـەومی شکسـت خـواردوو بەرەبـەرە لـە کولتووری شکست خواردوودا تواونەوە و دوای تێپەڕینی زەمەن شوێنەوارێك لە کولتوورەکەیان

نەماوەتەوە. نموونەی وەها بارودۆخێك لە پێكدادانی سەربازیی نێوان مەغۆلەكان و ئێرانییەكان لە سەدەی سێزدەهەمی زایینی ( حەوتەمی كۆچی) بەرچاو دەكەوێ.

مەغۆلەكان بە هێزی سەربازیی زۆر و دڵڕەقی و بێڕەحمی لەڕادەبەدەر، وڵاتی بەرینی ئێرانی ئەوكاتیان هێنایە ژێر ڕكێفی خۆیان و لە ماوەیەكی كورتدا بوون بە دەسەڵاتداری بێئەملاوئەولای ئەو وڵاتە و بۆ پاراستنی دەسكەوتە ناڕەواكانی خۆیان دەستیان بە جۆرێك میلیتاریزم كرد، باجی گرانیان خستە سەر خەڵك و لە ڕێگەی فەرمی و نافەرمی تەنگیان بە خەڵك هەڵچنی. قسەكردن لە زوڵم و زۆرییەكانی ئەو كات كە بەسەر خەڵكی ئێراندا هات لەم نووسینەدا ناگونجێ و پەیوەندیشی بە بابەتەكەی ئێمەوە نییە. بەڵام ئەوەی كە لەم ئاماژەكردنەدا مەبەستی ئێمەیە، ئەوەیە كە زۆری پێنەچوو كە مەغۆلەكان كە هەم لە باری كولتووری ماددی و هەم لە باری كولتووری مەعنەوییەوە بە بەراورد لەگەڵ كولتووری ئێران لە ئاستێكی نزمتردا بوون، لەم كولتوورەدا توانەوە و ئەم تێكەڵاوبوونە تا ئەو جێگەیە بەرەوپێش چوو كە دەسەڵاتدارە دڵڕەقەكانی مەغۆل كە دەسەڵاتێكیان لەسەرووی خۆیان نەدەدیت، هاتنە سەر ئایینی ئیسلام و ڕێوشوێنی كولتووری ئێرانیان گرتەبەر. لە ساڵی ٦٩٤ بۆ یەكەم جار غازان خان موسوڵمان بوو و ئەلجایتوو ناوی "خوابەندە"ی لەسەر خۆی دانا و بە بڕیاری ئۆڵغ بیگ، بۆ بینینی ئەجرامی سەماوی ( خۆر، ئەستێرە، مانگ و .. كە لە ئاسمانن) و پەرەسەندنی توێژینەوەكانی ئەستێرەناسی، چەند شوێنێكی وەك ئاسمان پێو و ڕەسەدخانە ( شوێنێ كە ئەستێرەناسەكان بە ئامرازی تایبەتەوە ئەستێرەكان دەخەنەژێر چاوەدێرییەوە) دروست كرا كە بە نێوی زیگی ئۆڵغ بیگ ناوبانگی دەركرد. عەبباس ئیقباڵ ئاشتیانی لەم بوارەدا دەنووسێ: " دوای زاڵبوونی مەغۆل بەسەر وڵاتانی پێشكەوتووی وەك چین و ئێران و نیشتەجێبوون لە شار، ڕێوڕەسمەكانی مەغۆلی گۆڕانی بەرچاویان بەسەرداهات و لەگەڵ ئەوەی كە بە ڕواڵەت دەبووایە ئەوانیش داب و ڕەسمەكانی شارنشینانی وڵاتە شكست خواردوو ەكانیان مەحكوم و ملكەچ كردبوایە، بە هەمان شێوە كە پاشا و دەسەڵاتدارانی مەغۆل جێگەی پاشا و ئیمپراتۆرەكانی كۆنی ئەم وڵاتانەیان گرتبۆوە، داب و ڕەسمەكانیشیان دەبووایە جێگەی داب و ڕەسمە باوەكانی شارنشینەكانیان گرتبایەوە. بەڵام ڕاست بە پێچەوانە دەرچوو و نەوەكانی چەنگیز دوو وەچە دواتر بە تەواوی ملكەچی حوكمی داب و ڕەسمەكانی ڕەعیەتە شكست خواردووەكانی خۆیان بوون و دەستیان لە بیروباوەڕ و ڕێوڕەسمەكانی باب و باپیرانیان هەڵگرت. واتە وەزیرەكان و ڕاوێژكارەكان و

گەورەپیاوانی هونەری چین و ئێرانی و ئەویغۆری و عیسەوی تۆڵەی بەزین و تێکشـکانێك کە بە زەبری شمشێر دیتبوویان، بە هێزی تەگبیر لە مەغۆلیان وەرگرتەوە و زمان و ئایین و بنەماکانی کارگێڕی و حکومەتی خۆیان بەسەر ئەواندا سەپاند." (١١)

لە ماوەی سێ سەدەدا کە چەنگیزخان و هۆلاکۆخان و تەیموورییـەکان و زنجیرەکـانی دواتـر وەك تورکمانـەکان، قـەراقۆیونلو، ئـاق قۆیونلـوو و ئەتابـەکان و ئـالی جـەلاییر و ... هـەتا دەرکەوتنی سەفەوییە لە ساڵی ٩٠٥ی کۆچی لە ئێراندا دەسەڵاتدار بوون، کولتووری ئێرانـی و بە تایبـەت کۆڵەکـەی گرینگەکـەی واتـە زمـانی فارسـی بـە تونـدی لـە بەرامبـەر هێرشـە کولتوورییەکانی بێگانەدا خـۆی ڕاگـرت و باڵادەسـتیی و هێزپەیداکردنـەوەی سـەرلەنوێی لـە سەرەتاکانی سەدەی هەشتەمی کۆچـییەوە بەڵگـەی ئەمەیـە کـە کولتـووری بێگانـە توانـای خۆڕاگری نەبوو و تێیدا تواونەوە.

لەڕاستیدا هەروەك گوترا زاڵبوونی سەربازیی مەغۆل نە تەنیا نەیتوانی کولتـووری ئێرانـی تووشی نابووتی و لەناوچوون بکات، بەڵکوو ئەو مەغۆلانەی کە لە ئێـران مانـەوە کولتـووری باب و باپیرانیان لەدەست دا و ڕێوڕەسم و زمـان و ئـایینی قـەومی شکسـت خواردوویـان بـە حەزێکی زۆرەوە قبووڵ کرد.

## ٣ــ وەرگـرتنی کولتـوور لـە پەیوەنـدیی لەگـەڵ دەسـەڵاتی داگیرکـەران بەسـەر داگیرکراوەکاندا

جۆرێکی دیکەی پێکدادانی کولتووری پەیوەندیی نێوان داگیرکەران و خەڵکی داگیرکراوە کە دەبێتە هۆی پەیوەندیی دوو کولتوور. ئەم حاڵەتە دەتوانین بە دوو نموونە ڕوون بکەینەوە:

نموونەی یەکەم هەڵسوکەوتێکە کە داگیرکەران لەگەڵ خەڵکی ئەلجەزاییر لە ماوەی نزیك بـە سەد و سی ساڵ ئەنجامیان دا. نموونـەی دووەمـیش ئـەو ڕەفتارانـەی کـە داگیرکـەران لەگـەڵ داگیرکراوە ئەفریقییەکان ( ئەفریقای ڕەش) هەیانبووە. سەبارەت بە ئەلجەزاییر، فەرەنسـییەکان لە ساڵی ١٨٣٠ ئەم وڵاتەیان لە ڕێگەی سەربازییەوە داگیر کرد و هەتا ساڵی ١٩٦٢ کە ساڵی وەدەرنانی ئەوان لە لایەن خەباتگێڕانی ئەلجەزاییرییە، دەسەڵاتیان بەسەر ئـەو وڵاتـەدا هـەبوو. خەڵکی ئەلجەزاییر لە سـەرەتای داگیرکرانـی وڵاتەکـەیان هەنـدێك بـەرگری و خۆڕاگرییـان لـە

بەرامبەر داگیرکەراندا کرد، بەڵام بە هۆی لاوازیی تەکنۆلۆژیا و دەست ڕانەگەیشتن بە چەکە گەرم و پێشکەوتووەکان نەیانتوانی کارێکی ئەوتۆ بکەن. لە ئاکامدا فەرەنسییەکان بەرەبەرە دەسەڵاتی خۆیان جێگیرتر کرد و دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەم وڵاتەدا بە پلەیەك گەیاند کە پێش ڕاپەڕینی چەکدارانەی خەڵکی ئەم وڵاتە، فەرەنسییەکان قسەیان لە ئەلجەزاییری فەڕانسە دەکرد، بە واتایەکی دیکە ئەم وڵاتەیان بە بەشێك لە خاکی فەڕانسە لەقەڵەم دەدا.

لە تەواوی ئەم ماوەیەدا، هەوڵی زۆری دەوڵەتی داگیرکەر بۆ ئەوە بوو کە کولتووری فەرەنسی لە جێگەی کولتووری خۆماڵی ئەلجەزاییر دابنێ، شوناسی نەتەوایەتی و کولتووری ئەوان لەناو ببات. چونکە تەنیا لەم ڕێگەیەوە بوو کە دەیانتوانی بە مەبەستەکانی خۆیان کە پەیوەست بوونی تەواو و هەمەلایەنەی ئەم وڵاتە بە فەڕانسە بوو، بگەن. باسکردنی پەرەسەندنی خەباتی ئەلجەزاییر خۆی بابەتێکی جیاوازە، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا شیاوی ئاماژەپێدانە و مەبەستی سەرەکی ئێمەشە، ئەوەیە کە ڕاپەڕینی خەڵکی ئەلجەزاییر لە ساڵی ١٩٥٤ جەختکردنەوە و پێداگری لەسەر ئەو فاکتەر و بەهایانەیە کە داگیرکەران لە هەوڵی لەنێوبردنیاندا بوون، واتە بەها مەعنەوییەکان و ئەو فاکتەرانەی کە کۆڵەکەکانی کولتووری هەر وڵاتێك پێك دێنن: ئایدۆلۆژیا و زمان. ئەم فاکتەرانە لە ئەلجەزاییر لەگەل ئەوەی کە تووشی زەربە و خەساری گەورە هاتبوون، "بوون" و شوناسی خۆیان پاراست و وەك پشتیوان و پاڵپشتێکی پتەو و قاییم حیسابیان بۆدەکرا.

بەم پێیە، ئیسلامی و عەرەبی کردنی بەها و پێوەرەکان و دامەزراندنی کۆمەڵگەی نوێی دژە داگیرکاری لەسەر ئەم دوو فاکتەرە، بوو بە بنەمای کار و پاڵپشتێك بۆ شۆڕشی ڕزگاریخوازانە. لە ئەلجەزاییری فەڕانسە هەموو دامەزراوە و ڕێکخراوەکان بە پێی ویست و ئایدۆلۆژیای کۆمەڵگەی داگیرکەر ئۆلگووسازی کرابوون و شکڵیان گرتبوو. زمانی فەرمی، زمانی فەرەنسی و یاساکانی ئیداری، فێرکاری و حقووقیش تەواو هاوڕێك بوو لەگەڵ ئەوەی کە لە فەڕانسەدا هەبوو. بەم پێیە دامەزراندنەوەی کۆمەڵگەی نوێ دوای ڕزگاربوونی لە چنگی داگیرکەر لەسەر بنەمای ڕێسا و بەهاگەلێك کە تەنیا ناو و نیشانێکیان لێ بەجێمابوو، کارێکی ئاسان نەبوو. لەگەل ئەمەشدا لەبەر ئەوەی کولتووری پێشووی ئەم خەڵکە بۆ سازکردنەوەی سەرلەنوێ، توانایی و دەوڵەمەندیی پێویستی هەبوو. هەم لە کاتی خەباتی چەکدارانەدا و هەم دوای سەرکەوتنی شۆڕش، ئایدۆلۆژی و زمان وەك دوو ئامرازی بەهێز و دوو پشتیوانی جێی

متمانه هێز و ورەی به شۆڕشگێڕان بەخشی و بەرەبەرە لە ئاستی کولتووریدا بــە ســەربەخۆیی گەیشتن.

ئەوەی کە سەبارەت بە دوو نموونەی پێکدادانی کولتووری لە ئێران و ئەلجەزایێر باسی کـرا، ئەم ڕاستییە وەبیر ئێمە دێنێتەوە کە هێرشە سەربازییەکان، ئەگەرچی دەتــوانن ببنــە هۆکـاری زاڵبوونی قەومێك بەسەر قەومێکی دیکەدا، بەڵام هەمیشە توانایی تەواویان بـۆ لــەنێوبردن و هەڵوەشــاندنەوەی کولتــووری ئــەم قەومــەیان نییــە و ئەگــەر قــەومی شکســت خــواردوو لــە پێشینەیەکی بەهێزی کولتووری بەهرەمەند بێت، بە پشت بەستن بەو پێشینە کولتوورییــە، بــە تایبەت دوو فاکتەری گـرینگ واتــە ئایـدۆلۆژیا و زمــان توانــای خــۆڕاگری و ڕاوەســتانی لــە بەرامبەر شەپۆلی هێرشە کولتوورییە نوێیەکانیان دەبێت.

بەڵام ئەگەر قەومە ژێردەستەکان خاوەن وەها پێشینەیەك نەبن، خۆڕاگری لــە بەرامبــەر کولتووری نوێ ڕووبەڕووی گەلێك کێشە و لەمپەری گەورە و بەهێز دەبێتــەوە. بــۆ نموونــە لــە بابەت هێرشەکانی داگیرکەرانی ئــەورووپا بــۆ وڵاتــە ئەفریقییــەکان کــە خــاوەن کولتــوورێکی دەوڵەمەند نەبوون و دوو کۆڵەکە سەرەکییە کولتوورییەکەیان واتە ئایدۆلۆژیا و زمان توانایی و هێزی تــەواویان نــەبوو، نفــووزی وڵاتــانی داگیرکــەر بــە ئاســانی ســەری گرتــووە. لــە ناوچــە جیاوازەکانی ئەفریقای ڕەش، داگیرکەرانی ئەوروپایی توانیان کلیســا و پەرســتگای خۆیــان لــە قووڵایی لێڕەوارە چڕەکاندا پەرە پێبدەن و زمانی خۆیان بە شــێوەی زمــانی ئیــداری و فــەرمی قەومە داگیرکراوەکان دەربێنن. کولتووری خۆجێیی خەڵکی ئەفریقا کــە نــە لــە بــاری لایــەنی ماددی و نە لە باری لایەنی مەعنەوییەوە خاوەن ئاڵۆزیی و توانایی پێویست نەبوو، نــەیتوانی لە بەرامبەر ئەم هێرشانەدا خــۆی ڕابگــرێ و لــە ماوەیــەکی کورتــدا نموونــە کولتوورییــەکانی ئایدۆلۆژیا و زمانی ئەورووپییەکان وەك دوو کۆڵەکەی گرینگی کولتووری، سەیتەرەیان بەســەر زۆر بەشی بەربڵاوی ئەفریقادا پەیدا کرد و بەم هۆیەوە لە ناوچــەکانی ژێردەســەڵاتی بریتانیــا، زمانی ئینگلیزی و لە ناوچــەکانی ژێــر دەســەڵاتی فەڕانســە، زمــانی فەڕەنســی وەك زمــانی کارگێڕی، بازرگانی، زانستی و بە شێوەی گشتی زمانی فەرمی قبووڵ کرا.

بە کــورتی کولتــووری پێشــوو ئــەم کۆمەڵگەیانــە ئامرازگــەلی خــۆڕاگر و خاترجــەم ،بــۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کولتووری هێرشبەر نەبووە و ئەگەرچی ئەورووپییەکانیش هەنــدێك لــە توخمە کولتوورییە سەرەتایی و پەرەنەسەندووەکانی ئەفریقییەکانیان وەرگرت، بەڵام لەڕاســتیدا

پێکدادانی کولتووری داگیرکەران لەگەڵ کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی ئەفریقا و ئوستراڵیا تا ڕادەیەك بە ڕەوتێکی یەك لایەنە لەقەڵەم دەدرێت.

## دواکەوتنی کولتووری (Cultural lag)

هەرچەند پەیوەندی و کارلێکی دوولایەنەی دیاردە کولتوورییەکان وەك یەکێك لە یاسا سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی، تا ڕادەیەك قبووڵ کراوە، لەگەڵ ئەمەشدا لەوانەیە بەشێك لە کولتوورێك خێزاتر لە بەشەکانی دیکە گۆڕانی بەسەردا بێت و لە ئاکامدا جۆرێك ناهاوئاهەنگی لەنێوان بەشە پێکهێنەرەکانی ئەو کولتوورەوە بێتە کایەوە. ئەم ڕەوشە بە تایبەت لە کۆمەڵگەکانی لە حاڵی گەشەسەندندا زیاتر خۆی دەردەخات.

هەندێك لە یاسا و ڕێساکانی ڕێکخراوەکان یان دیاردە کۆمەڵایەتییەکان کە وەڵامدەرەوەی پێداویستییە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگەن لە هەندێك لە برگە مێژووییەکاندا دێنە ئاراوە یان دەگۆڕێن و پێکهاتەکانی دەسەڵاتیش لە پەیدابوونیدا دەستیان هەیە. بەڵام هەبوونی هەندێکی دیکە لە توخمە کولتوورییەکان کە پەیوەندییان لەگەڵ توخم یان توخمە نوێیەکانی بگۆڕەکە هەیە، دەمێننەوە و کەمتر تووشی گۆڕان دەبن یان گۆڕانەکەیان زۆر لەسەرەخۆیە.

لە ڕوانگەی "ئۆگبێرن"ەوە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام شتێك کە دواکەوتوویی گۆڕانی بوارەکانی کولتووری پێدەگوترێ لەگەڵ خۆیان هەیە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، کاتێك کە لە دو یان چەند یەکەی کولتووری پێکەوەبەستراو لە کۆمەڵگەیەکدا، یەکە یان تایبەتمەندییەك گۆڕانی بەسەردابێت و یەکە یان تایبەتمەندییەکانی دیکە نەگۆڕێن یان زۆر بە هێواشی بگۆڕێن و بۆ ماوەیەك بمێننەوە، مەسەلەی دواکەوتوویی کولتووری دێتە پێشەوە.

هەندێك لە کۆمەڵناسان پێیان وایە کە گۆڕانکارییە کولتوورییەکان زیاتر لە کولتووری ماددیدا دێنە کایەوە. بۆ نموونە لە تەکنۆلۆژیادا هەندێك گۆڕانکاری دێتە پێشەوە کە کۆمەڵگە قبووڵی دەکات بەڵام لە بەهاکان، نۆرمەکان و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کۆمەڵگەیەدا کەمتر گۆڕان ڕوودەدا یان گۆڕانەکە زۆر لەسەرەخۆ و شاراوەیە. ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەکە لەنێوان توخمە هاوئاهەنگە کولتوورییەکاندا هاوسەنگیی لەنێو بچێت و دواکەوتوویی بێتەپێش. چونکە توخمە نامادديیەکانی کولتوور ناتوانن پێبەپێی توخمە مادديیەکانی کولتوور بگۆڕێن. تیۆری دواکەوتوویی کولتووری سەرەتا لە لایەن "ئۆگبێرن"ەوە خراوەتەڕوو. ناوبراو لەم

بوارەدا ناهاوئاهەنگی نێوان گۆڕانکارییەکانی دوو توخمی ماددیی کولتوور واتـە ئوتۆمبێـل و جادە یان شەقام بە نموونە دێنێتەوە. ئوتۆمبێل بە خێرایی دەگۆڕدرێت، هەم ژمارەکەی و هـەم خێراییەکەی، بەڵام پانایی جاددەکە پێبەپێی خێرایی یان ژمـارەی ئوتۆمبێـل ناگۆڕێـت و لـە ئاکامدا دواکەوتوویی کولتووری دێتەپێشەوە. قورسایی تڕافیك دەرەنجامی ئـەم دواکەوتووییـە کولتوورییەیە. هەر لەم بوارەدا ناهاوئاهـەنگیی لـە بـواری کـەڵك وەرگـرتن لـە ئوتۆمبێـل و لەبەرچاوگرتنی یاسا و ڕێسـاکانی هاتووچـۆ وەك جۆرێـك لـە دواکـەوتوویی کولتـووری دێتـە ئەژمار. دەتوانرێ ئەم دیاردەیە لە شارە گەورەکانی ئێران بە ڕوونی ببینـرێ. لـە درێـژەی ئـەم بابەتەدا دەتوانین بڵێین کە کەڵك وەرگرتن لـە ئوتۆمبێـل لـەو جـۆرە شـارانەدا پێویسـتی بـە لەبەرچاو گرتنی ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:

**١ـ زانیاریی لەسەر یاسا و ڕێساکانی هاتووچۆ**

**٢ـ لەبەرچاوگرتنی ئەو یاسا و ڕێسایانە**

**٣ـ خۆڕاگری و خۆدوورگرتن لە خۆپەرستی**

**٤ـ ڕێز و حورمەت**

کەوایە ئەگەر ئەو کەسانەی کە کەڵك لە ئوتۆمبێل وەردەگرن بـەبێ لەبەرچـاوگرتنی ئـەم خاڵانە لە شارێکی پڕحەشیمەتدا ترۆمبێل (سەیارە) لێبخوڕن، کێشە و گرفت و ناڕەحەتییـەك دێتـە پێشـەوە کـە هـەموویان ڕەنگدانەوەیـەك لـە دیـاردەی دواکـەوتوویی کولتـوورین. بـە دەربڕینێکی تر لەم نموونەیەدا لەلایەنی ناماددی ئەم دیاردەیە لـە کۆمەڵگـەی شارنشـیندا بـە بەراورد لەگەڵ لایەنی ماددی دواکەوتووترن، بەرچاو دەکەوێ و لە ئاکامدا زۆر لـە کێشـەکانی تڕافیکی ناو شارەکانی سەرچاوەگرتوو لە دواکەوتوویی کولتوورین.

## وردەکولتوور (Sub-Culture)

گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی وەك: تایفە، عەشیرە، عێل و تیرە و گرووپە لۆکاڵی و ناوچـەییەکان، گرووپەکانی تایبەت بـە شـوێنێك وەك خـەڵکی ناحیەیـەك، گونـدێك، یـان گرووپـە پیشـەییەکان، خزمایەتییەکان، کەمایەتییە ئایینی و سەرەنجام توێژە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەیەك، هەر یەکێکیان کولتووری بچووکی تایبەت بەخۆیان هەیە کە لەناو چوارچێوەی گرووپی کۆمەڵایـەتی تایبەت بە خۆیاندا دەخرێتەڕوو و بە شێوەیەکی گشتی سروشت و فۆرمێکی تایبـەتی و خـۆجێیی و ناوچەیی هەیە. ئەم کولتوورە کە لەهەمانکاتدا هاوئاهـەنگی لەگـەڵ کولتـووری گشـتی کۆمەڵگـە

هەیە و پێڕەوی لە نۆرمەکانی دەکـا، وردەکولتـوور (Sub-Culture)یـان بەشـە کولتـوور(Part-Culture)ی پێدەڵێن. بەشەکولتوورەکان لـە نـاو چـین و توێژەکۆمەڵایەتییـەکانی کۆمەڵگەیـەکی شارنشینیش بەرچاو دەکەون.

شێوەزارە ناوچەییەکان، شێوازی تایبەتی هەڵبژاردنی هاوسەر، بۆ وێنـە پێـدانی شـیربایی، خەڵات و کردەوەکانیان لە ڕێوڕەسمـەکانی ژن گواسـتنەوەدا و پێکهێنـانی بنەماڵـەی نـوێ لـە کۆمەڵە عێڵی و گوندنشینییەکان، بە تایبـەت ئەوانەیکـە بـە شـێوەی گرووپـی خزمایـەتی و عەشیرەتی بە شێوەی جیا لـە یـەکتر و لـە پـەنا یـەکتر ژیـان بەسـەر دەبـەن، جۆاوجـۆریی و فرەچەشنی وردەکولتوورەکان لەهەندێك بابەتدا پیوەندیی ئالۆز و شـەڕخوازانەی نێوانیـانی لـێ دەکەوێتەوە کە زۆرجار شەڕ و لێدان و بگرە و بەردەی لێ سەر هەڵدەدا.

لـە هەنـدێك لـە ئاواییـەکان بـە هـۆی هـەبوونی تایفـە و عەشـیرەتی جۆراوجـۆر، هاوسەرگیرییەکان لایەنی ناوخۆیی و ناوگرووپییان هەیـە و لـە چوارچـێوەی ئـەو گرووپانـەدا بەڕێوەدەچێ. بۆ وێنە سەهلاوا، ئاواییەك لە قووچان کە لە دوو گرووپی تاییفەیی کوردەکـان و بەرەبەرەکان پێك دێت، ڕادەی شیربایی جیاوازی هەیە و شێوازی هاوسـەرگیری نـاوخۆیی یـە و هەر تاییفەیەك وردەکولتوورێکی هەیە.

گرووپە تاییفەییەکان کە لە شوێنە جۆراوجۆرەکانەوە بەرەو ئاواییەك دەڕۆن، و لـەوێ هـەر یەکێکیان لە شوێنی جیا لە یەکتر جێگیر دەبن، هەرچـەند وردەوردە و بـە تێپـەڕینی ڕۆژگـار لەژێر کاریگەریی کولتووری گشتیی گوند و بەرەنجامی کاریگەریی کارلێکە دوولایەنەییەکان و ئالۆگۆڕی کولتووری ئەواندان، بەڵام لەهەمان کاتدا وردە کولتوور یان کولتـوورێکی تاییفـەیی تایبەتیان هەیە.

جیاوازییە کولتوورییەکان بۆ هەندێك لە گرووپەکان کە مەودای شـوێنیی زیاتریـان لەگـەڵ تاییفەکانی دیکەی گوند هەیە، هەستپێکراوترە.

توێژینەوە زمانناسی و ئەنترۆپۆلۆژییەکان، بوارێکی لەبار بۆ تاوتوێی وردەکولتوورەکان دەرەخسێنن. توێژینەوەی ئەنجامدراو لە ئاوایی فەردیسی وەرامین، وردەکولتوورەکـان لـە گۆشە نیگای زمانناسانەوە ئاشکرا دەکات. دەزانین کە بۆ مێردەکانی دوو خوشك، زاراوەی " ئاوەڵزاوا" کە لە زمانی ئاخاوتنی هەموو کۆمەڵگەی فەردیسدا باوە، بەکار دێت. بەڵام هـەر لـەم کۆمەڵگەیـەدا زاراوەیـەکی وەك " هـاوزولف" لـە گرووپـی تاییفـەیی سەبزەوارییەکان، "هاو پاچە" لە گرووپی تاییفەیی خالیدئابادی کاشان و "هاوڕیش" لـە

گرووپی تایبەتی فارسییەکان کە هەموویان لە ناوچەگەلی جۆاوجـۆرەوە بـەرەو فـەردیس کۆچیان کـردووە و لـەوێ نیشـتـەجێ بـوون، بـەکار دێـت. ئـەم زاراوە شـێوەزارییانە بـە تایبەتمەندییەکانی وردەکولتوور لەقەڵەم دەدرێن. (١٢)

## ئێتنۆسەنتەریزم (Ethnocentrisme)

کاتێك کە گوندنشنێکی لێوارەکانی دەریای باکوور، لە زەماوەندی گونـدێکی لێـواری دەریای باشووردا بەشدار بێ و ببینێ کە زاوایان سواری وشتر کردووە و بەتەپڵ و دەهۆڵ و چەپڵەلێدان بەدوایدا دەڕۆن و بەرەو ماڵی بـووکی دەبـەن و ئـەو چـەند شـەوی سـەرەتای زەماوەندەکە ( ٣ هەتا ١٥ شەو) دەبێ لە ماڵی خەزووریدا بەسەر ببات، ئەو شتە لەگەڵ نۆرم و بەها کولتوورییەکانی کۆمەڵگەی خۆی هەڵدەسەنگێنێ و بە گاڵتەجارەوە دەڵێت کە کاری ئەمانە ناڕاستە. هەر بەم شێوەیە کاتێك کە گوندنشینێکی لێواری دەریای باشـوور لە زەماوەندی کەسێکی لێواری دەریای باکووردا بەشداری بکـات و ببینـێ کـە بووکیـان سواری ئەسپ کردووە یان بە پێیان بەرەو ماڵی زاوای دەبەن، ئەوە بە شـتێکی ناشـیرین و ناحـەز دەزانـێ. بـەم هۆیـەوە لـە ڕوانگـەی ڕۆژئاواییەکانـەوە ڕەفتـار و کردەوەکـانی دانیشتووانی وڵاتە غەیرە ڕۆژئاواییەکان، ناڕاست، سەرسوڕهێنەر و بە پێچەوانەی ڕێساکان دێتە ئەژمار. ئەوان لـە بینـینی شـێوازەکانی ژیـان و داب و ڕەسمـەکانی خـەڵکی وڵاتـە جۆراوجۆرەکان و بەراوردکردنیان لەگەڵ خەڵکی ئەورووپایی ئەوان بە سەرەتایی و دڕندە و وەحشی دەزانن و بە سووکی لێیان دەڕوانن.

هێرسکۆویتس دەڵێ: دادوەریکردن لە هەڵسەنگاندنی بابەتە کولتوورییەکان لەسەر بنەمای ئەزموونە تاکەکەسییەکان ڕاوەستاوە و هەر تاکێك ئەزموونی خۆی لە چوارچێوەی کولتوورێـك کە تێیدا پەروەردە بووە، دەردەبڕێ. (١٣)

لەنێو سورپێستەکانی ئەمریکادا لە بواری ئێتنۆسەنتەریزمدا ئەفسانەیەکی جوان هەیە. لە ڕۆژگارێکدا کە کەس بوونی نەبوو، خواوەند هەندێك پەیکـەری بـە شـێوازی ئینسـان لـە گـڵ دروست کرد و لە کورەدا دانیان و ئاگری تێبەردان. بەڵام ئەوەندە ڕانەوەستا بۆ ئەوەی کە ببینێ پەیکەرەکە چ شکڵێکی وەرگرتووە. پەلەی کرد و لە کورەکەی دەرهێنایەوە و بـینی کـە سـوور نەبۆتەوە و ڕەنگێکی سپی هەیە و ڕوحی بەبەردا کرد و ڕەگەزی سـپی پەیـدا بـوو. بـۆ جـاری دووهەم کەمێك زیاتر سەبری کرد و لە ئاکامدا پەیکـەری دووهـەم سـوور و جـوان ببـوو، بـە

شێوەیەك كە خوا شەیدای سەیركردنی بوو و لەبیری كرد كە پەیكەرێكی دیكەش لەناو كورەكەدایە. كاتێك هێنایەدەرەوە، دیتی كە بە تەواوەتی سووتاو و ڕەش بووە و بەم شێوەیە ڕەگەزی ڕەش دروست بوو و كاتێك ڕوحی بەبەر پەیكەری دووهەمیشدا كرد، ئەوا ڕەگەزی سوور پەیدا بوو.

هێرۆدۆت غەیرە یۆنانییەكانی بە بەربەر و مۆنتسكیۆ غەیرە ئەوروپییەكانی بە درندە و وەحشی لەقەڵەم دەدا. لە ئەفسانە و حەماسەكانی نەتەوە جۆراوجۆرەكاندا، دیاردەی ئێتنۆسەنتەریزم بەرچاو كەوتووە. دەستەواژەی" هونەرلای ئێرانییەكانە و تەواو" لە مێژووی زۆر لە میللەتان دەبینرێ. " ئێتنۆسەنتەریزم" حەزێكە بۆ پێوان و هەڵسەنگاندنی كولتوورەكانی دیكە بەپێی كولتووری خود یان بە دەستەواژەیەكی دیكە ئێتنۆسەنتەریزم بریتییە لە بە كەم وێنە نیشاندانی كولتووری خود و حەزكردن بە جیاكردنەوە و لەسەرتردانانی كولتووری كۆمەڵگەی خۆت بەسەر كولتوورەكانی دیكەدا. مرۆڤ لە بەراوردكردنی كولتووری خۆی لەگەڵ كولتووری گرووپەكانی دیكەدا، هەمیشە كولتووری خۆی لە ناوەند دادەنێ و لەگەڵ كولتوورەكانی دیكەدا بەراوردی دەكات و كولتووری قەومی خۆی بە باشتر دەزانێ.

دادوەریكردن و هەڵسەنگاندنی كولتووری قەومەكانی دیكە لەسەر بنەمای پێوەرەكانی كولتووری خود، بە سەرترزانینی تایبەتمەندییەكانی كولتووری خۆت بەسەر كولتووری خەڵكی دیكە و بە سووك سەیركردنی ئەوان دیاردەی ئێتنۆسەنتەریزم نیشان دەدات. وەك نموونەیەك بۆ ئێتنۆسەنتەریزم یەكێكیان ئەوەیە كە خەڵكی شار خۆیان بە باشتر لە خەڵكی گوند دەزانن. بەكارهێناوی وشەی " دێهاتی" كە لە ڕابردوودا زیاتر باوی هەبوو، نیشانەیەك لەم هەستی خۆبەزلتر زانینی شارنشینەكانە.

دیاردەی ئێتنۆسەنتەریزم لە بەرهەمەكانی گەڕیدەكان، مێژوونووسان و مرۆڤناسە سەرەتاییەكان كە خەریكی توێژینەوەی مەیدانی و وەسفی شێوازەكانی ژیانی خەڵك بوون، زۆر بەرچاو دەكەوێ. لە سەدەی نۆزدەهەم كە بەكارهێنانی شێوازە زانستییەكان لە بواری توێژینەوە كۆمەڵایەتییەكان برەوی هەبووە، كۆمەڵناسان و خەڵكناسان هەستیان بەوە كردووە كە دەتوانرێ گشت دیاردە كولتوورییەكان لە ڕوانگەی زانستی شرۆڤە و ڕوون بكرێنەوە.

دیاردەی ئێتنۆسەنتەریزم لە گشت كۆمەڵگە مرۆییەكاندا بەرچاو دەكەوێ بەڵام ڕادەكەی لە تاكەكاندا بەهێز یان لاوازە. خوێندەواران كەمتر لە نەخوێندەواران ئێتنۆسەنتەریستن. لە كۆمەڵگەی نەریتی و گرووپە سەرەتاییەكاندا ئێتنۆسەنتەریزم زیاترە.

لەوانەیە تیۆری پەیوەندیدار بە دەمارگیری دەربارەی ئێتنۆسەنتەریزمیش بتوانرێ بەکار بێت. هەر قەوم و گرووپێك کە تێیدا دەمارگیری بەهێزترە، ئێتنۆسەنتەریزمیش بەهێزترە. بەڵام بەرەبەرە بە پەرەسەندنی کۆمەڵگە و ئاڵوگۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە جۆری یەکەم بۆ جۆری دووەم کە لەسەر بنەمای لۆژیك ڕاوەستاوە، ئێتنۆسەنتەریزم کەم دەبێتەوە. ئێتنۆسەنتەریزم خاوەن دواهات و دەرەنجامگەلێکە کە دەتوانرێ بەسەر دوو جۆری جیاوازدا دابەش بکرێ:

## ١. دەرەنجامە ئەرێنییەکانی ئێتنۆسەنتەریزم

لە تایبەتمەندییە ئەرێنییەکانی ئێتنۆسەنتەریزم، بەهێزکردنی هاوپێوەندیی کۆمەڵایەتی، هەستی وەفاداری بە قەوم و گرووپی کۆمەڵایەتی، پەرەستاندنی ڕوحی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرییە کە لە هەندێك لە کاتەکان بە تایبەت لە سەردەمی شەڕ گرینگییەکی زۆری هەیە. چونکە پێویستە کە ئەم باوەڕە لە کۆمەڵگەدا بوونی هەبێ کە بەها کۆمەڵایەتییەکان، باوەڕ و نەریتە نەتەوەیی و نیشتمانییەکان سەرتر لە هی دوژمنن و ئەم کارەش گرینگە کە خەڵك ڕوانینێکی نەرێنی و قێزەون و ڕەشبینانەیان بۆ سیستەمی حکومەتی و بەها کۆمەڵایەتییەکانی دوژمن هەبێ.
بەم هۆیەوە بەهێزیی ئێتنۆسەنتەریزم پلەیەکی بەرزی لە نەتەوەخوازی و نیشتمانپەرستی بەدواوە بێت و بواری کۆمەڵایەتی بۆ پاراستنی یەکێتیی نەتەوەیی دەستەبەر دەکات.

## ٢. دەرەنجامە نەرێنییەکانی ئێتنۆسەنتەریزم

یەکێك لە دەرەنجامە نێگەتیڤەکانی ئێتنۆسەنتەریزم ئەوەیە کە پێش بەو داهێنان و نوێخوازییانە دەگرێ کە بۆ کۆمەڵگە بەسوودن. چونکە بەها و ئەندێشە و هزرە بیانی و دەرەکییەکان بە ناراست دەزانێ و کۆمەڵگە لە وەرگرتنیان خۆ دەبوێرێ. بەم هۆیەوە ئێتنۆسەنتەریزم لە قۆناغی زێدەرۆیی خۆیدا گشت هزرە نوێیەکان و تایبەتمەندییەکانی کولتوورەکانی دیکە ڕەت دەکاتەوە و لە ئاڵوگۆڕ و دەوڵەمەندیی کولتووریی پێشگیری دەکات.

## ڕێژەیی کولتووری (Cultural.relativity)

کولتوور بابەتێکی ڕێژەیی یە، هەر دیاردەیەکی کولتووری تەنیا لەسەر بنەمای پێوەرەکانی نێو کۆمەڵگە و ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ گشت کولتووری ئەو کۆمەڵگەیە هەیەتی، دەتوانرێ ڕوون بکرێتەوە و لێی تێبگەین. چونکە لە کولتوورێکدا لەوانەیە کردەوەیەك پەسندکراو و ئەخلاقیی بێ بەڵام لە کولتوورێکی دیکەدا بە نەشیاو و بێئەخلاقی لەقەڵەم بدرێ و بەم هۆیەوە ناتوانرێ کولتوورەکان پۆلێن بەندی بکرێن و هەندێکیان لەسەرووی هەندێکی دیکە دابنێین. ناتوانرێ سیستەمی باوکسالاری بە سەرتر یان نزمتر لە سیستەمی دایکسالاری دابنرێ یان ئەوەکە بڵێین یەکهاوسەری لە فرەژنی باشتر یان خراپترە. ئەم دیاردانە تەنیا لە چوارچێوەی ئەخلاقی تایبەتی کۆمەڵگەدا شیاوی ڕوونکردنەوەن و لە ڕوانگەی خەڵکی ئەو کۆمەڵگەیەوە بە کردەوەگەلێکی ئەخلاقی و وەك نۆرم دێنە ئەژمار. چەمکی ڕێژەیی کولتووری پێشینەیەکی زۆر دوور و درێژی هەیە و نزیك بە سەدەیەکە.

ویلیام گراهام سامنێر (William Graham Summner) یەکەم کەس بوو کە لە کتێبی شێوازە قەومییەکاندا، چەمکی ڕێژەیی کولتووری خستەڕوو. ناوبراو هەر چەشنە دادوەرییەکی بەهایی و پێوەری ئەخلاقی و ڕەهای لە هەڵسەنگاندنی دیاردە کولتوورییەکاندا ڕەت دەکردەوە. بە بۆچوونی ئەو دەتوانرێ کولتوور یان چەند بەشێك لە کولتوور ( وردەکولتوور) تەنیا بە پێوەری ناوەڕۆکی، جوگرافیایی، مێژوویی و کۆمەڵایەتیی خودی ئەو کولتوورە تاووتوێ و ڕوون بکرێتەوە.(١٤)

هێرسکۆویتس (Herskovits) دەرخستن و خستنەڕووی "ڕێژەیی کولتووری" بە گەورەترین دەسکەوتی مرۆڤناسی دەزانێ، بە بڕوای ڕۆس بێنێدیکت (Ruth Benedict) دەبێ کولتوورەکان لە ناوەوەی کۆمەڵگەی تایبەت بەو کولتوورەدا ڕوون بکرێنەوە. دەتوانرێ بگوترێ کە هەر کولتوورێك کۆکراوەیەکی یەکگرتوو و یەکپارچەیە کە تەنیا بە دیراسەکردنی گشتێتی ئەو کولتوورە شیاوی تێگەیشتن و شرۆڤەکردنە. جیاکردنەوەی هەندێك لە توخمە کولتوورییەکان بە مەبەستی بەراوردکردنیان لەگەڵ کولتوورەکانی دیکە کارێکی نازانستییە. بە دەستەواژەیەکی دیکە هەر بەش یان توخمێك لە کولتوور لە ناوەڕۆکی خۆیدا خاوەن واتایە و بە شێوەی ئەبستراکت و جیاواز و لە دەرەوەی ناوەڕۆکی خۆی واتا نادات.

بۆنموونه دیاردەکانی "شیربایی" و " فرەژنی" دەکرێ تەنیا لە ناو پێکهاتەی کۆمەڵایــەتی تایبەت لە کۆمەڵگەی گوندنشینی شــرۆڤە بکرێــت. جیاکردنــەوەی ئــەم چــەمکانە لــە دەقــی کولتووریێکی تایبەت کە ئەم دیاردانەی تێدا خوڵقاون و بــەراوردکردنیان لەگــەڵ کولتوورەکــانی دیکە شتێکی نەگونجاو و پەسندنەکراوە. تەنیا بە ناسینی خێزان لــە کۆمەڵگــەی گوندنشــینی وەك یەکەیەکی بەرهەمهێنانی کشتووکاڵی و هەروەها ناسینی کۆمەڵە کولتووری هاوسەرگیری وەك گواستنەوەی هێزی کار لە خێزانێکــەوە بــۆ خێزانێکــی دیکــە، دەکــرێ دیاردەکــانی وەك "شیربایی" و " فرەژنی" باسیان بکرێ و شرۆڤە بکــرێن. چــونکە لــەناو ئــەم کولتوورانــەدا " شیربایی" وەك نرخی شیری هێزی کار (ژن)ــەکەیە کە لە بنەماڵەی بووکــەوە بــۆ زاوا ( پیــاو) دەگوازرێتەوە و فرەژنی لە پەیوەندیی لەگەڵ پەرەسەندنی چالاکییەکانی وەبــەرهێنانی خێــزان و بەشداریی ژن لە بەرهەمهێنان و پێویستیی خێزان بە هێزی کار زیاتر مانا پەیدا دەکەن.

بەم پێیە دەتوانرێ بگوترێ کە تیۆری رێژەیی کولتووری لەسەر بنەمای ئەم راستییە دانراوە کــە هــەر کولتووریێــك کۆمەڵەیــەکی یــەکگرتوو لــە ئۆلگــوو فکــری و رەفتارییــەکان و تایبەتمەندییەکانی گونجاو لەگــەڵ پێکهاتــەی کۆمەڵایــەتیی کۆمەڵگــە لــەخۆ دەگــرێ کــە بــە گۆڕانکاریی رێژەیی لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە و لــە درێــژایی زەمەنــدا بەردەوام دەبێ.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی شەشەم

١ـ حسين اديبی، زمينه انسان شناسی، انتشارات پيام، ١٣٥٥، فصل سوم.

٢ـ داريوش أشوری، تعريفها و مفهوم فرهنگ، انتشارات مركز اسناد فرهنگی أسيا، ١٣٥٧، ص ٣٩.

٣ـ علی شريعتی، فرهنگ، تمدن و ايدئولوژی، ص.٣

٤ـ فرهنگ و زندگی، شماره ٢، ١٣٤٢، ص ١١٦.

٥ـ سيد مهدی ثريا، مقدمات انسان شناسی، جزوه درسی دانشكده علوم اجتماعی، دانشگاه تهران، ص ١٥ و ١٦.

٦ـ محمدعلی اسلامی ندوشن، فرهنگ و شبه‌فرهنگ، توس، ١٣٥٥، ص.١٤

٧ـ داريوش أشوری، تعريفها و مفهوم فرهنگ، انتشارات مركز اسناد فرهنگی أسيا، ١٣٥٧، ص ١٣.

٨ـ محمود روح الامينی، دفتر همكاری حوزه و دانشگاه، جزوه شماره ٣٠، ص.٤

٩ـ مالك بن نبی، مسئله فرهنگ، ترجمه جواد صالحی، انتشارات قلم، ١٣٥٩، ص ٣٦.

١٠ـ دوبرولسكی، فرهنگ روستايی در كتاب مسائل جامعه‌شناسی روستايی، جلد١، ترجمه مصفی ازكيا، محمد مهاجر ايروانی، علی اكبر نيك خلق، انتشارات روزبهان، ١٣٦٨، ص ٩٧.

١١ـ تاريخ مفصل ايران، تأليف عباس اقبال اشتيانی، ص.٤٤٩

١٢ـ علی اكبر نيك خلق، سهل أباد دهكده‌ای از قوچان، موسسه مطالعات و تحقيقات اجنماعی دانشگاه تهران، سال ١٣٥١، ص.٥٠

١٣ـ علی اكبر نيك خلق، واحدهای كار زراعی و خويشاوندی در فرديس ورامين، موسسه مطالعات و تحقيقات اجنماعی دانشگاه تهران، سال ١٣٥٢، ص.٢٧

١٤ـ موسسه مطالعات و تحقيقات فرهنگی، فرهنگ، كتاب دوازدهم، پاييز ١٣٧٢، ص١٧٣.

# بەشی حەوتەم

## دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان

### پێناسەکان

دامەزراوە هاوواتای وشەی (Institution) فەرەنسی و ئینگلیزییە کە لە لاتینندا بە شێوەی "Institutio " بە واتای بونیاد، دامەزراوە و، وشەی (Institucre) بە واتای جێگیرکردن، دروستکردن و قاییم کردن وەرگیراوە. (١) کۆمەڵناسە فەرەنسییەکان چەمك و پێناسەی جیاجیا دەربارەی دامەزراوە دەخەنەڕوو.

دۆرکایم لە پێناسەی کۆمەڵناسییدا ئەو زانستە بە زانستی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەزانێ، مەبەستی ئەو لە دامەزراوەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵە یاسا و بنەماگەلێکی ئاڵۆزە کە لە کۆمەڵگەدا بوونی هەیە و بەسەر ڕەفتاری تاکەکاندا زاڵە، بە شێوەیەك کە سەرپێچی لێکردنی مەیسەر نابێ. لەڕاستیدا دامەزراوە بەهەموو بیروڕا و بۆچوون و نموونە ڕەفتارییەکان دەگوترێ کە لە لایەن کۆمەڵگەوە دامەزراوە.

مارسێل مووس (Marcel Mauss) کۆمەڵناسی فەرەنسی و قوتابیی دۆرکایم لە پێناسەی دامەزراوەدا دەڵێ: دامەزراوەکان کردەوە و بیروڕا کۆمەڵایەتییەکانن کە تاك لە سەرەتای لەدایکبوونییەوە لە بەرامبەر خۆیدا بە ئامادەکراوی دەیانبینێ و گواستنەوەی ئەم کردەوە و بیروڕایانە لە ڕێگەی فێربوونەوە جێبەجێ دەکرێ.(٢)

ئۆگبێرن و نیمکۆف له پێناسەی دامەزراوەدا دەڵـێن: کارکردەکـانی کۆمەڵگـە ڕەوتگـەلی ئالۆزی جۆراوجۆر بەدی دێنن و ئەم ڕەوتە دیاردەیەکە بە گۆڕانیی بەردەوامیی زەمەنییەوە. بـە تۆڕێك لەو ڕەوتە ئالۆزە کۆمەڵایەتییانە کە بەرەوڕووی ئامانجێکی دیاریکراوە و گشتێك بـەدی دێنیٚ، دامەزراوەی کۆمەڵایەتی دەگوتریٚ.(٣)

جۆزیف ڕۆسك (J.Roucek)و ڕۆڵند وارن (R.Warren)دامەزراوەی کۆمەڵایـەتی بـە پێوانەگەلێکی جێگیر بۆ دابینکردنی پێداویستییە فرەچەشنە مرۆییەکان دەزانن و لیستێر وارد (L.Warde) و هانری پرات (H.prate) دامەزراوەی کۆمەڵایـەتی بـە هۆکـاری کـۆنترۆڵ و چاوەدێری کۆمەڵایەتی دەزانن.

فیختێر (Fichter)دامەزراوە بە پێکهاتەیەك لە ئۆلگوو ڕەفتارییەکان دەزانیٚ کە لەلایـەن گرووپێکی بەچاو لە خەڵك بە کار دێت و تەوەرەکەی دابینکردنی پێداویستییەکی سەرەکییە.

لە ڕوانگەی لینتۆن (Linton) دامەزراوە کۆمەڵەیەك لـە نموونـە کولتوورییەکانـە و وەك گشتێك، کردەوەگەلێکی تایبەتیی بە ئەستۆوەیە. مالینۆفسکی (Malinowski) مرۆڤناسی بەریتانی دامـەزراوەکان بـە بەشـە ڕاسـتەقینەکانی کولتـوور دەزانـیٚ کـە تـا ڕادەیـەکی زۆر بەردەوامیی، گشتێتی و سەربەخۆییان هەیە.

پارسـۆنز (Parsons) دامـەزراوە بـە کۆمەڵـە ڕۆڵـی کۆمەڵایـەتی ڕێکخـراو یـان پەیوەندییەکانی نێوان پێگە کۆمەڵایەتییەکان دەزانیٚ کە خـاوەنی چـەمکگەلی پێکهاتـەیی و ئامانجگەلی درێژخایەنن.

وادێتە بەرچاو کە فرەچەشنیی پێناسەکان لە دامـەزراوەی کۆمەڵایـەتی بـەم هۆیەیـە کـە کۆمەڵناسان لە پێناسەی دامەزراوەی کۆمەڵایەتیدا هەر یەکێکیان گرینگییان بـە یـەکێك لـە لایەنەکانی داوە. بۆ نموونە ئەگەر خێزان وەك دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی لەبەرچاو بگیریٚ کـە گەلێك لە پێداویستییەکانی ئەندامەکانی دابین دەکا، ئەم پێناسەیە تەواو نییە، چونکە ئەرکی خێزان تەنیا دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەندامەکانی نییە بەڵکوو لە هەمان کاتدا ئـەرك و کردەوەی دیکەشی بە ئەستۆوە هەن، بۆ نموونە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان فێری منداڵەکان دەکـا، چاوەدێری بەسەر ڕەفتارەکانیاندا دەکا بۆ ئەوەی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوازێکی دروست لەبەرچاو بگرن و جێبەجێیان بکەن. ڕێکخستنی پەیوەندییە سێکسییەکان، زاووزوێ و سەرەنجام بەرداەمیدان بە وەچە و مانەوە و پایەداربوونی کۆمەڵگەش کۆمەڵێکی دیکـە لـە ئەرکـەکانی خێزانن.

لە ڕوانگەی زۆربەی کۆمەڵناسانەوە دامەزراوە کۆمەڵەیەك لە ڕۆڵەکانە، بۆ نموونە خێزان وەك دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی چەند ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی لە خۆیدا کۆ کردۆتەوە وەك ڕۆڵی باوك، دایك، ژن و مێرد، کوڕ، کچ و هەروەها ڕۆڵی پیاو وەك بەڕێوەبەری یەکەیەکی بەرهەمهێنان لە خێزانی گوندنشیندا و ڕۆڵی منداڵەکان وەك کرێکارانی یەکەیەکی بەرهەمهێنان و ...

هەروەها زانکۆش دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە کە کۆمەڵێك ڕۆڵی گرتۆتەخۆ، ڕۆڵی مامۆستا، خوێندکار، بەڕێوەبەر یان سەرپەڕشتی گرووپی فێرکاری، فەرمانبەران، ئەندامانی لیژنەی زانستیی زانکۆ، هەر کام لەو ڕۆڵانە لەسەر بنەمای بەهاپێدانی کۆمەڵگە، پێگەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەتی هەیە و لەنێوان ئەو تاکانەی کە خاوەنی ئەم پێگانەن، چ لەناو خێزان و چ لە زانکۆکان پەیوەندیی و کارلێکی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی بوونی هەیە کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دووپات دەبێتەوە و بەردەوام و جێگیر دەبێ و بە شکڵی نۆرمی کۆمەڵایەتی دەردێت و دەپارێزرێ و لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەدا بایەخ و گرینگیی پەیدا دەکات. بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە دامەزراوە کۆمەڵەیەك لە ڕۆڵەکان، پێگەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ڕێکوپێك و بەردەوامەکانە بە ئەرك و کردەوەگەلێکی دیاریکراوەوە کە لە درێژەی زەمەندا بەردەوام دەبێ.

بە دامەزراوەیی بوون پرۆسەیەکە کە لە ماوەیدا کارلێکە دوولایەنەکان و ئەزموونە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی دووپات بوونەوە، ڕێکوپێکی بەخۆوە دەگرن و بە شێوەی دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی جێگیر و بەردەوام دەردێن. لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانرێ بگوترێ کە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان خۆڕسکن و لە هەناوی کۆمەڵگەوە دەردەکەون، شکڵ دەگرن و بە شێوەی نموونە ڕەفتارییە ڕێکوپێك و لەبارەکان لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دیکە دەگوازرێنەوە.

بە دەستەواژەیەکی دیکە، دامەزراوە نموونە ئاشکرا و شاراوە هاوبەشەکانی گرووپی کۆمەڵایەتییە کە لە چوارچێوی رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان و بۆ دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی تاکەکان بەڕێوە دەچن و بە شێوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانی ( پچڕاو و بەردەوام) نێوان تاکەکان شکڵ دەگرن. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە بەردەوامەکان فاکتەرە سەرەکییەکانی دامەزراوەکان پێك دێنن کە وەچە بە دوای وەچەدا دەگوازرێنەوە و بە درێژایی کات و سەردەمەکان بەردەوام دەبن.

لە پێناسەی دامەزراوەدا ئەم تایبەتمەندییانە بوونیان هەیە:

١ـ دامەزراوە خاوەنی ئامانجە و، ئەرکی سەرەکی دامەزراوە دابینکردنی پێداویستیی سەرەکیی گرووپە.

٢ـ نموونە ڕەفتارییەکان، ڕۆڵەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە لەسەر بنەمای ئەوانەوە دێنە کایەوە، دووپات دەبنەوە، بەردەوام دەبن و جێگیر دەبن.

٣ـ دامەزراوە خاوەن پێکهاتەیەکی تایبەتە و بەشە پێکهێنەرەکانی لە نموونە ڕەفتارییەکان، ڕۆڵەکان و پێگە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دروست دەبن کە بارودۆخی یەکتر لە گشت دامەزراوەکەدا بەهێز دەکەن.

٤ـ دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان هەر یەکێکیان بە شێوەی یەکەیەکی سەربەخۆ و یەکپارچە کار دەکەن هەرچەند دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان پەیوەندییەکی دوولایەنەی هەمیشەییان لەگەڵ یەکتر هەیە، لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانرێ ئەرکی هەر دامەزراوەیەك لەوانی دیکە جیا بکرێتەوە.

٥ـ دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان ئاکامی بەها کۆمەڵایەتییەکانن کە تاکەکانی کۆمەڵگە بە شێوەی ڕێسا و یاساگەلی ڕێکوپێك و ئامادەکراو لە بەرامبەر خۆیاندا دەیبینن.

٦ـ دامەزراوە خاوەن پێکهاتەیەکی تا ڕادەیەك بەدەوامە کە لە نموونە ڕەفتارییەکان، پێگە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە بە شێوازێکی زۆر پێویست و هاوڕێتم بۆ دابینکردنی پێداویستییە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکانی تاکەکان هاتونەتە کایەوە.

## ٢. جۆرەکانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان

هەروەك باس کرا دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵگەدا پێك دێن. پێداویستییە مرۆییەکان لە باری پلەی گرینگایەتییەوە جیاوازییان هەیە و دەتوانرێ بەسەر دوو بەشی سەرەکی و لاوەکی دابەش بکرێن. هەر بەم شێوەیە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانیش بە دوو شێوەن: دامەزراوە سەرەکییەکان ( یەکەمین) و دامەزراوە لاوەکییەکان ( دووەمین).

## ئا ـ دامەزراوە سەرەکییەکان یان یەکەمینەکان

دامــەزراوە ســەرەکییەکان ئــەو دامەزراوانــەن کــە وەڵامــدەری پێداویســتییە ســەرەکییەکانی کۆمەڵگەن و خاوەنی گرینگییەگی حەیاتین و بۆ مانەوە و بـەردەوامیی کۆمەڵگـە پێویسـتن. هـەر بۆیە دامەزراوە سەرەکی یان یەکەمینەکان گشتی و جیهـانین. ئـەم دامەزراوانەلـە هـەر سـەردەم و زەمانێکدا و لەهەر کۆمەڵگەیەکدا بوونیان هەیە. گـرینگترینی ئـەم دامەزراوانـە کـە لـە هـەموو کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان لە سەرەتاییترین هەتا پێشکەوتووترینیان بوونیان هەیە بریتین لە:

١ـ خێزان، کۆنترین دامەزراوەی کۆمەڵایەتییە، بـەردەوامیی وەچـەکان بـەم دامەزراوەیـە بەستراوەتەوە، بەدوای ئامانجێکی دیاریکراو دەکەوێ، گۆڕانکارییەکانی ئـارام و لەسـەرەخۆن و لە بەرامبەر ڕەوتە دژبەرەکاندا خۆڕاگری دەکا.

٢ـــ دامــەزراوە ئابوورییــەکان کــە ڕۆڵــەکانی بەرهــەمهێنان، دابەشـکردن، وەڕێخسـتن و بــەکارهێنانی شــتومەکەکان دەگێــڕن و پێداویســتییە ئابوورییــەکان و ئــەو خواردەمــەنی و شتومەکانەی لە لایەن مرۆڤەوە بەکار دەهێنرێن، دابین دەکەن.

٣ـ دامەزراوە سیاسـییەکان کـە گەیشـتن بـە حکومـەت و بـەکارهێنانی دەسـەڵاتیان لـە کۆمەڵگە بە ئەستۆوەیە و ئاسایش لە کۆمەڵگە دابین دەکەن.

٤ـــ دامــەزراوەی پــەروەردە و فێرکـردن کـە پەیوەنـدییان لەگـەڵ پـەروەردەکردنی تـاك و دابینکردنی پێداویستییە فێرکارییەکان هەیە.

٥ـ دامەزراوە ئایینییەکان کە پەیوەنـدییان بـە چـۆنییەتی شـێوازە ئایینییـەکان هەیـە و پێداویستییە مەعنەوییەکانی ئینسان دابین دەکەن.

دامەزراوە سەرەکییەکان بە شێوەیەك بۆ کولتوورێك بە سـەرەکی دادەنـرێن کـە بـەبێ ئەوان نـاتوانرێ ژیـانی کۆمەڵایـەتی وێنـا بکـرێ. ئەنترۆپۆلۆژیسـتەکان هـەرگیز نـەیانتوانی کۆمەڵگەیـەکی سـەرەتایی بـە هاوچـەرخ و مێژوویـیـەوە بدۆزنـەوە کـە تێیـدا دامــەزراوە سەرەکییەکان بوونیان نەبێ.

دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بە سەرەکی و لاوەکییەوە لە سێ تایبەتمەندیدا هاوبەشـن: ئامانج، ئەرك (کارکرد)، پێویستیی.

بەڵام دامەزراوە یەکەمینەکان خاوەن تایبەتمەندیی دیکەشن کە ئەوان لە دامەزراوە لاوەکی یان دووەمینەکان جیا دەکاتەوە:

١ـ دامەزراوە یەکەمینەکان گشتیین و لە گشت کۆمەڵگە مرۆییەکاندا گشتگیرن.

٢ـ دامەزراوە یەکەمینەکان خاوەنی پێشینەن، واتە بەدیهاتنیان هاوکاتە لەگەڵ پەیدابوونی کۆمەڵگە مرۆییەکان.

٣ـ دامەزراوە یەکەمینەکان پێش پەیدابوونی تاك بوونیان هەیە و دوای تاکیش بوونیان هەر دەبێ.

بە دەستەواژەیەکی دیکە تاك لە سەرەتای لەدایکبوونیدا ئەم جۆرە دامەزراوانە بە ئامادەکراوی لەبەردەم خۆیدا دەبینێ.

تاکەکان لەدایك دەبن، ژیان دەکەن و دەمرن بەڵام دامەزراوەکە هەر بەردەوامە و درێژەی بە ژیانی خۆی دەدا و لە درێژەی زەمەندا بەردەوام دەبێ.

٤ـ ئەم دامەزراوانە بە هێواشی و لەسەرەخۆیی دەگۆڕێن، بەڵام لەناو ناچن، چونکە پێویستیی بەردەوامبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە مرۆییەکانن. بەم شێوەیە تێبینی ئەوە دەکرێ کە دامەزراوە یەکەمینەکان ڕێکخەری ژیانی کۆمەڵایەتین و لە فاکتەرە گرینگ و سەرەکییەکانی کولتووری کۆمەڵگەی مرۆیی دێنە ئەژمار و بەم هۆیەشەوە بە دامەزراوە سەرەکییەکان بەناوبانگن.

بە سەرنجدان بە تایبەتمەندییەکانی سەرەوە دەکرێ ئەم پێناسەیە بۆ دامەزراوە کۆمەڵایەتییە یەکەمینەکان بخرێتە ڕوو:

دامەزراوەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵێك لە نموونە و شێوازە کردەیی و ڕەفتارییەکانە کە خاوەنی ئامانج، ئەرك، پێویستیی، گشتێتی و بەردەوامییە، کەم و زۆر خۆی بەسەر تاکدا دەسەپێنێ و تاك لە سەرەتای لەدایکبووندا خۆی لەبەردەم ئەودا دەبینێ.

## ب ـ دامەزراوە لاوەکییەکان یان دووەمینەکان

دامەزراوە دووەمینەکان تایبەتمەندییەکانی دامەزراوە یەکەمینەکانیان نییە، چونکە لە کۆمەڵگە مرۆییەکاندا گشتگیر نین، دامەزراوە لاوەکی یان دووەمینەکان لەوانەیە لە برگە زەمەنییەکانی تایبەت لە مێژووی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا پێویست بن، لەلایەکی دیکەوە جێگیربوون و بەردەوامیی ئەوان ڕێژەییە و تایبەتمەندییەکانی سێهەم و چوارەمی دامەزراوە یەکەمینەکانیان نییە.

لــە کۆمەڵگــە پێشــکەوتووە پیشەســازییەکاندا کــە لێکچــوونەکان لــەناو دەچــن و ناهاوشێوەیی دێتە کایەوە، پێداویستییە مرۆییەکان فرەچەشــنتر و زیــاتر دەبــن، بــەم هۆیــەوە بێجگە لە دامەزراوە سەرەکییەکان کە لــە هــەموو کۆمەڵگەکانــدا بوونیــان هەیــە، بــە پێــی پێویستیی کۆمەڵگە ئەژمارێکی زۆر دامەزراوەی لاوەکی پەیدا دەبن بۆ ئــەوەی پێداویســتییە فرەچەشنەکانی ئینسان دابین بکەن. ئەم بەشە لە دامــەزراوەکان، بــە دامــەزراوە لاوەکــی یــان دووەمینەکان ناسراون. دامــەزراوە دووەمینــەکان لەوانەیــە تەمــەنێکی کورتیــان هــەبێ، بــۆ دابینکردنی پێداویستییەکی تایبەت دێنە کایەوە، بە دابین بوونی ئەم پێداویستییە ئارام ئــارام ئەرکی خۆیان لەدەست دەدەن و لەناو دەچن. وەك کۆمپانیا هەرەوەزییەکانی خانووبەرە کــە لــە برِگەیەکی زەمەنی تایبەت بە پێی پێویست بوون و بۆ دابینکردنی شــوێنی نیشــتەجێبوون بــۆ گرووپێکی کۆمەڵایەتی تایبەت دروســت دەبــن. دوای جێبــەجێبوونی ئــەم پێویســتییە لــەنێو دەچن. بەم پێیە ئەگەر بمانەوێ پێناسەیەك لــە دامــەزراوەی لاوەکــی یــان دووەمــین بخەینــەڕوو دەتوانین بڵێین: دامەزراوە کۆمەڵایەتییە دووەمینەکان کۆمەڵەیەك لە نموونە و شێوازە کردەیی و ڕەفتارییەکانن کە خاوەنی ئامانج، ئەرك و پێویستین.

وەك نموونە بۆ دامەزراوە دووەمینەکان دەتوانرێ ئامــاژە بــە حیــزب، ســەندیکا، ڕێکخــراوە وەرزشی، بازرگانی و کولتوورییەکان و بە شێوەیەکی گشتی ئــەو دامەزراوانــە بکــرێ کــە بــە پێــی پێویســتیی و ڕێککــەوتنی ئەنــدامانی کۆمەڵگــە دادەمــەزرێن و هــەتا ئــەو کاتــەی کــە کــار و چالاکییەکانیان بۆ کۆمەڵگە پێویست بن بەردەوام دەبن و کاتێك پێویستییەکە نەما بە خێرایی یــان بە هێواشی لەنێو دەچن. ئەم جۆرە دامەزراوانە لە لایەن کۆمەڵناسانەوە لە باری واتاوە بە دامەزراوە گشتییەکان بە واتای " هەر شتێك کە بــۆ کۆمەڵگــە پێویســتە" ناســراون کــە هــەموو ڕێکخــراوە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە کــە بــە پێــی پێویســتیی کۆمەڵگــە و بــۆ دابینکردنــی پێداویســتییە جەستەیی و دەروونییەکانی تاکەکان دادەمەزرێن و تا کاتێــك کۆمەڵگــە پێویســتی پێیــان هــەبێ، بەردەوام دەبن و کاتێك ئەو پێویستییە نەما، ئەوانیش لێك هەڵدەوەشێن.

لە کۆمەڵە نەریتییەکاندا بــە هــۆی ســنوورداربوونی پێداویســتییەکان، هــەبوونی دامــەزراوە لاوەکی یان دووەمینەکان پێویستییەکی ئــەوتۆی نییــە. ئــەم دامەزراوانــە لــە کۆمەڵگــە گــەورە و بەربلاوەکاندا زیاتر بەرچــاو دەکــەون بــە واتایــەکی دیکــە، پێبــەپێی گەشەســەندن و پەرەســەندنی کۆمەڵگەکان و ئاڵۆزبوونی پێکهاتە ئابووری ـ کۆمەڵایــەتی و کولتوورییــەکان ژمــارەی دامــەزراوە دووەمینەکانیش زیاتر دەبێ. بەم پێیــە لــە پەیوەنــدیی لەگــەڵ دامــەرزاوە دووەمینــەکان دەتــوانرێ

بگوترێ کە ئەم دامەزراوانە وڵامدەری پێداویستییە پلە دووەمەکانی مرۆڤن بەم واتایە کە ئەگەر کۆمەڵگەیەك پێویستی بە هەندێکیان هەبێ ئەوا لەو کۆمەڵگەیەدا دروست دەبن.

### ٣ـگۆڕانکاری لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان

لە کۆمەڵگە سەرەتایی، سادە و نەریتییەکاندا دامەزراوە لاوەکی و دووەمینەکان کەمتر بەرچاو دەکەون، چونکە لەو کۆمەڵگەیانەدا دامەزراوەیەکی سەرەکی لەوانەیە بە تەنیایی چەندین ئەرك بە ئەستۆوە بگرێت. بۆ نموونە خێزان وەك دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی دەتوانێ زۆربەی پێداویستییە ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی ئەندامانی خۆی دابین بکات. خێزان دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانە، ئەرکی پەروەردە و بارهێنانی منداڵەکانی لەسەر شانە، چاوەدێری و پاراستنی لاوەکانی بە ئەستۆوەیە و تەنانەت دوای هاوسەرگیریش گرینگی بە ژیانیان دەدا و کەموکوڕییەکانیان بۆ چارەسەر دەکا. ئەندامەکانی خۆی لەباری پیشەوە ڕادەهێنێ و بواری کارکردنی داهاتوویان بۆ دەڕەخسێنێ، هەروەها لە چوارچێوەی خێزانی بەربڵاوی نەریتیدا پێداویستییە وەرزشی، هونەری و ... ئەندامەکان دابین دەبێ.

بە پەیدابوونی شارە پیشەسازییەکان بابەتێك کە زیاتر لە هەر شتێك سەرنجی کۆمەڵناسانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، گۆڕانکاری لە دامەزراوە سەرەکییە کۆمەڵایەتییەکان، کەم بوونەوەی ئەرك و کارکردیان و پەیدابوونی دامەزراوە نوێیەکانە. فرەیی و فرەچەشنی دامەزراوەکان بە واتای پەیدابوون و هاتنەئارای کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو و ناهاوچەشنە کە لە ئاستە جۆراوجۆرەکانیدا جیاوازی و جوێبوونەوەکان دێنە کایەوە. ئەم جیاوازییانە لە ژیانی بنەماڵەیی، فێرکاری، ئابووری و سیاسی کە لە ڕابردوو لە کۆمەڵگە نەریتەکاندا وەك یەك بوون، بەرچاو دەکەوێ. دامەزراوە سەرەکییەکان لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا زۆر لە ئەرکەکانی خۆیان بۆ دامەزراوە لاوەکییەکان دەگوازنەوە. خێزان کە لە کۆمەڵگەی نەریتیدا ئەرکگەلی جۆراوجۆری هەیە، لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدا بە هۆی کارکردنی هاوکاتی ژن و پیاو لە دەرەوەی ماڵ، زۆر لەو ئەرکانە لەدەست دەدات و دامەزراوەگەلی نوێی دیکە وەك باخچەی ساوایان و ڕەوزەکان ئەرکە پەروەردەییەکانی خێزان بە ئەستوە دەگرن. فرەچەشنی دامەزراوە کۆمەڵایەتییە لاوەکییەکان لە کۆمەڵگەی پیشەسازی ئەمرۆییدا نیشانەیەك لە پەرەسەندن و گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی، ئابووری و کولتووری کۆمەڵگەیە کە جیاوازی و ناهاوشێوەیی لە ڕەهەند و ئاستە جۆراوجۆرەکاندا دەخاتەڕوو. بە پەرەسەندنی بەرەبەرەیی کۆمەڵگە لە حاڵەتی

نەریتییەوە بۆ پیشەسازی و پەیدابوونی بابەت و کێشەکان و سەرەنجام هاتنەئارای پێویستییە نوێیەکان، دامەزراوەگەلی نوێ پەیدا دەبن. لە شارە پیشەسازییەکان، هەبوونی کارگە و کارخانەکان و کارکردنی کرێکارەکان لەم دامەزراوە بەرهەمهێنانەدا، ناکۆکی و دژایەتی زۆریان لە نێوان بەرژەوەندییەکانی کرێکاران و خاوەن کارەکان پێك دەهێنا کە کاریگەریی لەسەر پەیوەندییەکانیان دادەنێ و لە ئاکامدا دامەزراوە نوێیەکانی وەك سەندیکاکان، یەکێتی و کۆمپانیا هەرەوەزییە کرێکارییەکان و دامەزراوە یاساییەکان دادەمەزرێن کە لە دابینکردنی پێداویستییەکانی کرێکاران و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان کریکار و خاوەن کارەکان و رێکوپێك کردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان گرینگییەکی زۆریان هەیە.

## ٤. پێکهاتە و ئەرکی دامەزراوەکان

دامەزراوەکان خاوەنی دوو فاکتەری سەرەکین: پێکهاتە و ئەرك.

پێکهاتە وەرگێڕدراوی وشەی (Structure)ـە و لە باسە کۆمەڵایەتییەکاندا کەڵکی زۆر لێ وەردەگیرێ و زۆرجاریش لێکدانەوەی جیاواز و واتای زۆری لی هەڵدەهێنجرێ. هەندیك جار پێکهاتە بە هاوسەنگیی کاتیی نێوان بەشە پێکهێنەرەکانی گشتێك و هەندێك جاریش پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەو کۆمەڵە گرووپ و دامەزراوە گشتیانە دەگوترێ کە پێکهێنەر و بیناکەری کۆمەڵگەکانن. بۆ شیکردنەوەی زیاتری ئەم باسە دەتوانین بڵێین کە هەر گشتێکی کۆمەڵایەتی چەندین توخم و بەشی هەیە کە پێکی دێنن و پەیوەندیگەلێکیش ئەم توخم و بەشە پێکهێنەرانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە و جۆرێك هاوسەنگیی و هاوئاهەنگی لەنێوانیاندا پێك دێنێ. بە شێوەیەك کە ئەو گشتە کۆمەڵایەتییە بتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر بوونێتی خۆی بپارێزێ و درێژە بە ژیانی خۆی بدات. زاراوەی "هاوسەنگیی کاتی" یان "تا ڕادەیەك جێگیر"یش بەم هۆیەوە لە پێناسەی پێکهاتەدا کەڵکی لێ وەردەگیرێ کە هەر گشتێکی کۆمەڵایەتی ئارام ئارام تووشی گۆڕانکاریی دەبێ یان گۆڕانکاریی خێرای تێدا دێتە پێش. بۆ نموونە خێزانی بەربڵاوی باوکسالاری لە ئاکامی گۆڕانی جۆری گوزەران و پەرەسەندنی شارنشینی و پیشەسازی وردەوردە ئەرکەکانی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە خێزانێك لە جۆری ناوکی یان ژن و مێردی کە پێکهاتەیەکی تەواو جیاوازی لە پێکهاتەکەی پێشووی هەیە.

پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەتوانرێ بەم شێوەیە پێناسە بکرێ: بارودۆخی سەرچاوەگرتوو لەهاوسەنگیی و هاوئاهەنگی تا ڕادەیەك بەردەوامی نێوان توخم و بەشە پێکهێنەرەکانی

گشتێگی کۆمەڵایەتی بە پێکهاتەی ئەو گشتە دادەنرێ. چەمکی ئەرك بە واتای دەرەنجام و شوێنەوارە بەرچاوەکانی دامەزراوەی کۆمەڵایەتییە کە لە باسەکانی داهاتوودا بە دوورودرێژی قسەی لەسەر دەکرێ.

## جیاوازیی نێوان ڕێکخراوە و دامەزراوە.

هەروەك گوترا، هەندێکجاریش زاراوەی دامەزراوە لەگەڵ " ڕێکخراوە" بەهاوواتا دادەنرێن و بەم هۆیەوە لە زۆربەی بابەتەکاندا، بەکارهێنانی ئەم دوو زاراوەیە بە جێگەی یەکتر جۆرێك سەرلێشێواوی و ناڕوونی دێنێتە کایەوە. بەڵام بە کەمێك وردبینی، دەتوانرێ ئەم ناڕوونییە لەناو بچێ و بە ئاسانی ئەم دووانە لێك جیا بکرێنەوە. بەم واتایە کە ئەگەر ناوەڕۆکی ڕێکخراوەکان لە چوارچێوە و شوێنێك کە ئەم ناوەڕۆکەی تێدا شیاوی جێبەجێبوونە، جیا بکەینەوە مەبەستی ئێمە دێتەدی و مانای ئەم دوو زاراوەیە ڕوون دەبێتەوە. بۆ نموونە سەندیکای کرێکاری ڕێکخراوەیە لە حاڵێکدا کە ڕێباز و شێوازگەلێك کە لەسەر بنەمای ئەوان کرێکاران دەتوانن ئیمتیاز وەربگرن، بە ناوەڕۆکی ئەم ڕێکخراوە و لە ئاکامدا بە دامەزراوە لەقەڵەم دەدرێت.

بە دەستەواژەیەکی دیکە، ئەو ڕێسا و ڕێبازانەی کە بۆ دابین بوونی ئامانجەکانی ناو ڕێکخراوە یان ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی تاکەکانی ڕێکخراوە بوونیان هەیە، بە دامەزراوە دێتە ئەژمار و بەم شێوەیە خێزان ڕێکخراوەیە بەڵام پەیوەندییە دوولایەنەییەکانی نێوان منداڵان و دایك و باوکەکانیان، ئەرکە فێرکاری و پەروەردەییەکان ( سەبارەت بە خێزانی گوندنشین ئەرکی بەرهەمهێنانیش)، کە بە درێژایی زەمەن بەردەوامە، دامەزراوەیە. هەروەها فێرگە ڕێکخراوەیە بەڵام سیستەمی فێرکردن و بارهێنان، یاسا فێرکارییەکانی فێرگە، تاقیکردنەوە و پرۆسەگەلێکی لەم چەشنە کە چاوەدێری بەسەر ئامانج یان ئامانجگەلێکی دیاریکراودا دەکات و ئەرکی دیاری هەیە، لەسەریەك بە دامەزراوەی فێرکردن و بارهێنان ناو دەنرێت. هەروەها حیزب ڕێکخراوەیە بەڵام کردەوە و ڕەفتاری ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەکردن، خەباتی گرووپی، سیاسی، کردەوەگەلێکی لەم شێوەیە دامەزراوەیە. یان کاتێك کە قسە لە خەستەخانە دەکەین، ئەگەر گشت خزمەتگوزارییە پزیشکی و ئامادەکارییەکان کە بۆ دابینکردنی پێویستییەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو ئەنجام دەدرێن و پەیوەندیی بە ئاگالێبوونی نەخۆشەکانەوە هەیە، لەبەرچاو بگرین، سەروکاری ئێمە لەگەڵ دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە. بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك

لــە پزیشــکەکان، پرســتارەکان، یاریــدەدەرانی نەخۆشــەکان و گشــت فەرمانبــەرە ئیــداری و تکنیکییەکانی نەخۆشخانەکە و گشت دەمودەزگاکە لەبەرچـاو بگـرین، لـەم حاڵەتـەدا ئێمـە سەروکارمان لەگەڵ ڕێکخراوەیەك هەیە.

کەواتە تێبینی ئەوە دەکەین کە ئاماژەکانی سەرەوە دەرخەر و دەبڕی پێناسـەیەکە کـە لەسەرەوە بۆ دامەزراوەی کۆمەڵایـەتی خسـتمانەڕوو بـەم واتایـە کـە ڕێبازەکـان، ڕێسـاکان، شێوازەکانی کردەوە، پەیوەندییـەکان و هەڵسـوکەوتەکان و بـە شـێوەیەکی گشـتی نـاوەڕۆکی ❊❊❊ دەتوانرێ دامەزراوەی پێبگوترێ.

خاڵی جێگەی ئاماژە لە پەیوەندیی لەگـەڵ دامـەزراوە کۆمەڵایەتییـەکان ئەوەیـە کـە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەن گرووپە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکان بەکار دەهێنـرێن. ئـەم شێوازانەی کردەوە چ لـە لایـەن ڕێکخراوەکـان دانـرابن یـان بـە شـێوەی نافـەرمی بـە هـۆی کەڵەکەبوونی ئەزموونـەکانی کۆمــەڵ پــەرەیان ئەسـتاندبێ، نـاتوانن لـە کەسـانێك کـە ئـەم دامەزراوانە بەکار دێنن، جیا بن. بەم هۆیەوە توێژینەوە لە واقیعە کۆمەڵایەتییـەکان زۆرجـار دامەزراوەکان و گرووپە مرۆییەکان لەخۆ دەگرێت.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی حەوتەم

١ـ حشمت اللّه طبیبی، مبادی و اصول جامعەشناسی، کتابفروشی اسلامیه، ١٣٥٢، ص ١٦٣.

٢ـ غلامحسین صدیقی واژه نهاد را معادل فرانسوی برگزیده است. وی استاد ممتاز و پایەگذار جامعەشناسی در ایران است و خدمت گرانبهایی به توسعه این دانش کرده است.

٣ـ اگبرن و نیمکوف، زمینەهای جامعەشناسی، ترجمه امیر حسین أریان پور، دانشگاه تهران، ١٣٤٢، ص ٢٦٩.

٤ـ آلن بیرو، فرهنگ جامعەشناسی، ترجمه باقر ساروخانی، سال ١٣٦٦، ص ١٨٠.

٥ـ عبدالحسین نیك گهر، مبانی جامعەشناسی، تهران، رایزن ١٣٦٤، ص ٢٤٢.

# بەشی هەشتەم

## گرووپە کۆمەڵایەتییەکان

لە کۆمەڵناسیدا گرووپ بە زۆر واتا بەکار هاتووە و کۆمەڵناسان لە ڕوانگەگەلی جۆراوجۆرەوە پێناسەی گرووپیان کردووە. هەندێکیان لە پێناسەی گرووپدا پشتیان بە کارلێکە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان بەستووە، هەندێکی دیکەیان پەیوەندیی بەردەوام و پایەدار، ژمارەیەکیشیان پەیوەندییە دەروونییەکان، حەز و ویستەکان، هەست و بەرژەوەندی و ئامانجە هاوبەشەکان و بیروباوەڕ و ڕەفتارە هاوشێوەکانیان لەبەرچاو گرتووە. وادێتە بەرچاو کە جۆراوجۆریی و فرەچەشنیی پێناسەی گرووپی کۆمەڵایەتی پەیوەندیی بە گەورەیی و بچووکی گرووپ، ئەرك، چالاکییە فەرمی و نافەرمییەکان، هاوشێوەیی، پێکهاتە و ڕێکخستنی گرووپی کۆمەڵایەتی، پلەی دەمارگیری و یەکگرتوویی، یارمەتیدانی نێوان ئەندامان و سەرەنجام بەربلاویی گرووپەوە هەیە. لەوانەیە بتوانین بڵێین کە گرووپی کۆمەڵایەتی لە ڕەهەندیی جیاجیاوە سەیری کراوە و لەسەری نووسراوە و بوونی ئەم هەموو پێناسە فرەچەشنەش نیشاندەری ئەوەیە کە هەر یەکێك لەم پێناسانە یەك یان چەند لایەن لە لایەنەکانی گرووپی کۆمەڵایەتی دەردەخات.

لە کۆمەڵناسیدا دەتوانرێ بگوترێ: گرووپی کۆمەڵایەتی کۆمەڵە کەسێکن کە پەیوەندییەکی تاڕادەیەك بەهێز و بەردەوامیان لە نێودا بوونی هەیە و لە هەندێك لە بیروڕا و هەستەکانیاندا پێکەوە هاوبەشن و جۆرە کارلێکێکی دوولایەنەی کۆمەڵایەتییان لەنێودا هەیە و وەشوێن ئامانج یان ئامانجگەلی هاوبەش دەکەون. دەکرێ گرووپی کۆمەڵایەتی لەو دیاردە

کۆمەڵایەتییە هاوشێوانەی کە لەژێر ناوی "شێوەگرووپ" یان گرووپی "بێڕێکخستن" یان "گرووپی بەسوتفە و بەڕێکەوت" یان گرووپی "بێفۆڕم" قسەیان لەسەر دەکرێ، جیا بکرێتەوە. چونکە لە پەیوەندیی لەگەڵ ئەم چەمکانە، تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی گرووپێکی ڕاستەقینە لەنێو تاکەکانی پێکهێنەریدا بەرچاو ناکەوێت.

لە شێوەگرووپ یان گرووپی ئاماری، هەبوونی لانیکەم یەك خسڵەتی هاوبەش قسەی لەسەر دەکرێت و مەسەلەی پەیوەندیی فەرمی یان نافەرمی لەنێوان تاکەکانیدا بوونی نییە.

بۆ نموونە تاقمێك کە بە قەراغ شەقامدا دەڕۆن یان ئەوەکە لە کاتی وەستانی ئوتۆمبێلەکاندا لە شەقام دەپەڕنەوە، هەرچەند بەرەو شوێنێکی هاوبەش دەچن، گرووپێکی ئاماری یان گردبوونەوەیەك پێك دێنن. لەم حاڵەتەدا نە هێزی پەیوەندبەخش، نە پەیوەندیی بەردەوام و نە ئامانجێکی هاوبەش ئەم کەسانە پێکەوە نابەستێتەوە.

لە باری بەهێزیی و لاوازیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تاکەکان و هەروەها لە پەیوەندیی لەگەڵ سستی یان بەهێزبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، دەتوانرێ ئاست و پلەی جۆراوجۆر لە گرووپەکان لێك جیا بکرێنەوە و لە چەند جۆردا باسیان بکرێت کە لە خوارەوە ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین.

## ١- پڕایی خەڵك (خەڵکێکی زۆر) (Foule) یان (Crowd)

کۆمەڵێك لە خەڵك کە لەژێر کاریگەریی هاندەر و بزوێنەرێکدا کۆ بوونەتەوە و لەنێویاندا پەیوەندیی هاوسێیەتی و نزیکایەتیی شوێنی هاتۆتەئاراوە. وەك گرووپێك لە خەڵك کە بە هۆی کەمیی یان گرانی شتومەك و خواردەمەنی یان شتێکی لەم جۆرە لە دەوری یەکتر کۆ بوونەتەوە و ئەم هەست و وروژانە بە ئاستێك دەگات کە کاریگەریی بخاتە سەر کەسانێکی دیکەش و ئەوانیش بجوولێنێ. لە ئاکامدا لەوانەیە لە کاتێکی کەمدا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك لە دەوری یەکتر کۆ ببنەوە و باس‌وخواسی هاندەرانەش لەنێویاندا ئاڵوگۆڕ بکرێت و هەموویان لەژێر کاریگەریی پاڵنەرێکدا جێ بگرن و هەستیان ببزوێ و ڕەفتار و کردەوەی نابەجێش لەخۆیان نیشان بدەن. پڕایی خەڵك خاوەنی لەرزۆك ترین و سست ترین پەیوەندیی کۆمەڵایەتین. بەڵام لە باری هەست و هاندانێك کە بەسەریاندا زاڵ دەبێت دەتوانرێ وەك کادێنێك سەیر بکرێ کە بە پڕیشکەیەك ئاگر بگرێ.

زاراوەی پڕایی خەڵك یەکەمجار لە سەدەی ١٩ لەلایەن "گوستاولۆبۆن" هاتۆتە کایەوە و مەبەست لێی ژمارە کەسانێکن کە لە کارێکی دیاریکراو و بە هۆی سەرهەڵدانی ڕوداو یان هۆکارێکی دیاریکراو کۆ دەبنەوە و لە باری جۆری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، سەرەتایی ترین و لەرزۆکترین گرووپی کۆمەڵایەتی کە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەیە، پێك دێنن:

١ـ بوونی هەست و وروژانی کاتی، بەم شێوەیە کە تاکەکان بە توندی دەچنە ژێر کاریگەریی هەست و ئیحساسات و ئەم وروژانە بە ڕادەیەکە کە تاك لەخۆیدا دەتوێنێتەوە و ئەو وەك پێڕەوی گشت (کۆ) لێدەکات.

٢ـ نەبوونی ڕێکخستن و ڕێکخراوێکی یەکگرتوو، بەم مانایە کە لە پڕایی خەڵکدا ڕێکخراو و ڕێکخستنێکی یەکگرتوو بوونی نییە.

٣ـ هەبوونی پەیوەندییەکی کاتی و نابەردەوام لەنێوان تاکەکاندا.

٤ـ نەبوونی دەرەتانی دیراسە و بیرکردنەوە لە بارەی ئەو شتەی کە ئەنجامی دەدەن.

٥ـ لەدەستدانی هەستی دیاریکردن و شوێنگەی تاکەکەسی و پەیوەست بوون بە گرووپەوە.

٦ـ پڕایی خەڵك لەسەر بنەمای ئامانجێکی پێشووی بیرلێکراوە ڕانەوەستاوە، کردەوە و ڕەفتاری ئەندامانی سەر بەم گرووپە هەست و وروژانێکی توندە کە بە شێوەی نائیرادی و لە دەرەوەی دەسەڵاتی تاکە.

٧ـ خێرایی گواستنەوەی هەست و وروژان بە ڕادەیەکە کە تاکەکانی گرووپ دەرەتانی وردبوونەوە و بیرکردنەوەیان سەبارەت بە کردەوەیەك کە ئەنجامی دەدەن، نییە.

وادیارە کە "گوستاولۆبۆن" سەردەمێك ئەم دیاردەیەی شی کردۆتەوە کە بزووتنەوە و ناڕەزایەتییە کرێکارییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دژی خاوەنکارە بێڕەحم و چەوسێنەرەکان، سەرانسەری ئورووپای ڕۆژئاوای داگرتبوو و ئەویش بە مەبەستی بێمانا و بێئامانج نیشاندانی ئەم ناڕەزایەتییانە کە لەوانەیە لە پێوەندیی لەگەڵ بردنەسەری حەقدەست، دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوون و ئیمکاناتی خۆشگوزەرانی ئەنجام دەدران، هەموویانی لە جۆری پڕایی خەڵك زانیوە کە ئەو بە دیاردەیەکی تایبەت و مەترسیدار ناوی دەبات.

## ٢ـ جەماوەری خەڵکی ئاسایی(گشت خەڵك) (Public)

جەماوەری خەڵکی ئاسایی خەڵك بە جۆرێکی دیکە لە گردبوونەوەی تاکەکان دەگوترێ کە بە بەراورد لەگەڵ پڕایی خەڵك پەیوەندییەکی تا ڕادەیەك جێگرتریان لەنێودا هەیە.

لە جەماوەری خەڵکی ئاساییدا کردەوە و ڕەفتار لەسەر ڕێکوپێکی و بیرکردنەوەی عەقڵانی ڕاوەستاوە. لە هەمان کات لە جەماوەری خەڵك پەیوەندیی تا ڕادەیەك بەهێز و هێزی پەیوەندبەخشی بەردەوام و کارلێکی دوولایەنە بوونی نییە. بەم پێیە جەماوەری خەڵك وێڕای هەبوونی ئەو تایبەتمەندییانەی کە ئەوان لە گرووپێکی ڕاستەقینە نزیك دەکاتەوە، بە هۆی پەیوەندییە سست و لەرزۆکەکانی نێوان تاکەکانی، ناتوانێ بە شێوەی گرووپێکی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە لەقەڵەم بدرێت.

نموونەگەلێك لە جەماوەری خەڵك دەتوانین لە کۆمەڵەکەسێك کە بۆ بیستنی وتارێك لە شوێنێك کۆ بوونەتەوە، یان بینەرانی کێبەرکێیەکی وەرزشی ببینین. جاری وایە تەنانەت بیسەرانی بەرنامەیەکی تایبەتی ڕادیۆ یان تەلەویزیۆنیش دەتوانرێ لەم ئاستە دابنرێن. تایبەتمەندییەکانی جەماوەری خەڵك بەم شێوەیەیە:

١ـ جەماوەری خەڵکی ئاسایی خاوەنی پانتایی و بەربڵاوییەکی زیاترە.

٢ـ پێکهاتنی جەماوەری خەڵك بەڕێکەوت و لەناکاو نییە، بەڵکوو بوار و بەستێنی پێشووی هەیە و کارێکی ئیرادییە و تاکەکان بە حەزی خۆیان لە بەرامبەر هاندەرێکدا جێدەگرن. کەسانێك کە دەیانهەوێ گوێ لە وتار بگرن یان بچنە سینەما یان بینەری بەرنامەیەکی تایبەتی تەلەویزیۆن بن، پێشتر بڕیار دەدەن، بلیتی بۆ وەردەگرن و لە کاتی خۆیدا لە شوێنەکە حازر دەبن.

٣ـ ئەم دیاردەیە لە پەیوەندیی لەگەڵ ئامانج و مەبەستی تاکە بەشداربووەکان شکڵ دەگرێت.

٤ـ بوارێکی سۆزداریی هاوبەش لەنێو تاکەکاندا هەیە.

٥ـ جەماوەری خەڵك فۆرم وەرگرتووتر لە پڕایی خەڵکە.

٦ـ لەم دیاردەیەدا دەرەتانی چوونە ژێر کاریگەریی کەمتر لەچاو پڕایی خەڵك بوونی هەیە.
جەماوەری خەڵك هەرچەند بە بەراورد لەگەڵ پڕایی خەڵك ڕێکوپێکترە، بەڵام بە هۆی

ناجێگیریی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تاکەکانی، گرووپێکی ڕاستەقینە پێك ناهێنێ، بەم هۆیەوە کۆمەڵناسان پڕایی خەڵك و جەماوەری خەڵك بە شێوەگرووپ دەزانن.

### ٣. گرووپی کۆمەڵایەتی

ئەگەر ئاستی هاوپێوەندیی و پەیوەندیی تاکەکان خاوەن ئەو تایبەتمەندییانە بێ کە لە پێناسەی گرووپی کۆمەڵایەتی قسەی لەسەر کرا، واتە لەنێوان تاکەکاندا پەیوەندیی جێگیر و تا ڕادەیەك پایەدار کە لەسەر بنەمای ئامانج یان ئامانجگەلی دیاریکراو و هەست و سۆزە هاوبەشەکان پێك بێت و کارلێکی دوولایەنەی گرووپییان لەنێودا هەبێت، دەتوانین بڵێین گرووپێکی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە پێك هاتووە. ئەنجومەنەکان، ڕێکخراوەکان و حیزبەکان نموونەی گرووپە کۆمەڵایەتییەکانن نەك شێوەگرووپ. لەهەر یەك لە ئەنجومەنەکان، دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، ئێمە لەگەڵ کەسانێك بەرەوڕووین کە خاوەن پەیوەندیی جێگیر و تا ڕادەیەك بەردەوامن و تایبەتمەندییەکانی دیکەی گرووپی کۆمەڵایەتییان تیدا بەرچاو دەکەوێت.

## پێناسەی گرووپی کۆمەڵایەتی

یەکەمین واتایەك کە لەتێکەڵاوبوونی ئەم دوو وشەیە واتە زاراوەی گرووپی کۆمەڵایەتی بە زەین دەگات، کۆبوونەوەی کەسانێك لەژێر هۆکار یان هۆکارگەلێکی دیاریکراوە کە دەبێتە هۆی هاوکاریی ئەوان لەگەڵ یەکتر.

تاکەکانی گرووپ بە مەبەستی ئامانجێکی هاوبەش، پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر هەیە و لە بواری ئامانجدا خاوەن ڕەفتارگەلی هاوشێوەن و یارمەتی یەکتر دەکەن.

لە کۆمەڵناسیدا، گرووپ بەواتا گشتییەکەی بە یەکەیەکی پێکهاتوو لە چەند کەس دەگوترێ کە بە شێوازی جۆراوجۆر بوونی هەیە، بۆنموونە دەتوانرێ ناوی گرووپی خێزانی، گرووپی وەرزشی، یەکێتییە کرێکارییەکان و ... بێنین. هەتا ئێستا لە لایەن تیۆرداڕێژان و کۆمەڵناسان پێناسەی جیاواز و فرەچەشن بۆ گرووپی کۆمەڵایەتی خراوەتەڕوو. بە مەبەستی ناسینی زیاتری چەمکی گرووپی کۆمەڵایەتی ئاماژە بە چەند نموونەیەك لە پێناسەی گرووپی کۆمەڵایەتی کە گشتگیرترن، دەکەین.

ئۆگبێرن و نیمکۆف لە پێناسەی گرووپی کۆمەڵایەتیدا دەڵـێن: گرووپـی کۆمـەڵایــەتی کـە شێوە و حاڵەتە تەواوەکەی کۆمـەڵگەیە، یەکەیەکی کۆمـەڵایەتییە پیکهاتوو لە دوو کـەس یـان ژمارەیەکی زیاتر لە تاکەکان کە بە هـۆی کارلێکـە دوولایەنـە کۆمەڵایەتییەکانـەوە پێکـەوە بەسـترابنەوە. کارلێکـە دوولایەنـە کۆمەڵایەتییـەکان ئـەو کردەوانـەن کـە لـەنێوان دوو یـان ژمارەیەکی زیاتر لەخەڵکدا ڕوودەدەن و تێیاندا جۆرێـك هاوئاهـەنگی دێتەکایـەوە. کارلێکـە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمای پەیوەندیی دوولایەنـەی کۆمەڵایـەتی ڕاوەسـتاون و پەیوەندیی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی پێویستیی بەوە هەیە کە دوو کەس یان زیاتر بۆ یەکتر ببنە سەرچاوەی کارتێکەری و حاڵەتە دەروونییەکانی خۆیان لە ڕێگەی ئامرازگەلێکەوەی بـۆ یـەکتر بگوازنەوە. (١)

"ژان مزون نو" بە وەرگرتن و گێڕانەوە لە گـۆرڤیچ لـە پێناسـەی گرووپـی کۆمەڵایەتیـدا دەنووسێ: " گرووپ، یەکەیەکی کۆمەڵایەتییە کە ئامانجی بەدیهێنانی کاریگەریی هاوبەشـە و لە بارودۆخی دەروونی و ڕەفتارە هاوبەشەکانەوە دەردەکەوێ و بەرەوسەر دەچێت کە تێیدا ئـەو هێزانەی کە بەرەو ناوەند ڕادەکەن، بەسەر ئەو هێزانەی کە لە ناوەند ڕادەکەن، زاڵ دەبن." (٢) بۆ نموونە ئەگەر گرووپێك لـە تاکـەکان لەسـەر بنـەمای هۆکـاری جۆراوجـۆر وەك پەیوەنـدیی سۆزداری، دۆستانە و نزیك و بە پێی ئامـانجی هاوبـەش، یـەکگرتوویی و حـەز و هاوکـاری و یارمەتیدان و ناسینی دوولایەنە پێکەوە بەسـترابنەوە، یەکەیـەکی کۆمەڵایـەتی پێـك بێـنن و نۆرمی هاوبەشیان هەبێ و پەیڕەوی لـە کولتـوور یـان وردەکولتوورێـك بکـەن، بـە مەبسـتی پاراستنی یەکپارچەیی گرووپ ناچارن نۆرمەکانی گرووپ لەبەرچاو بگرن. ئەندامانی گرووپ لە پاراستنی نۆرمەکان چاوەدێری بەسەر ڕەفتاری یەکتردا دەکەن و یەکتر کۆنترۆڵ دەکەن.

ئەم کۆنترۆڵ و چاودێرییە کۆمەڵایەتییە بـە مەبەسـتی پاراسـتنی یـەکگرتوویی گـرووپ و جێبەجێکردنی نۆرمە گرووپییەکان جۆرە گوشارێك دەخاتە سەر تاکەکان و ئەم گوشارە دەبێتـە هۆی پێکهاتنی هێزێك کە تاکەکان لە گرووپ دەردەپەڕێنێ یان هێزی ڕاکـردن لـە ناوەنـد لـە تاکەکاندا بەهێز دەکات. ئەم هێزی ڕاکردن لە ناوەندە و حـەزکردن بـۆ لای کەسـانی بێگانـە و دەرەوەی گرووپی کۆمەڵایەتی لەو هێزەی کە مەیلی بـەلای ناوەنـددا هەیـە، لاوازتـرە. بـەڵام ئەگەر هێزی ڕاکردوو لە ناوەند لە هێزێك کە بەرەو ناوەند دێت، بەهێزتر بـێ ئـەوا گرووپەکـە لێك هەڵدەوەشێ و لەناو دەچێت، بەڵام هەمیشە وەها نییە و هێزی ڕوو بە ناوەند بەسەر هێزی راکردوو لە ناوەندا زاڵە و لە ئاکامدا گرووپەکەش پارێزراو و بەردەوامە.

به سەرنجدان بە پێناسەکانی سەرەوە و پێناسەگەلی دیکە کە بۆ گرووپی کۆمەڵایەتی کراوە، دەتوانرێ ئەم تایبەتمەندییانە بۆ گرووپێکی کۆمەڵایەتی دەستنیشان بکەین:

**١ـ ئامانج یان ئامانجگەلی هاوبەش.**

**٢ـ هەست و سۆزە هاوبەشەکان. (لە گرووپە ئایدۆلۆژیکەکاندا بیروباوەڕی هاوبەش)**

**٣ـ پەیوەندیی دوولایەنەی هاوبەش.**

**٤ـ کارلێکی دوولایەنەی هاوبەش.**

**٥ـ بەردەوام بوونی ڕێژەیی**

**٦ـ ڕێکخراو.**

سادەترین پێناسە کە لەسەر بنەمای ئەم تایبەتمەندییانە بۆ گرووپی کۆمەڵایەتی دەخرێتەڕوو ئەوەیە کە بڵێین گرووپی کۆمەڵایەتی بریتییە لە کۆبوونەوەی دوو یان ژمارەیەکی زیاتر کە بە هۆی ئامرازێکی پەیوەندبەخش بە یەکتر دەبەسترێنەوە و کارلێکی دوولایەنەی کۆمەڵایەتییان لەنێودا هەیە.

لە پێناسەی دواییدا، هێزی پەیوەندبەخش لەڕاستیدا شتێکی جیا لە کۆمەڵێك لە تایبەتمەندییەکانی سەرەوە نییە و بەم پێیە دەتوانرێ هێزی پەیوەندبەخش بە دەرکەوتە یان دەرەنجامی ئەو تایبەتمەندییانە لەقەڵەم بدرێ. کارلێکی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی کە لە سەرەوە وەك یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی گرووپی کۆمەڵایەتی هاتە ئەژمار، دەتوانرێ بە دوو دەستە دابەش بکرێت: کارلێکی دوولایەنی کۆمەڵایەتی پێکەوەبەستراو و پچڕاو .

١. کارلێکە دوولایەنە کۆمەڵایەتییە پێکەوە بەستراوەکان ئەو کردەوانە لەخۆدەگرێت کە ئاراستەیەکی یەکڕەنگ و شیاو لە گرووپدا دێنێتە کایەوە وەك دۆستی، هاوفکری، هاوکاری، یەکدڵی و جۆرەکانی دیکەی سازگاری کە هۆیەکانی پەیوەندیی و نزیکایەتیی زیاتری تاکەکانی گرووپ دەستەبەر دەکات.

٢. کارلێکە دوولایەنە پچڕاوەکان ئەو کردەوانە دەگرێتەخۆ کە ئاراستەیەکی دژ و جیاواز لە گرووپدا دێنێتە ئاراوە و بواری دوورکەوتنەوە و جیابوونەوە و ناکۆکی لەنێوان ئەندامانی گرووپدا خۆش دەکات. ململانێ، پێشکەوتنەوە، شەڕ و هەڵلا و کردەوەی لەم چەشنە لە ڕیزی کارلێکە دوولایەنە پچڕاوەکان دێنە ئەژمار.

لەڕاستیدا ئاکامە وەدەسهاتووەکان لەم دوو دەستە کارلێکە دولایەنە، کە خۆیان لەسەر بنەمای پەیوەندییە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان ڕاوەستاون، دەبنە هۆی زیندوویی گرووپ و بەم

پێیە لە خستنەڕووی پێناسەیەك بۆ گرووپی کۆمەڵایەتی ئاماژە بەم تایبەتمەندییە سەرەکییە، گرینگییەکی زۆری هەیە.

بەردەوامیی و جێگیریی ئەم پەیوەندییانەش یەکێکی تر لەو تایبەتمەندییانەیە کە پێناسەی گرووپی کۆمەڵایەتی دەبێ لەسەر ڕابوەستێ، چونکە ئەم تایبەتمەندییە گرووپی کۆمەڵایەتی لە شێوە گرووپ یان گرووپی بەڕێکەوت جیا دەکاتەوە، بەم مانایە کە لە شێوەگرووپەکاندا، پەیوەندیی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی دێتە کایەوە بەڵام بەردەوامییەکی ئەوتۆی نییە. لە پڕایی خەڵکدا پەیوەندیی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی کورت و لەناکاوە و دەرەتانی شکڵگرتن و بەردەوامیی کارلێکە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان بوونی نییە و یان لە کۆبوونەوەی کورت و کاتیی تەماشاچییەکانی فیلمێکی سینەمایی یان وتارێك، دەرفەتێك بۆ دەرکەوتنی کارلێکی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی نییە. ئەو قوتابیانەی کە لە چاوەڕوانی وەرگرتنەوەی نمرەکانیان لە شوێنێك کۆ دەبنەوە و جاری وایە لەم ماوە کورتەدا هەستێکی دۆستانە و دڵسۆزانەش لەنێوانیاندا پەیدا دەبێت، تەنیا شێوەگرووپێك پێك دێنن، چونکە دوای وەرگرتنەوەی نمرەکانیان، گردبوونەوەکەیان لێك بڵاو دەبێت و هەر یەك بە ڕێگەی خۆیدا دەڕوات و زۆربەیان دوای جیابوونەوە دەرفەتی پەیوەندیی دوولایەنە لە داهاتووش لەدەست دەدەن. بەڵام گرووپێك هەر لەم کەسانە دوای چوونیان بۆ زانکۆ، جۆرێك یەکڕەنگی و لێك نزیکیی قووڵ و پەیوەندیی دوولایەنەی پێکەوەبەستراو لەنێوانیاندا پەیدا دەبێ کە لە کۆمەڵناسیدا دەتوانرێ زاراوەی "پەیوەندییە یەکەمینەکان" ی پێ بگوترێ.

بە سەرنجدان بەوەیکە باسی کرا و بە پشت بەستن بە تایبەتمەندییەکانی گرووپ، بێجگە لەو پێناسانەی کە پێشتر خرانەڕوو، دەتوانرێ پێناسەیەکی دیکەش بۆ گرووپی کۆمەڵایەتی بەم شێوەیە بخەینەڕوو:

" گرووپی کۆمەڵایەتی دوو کەس یان ژمارەیەکی زیاتر لە تاکەکانە کە لە هەندێك لە بیروڕا و هەستەکاندا پێکەوە هاوبەشن، ئامانج یان ئامانجگەلی هاوبەشیان هەیە و پەیوەندییەکانی نێوانیان تا ڕادەیەك بەردەوام و لەسەر بنەمای کارلێکە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکانە."

## هۆكاره كاریگەرەكان له یەكگرتوویی گرووپدا

یەكگرتوویی یان یەكپارچەیی گرووپ بە سەرنجدان بە تایبەتمەندییەكانی گرووپی كۆمەڵایەتی دەتوانرێ لە هۆكارگەلی جۆراوجۆردا بدۆزرێتەوە، گرینگترینی ئەم هۆكارانە بریتین لە:

### ١ـ پەیوەندییە یەكەمینەكان

مەبەست لە پەیوەندییە یەكەمینەكان ئەو پەیوەندییانەن كە لەسەر بنەمای هەست و سۆزە مرۆییەكان و حەزی دەروونی و لەڕاستیدا هەر ئەو پەیوەندییانەن كە گرووپە یەكەمەكان پێك دێنێنت. دۆستایەتی نێوان گرووپی خوێندكارانی بەشێك یان پەیوەندییە نزیكەكانی نێوان ئەندامانی خێزانێك و هەروەها پەیوەندییەكانی ڕاوەستاو لەسەر هەست و سۆزی توندی نێوان تاكەكانی سەر بە ڕێبازێك بە شێوەیەك كە لە ڕێگەی ئامانجەكانی ئەودا قازانج و بەرژەوەندیی تاكەكەسیی وەلا بنرێن، لە جۆری پەیوەندییە یەكەمەكان دێتە ئەژمار. بۆ نموونە هیچ هۆكارێك بێجگە لە دۆستایەتی بێ غەللوغەش و بەدوور لە مەبەستی ماددی، هاوپۆلەكان لە دامەزراوەیەكی فێركاریدا پێكەوە نابەستێتەوە. بەم هۆیەوە ئەو دۆستایەتییانەی كە لە قۆناغی خوێندندا بناغەیان دادەمەزرێت، زۆر قووڵ و ڕیشەدارن و بەردەوامیی زیاتریان هەیە. بەم پێیە ئەگەر گرووپێك لەسەر بنەمای پەیوەندیی دۆستانە و نزیك ڕاوەستابێ، لە یەكگرتوویی و یەكپارچەیی زیاتر بەهرەمەندە هەتا ئەوەی كە مەبەستە ماددییەكان بنەمای پێكهاتنی گرووپ پێك بێنن.

### ٢ـ سنووورداربوونی قەوارەی گرووپ

یەكێكی دیكە لەهۆكارەكانی كاریگەر لە یەكگرتوویی گرووپ، بچووكی قەوارەی گرووپە. بەم واتایە كە هەرچەندە گرووپ ئەندامی كەمتری هەبێ، بە ڕێكخستن و یەكگرتووییەكی زیاتر بەهرەمەندە. دیارە ئەمە بەو مانایە نییە كە گرووپی بە قەوارەی گەورە یەكگرتوویی گرووپییان نەبێ، بەڵكوو دەتوانرێ بگوترێ كە زیاتر لە گرووپە بچوكەكاندا لەبەر ئەوەی كە باشتر كۆنترۆڵ دەكرێن و وردە گرووپی كەمتر لەخۆ دەگرن، لێك تێگەیشتنی نێوان ئەندامەكان زیاترە و زووتر لێك تێدەگەن و لە یەكگرتووییەكی زیاتر بەهرەمەندن. لە حاڵێكدا كە لە گرووپە گەورەكانیش جاری وایە بە پشت ئەستوور بوون بە بنەما ئایدۆلۆژیكییە بەهێزەكان، ئیمكانی

بەهرەمەندبوون لە یەکگرتوویی بەهێزی گرووپی بوونی هەیە. لە گرووپە بچوکەکاندا پەیوەندییە دوولایەنەییەکانی نێوان تاکەکانیش سنووردارە و بە گەشەسەندنی گرووپ و زیادبوونی ژمارەی ئەندامەکان، پەیوەندییە دوولایەنەییەکانیش بە شێوەیەکی خێرا بەرەوسەر دەچێت. بۆ نموونە لە گرووپێکی دوو کەسیدا تەنیا دوو پەیوەندیی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی بەرچاو دەکەوێ و لە گرووپیکی سێ کەسیدا ژمارەی پەیوەندییە دوولایەنەییەکان دەبێتە سێ بەرامبەر و بەم شێوەیە لە گرووپێکی چوار کەسیدا پەیوەندییە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان بە دوازدە پەیوەندیی دوولایەنە دەگات. بەم جۆرە پەیوەندییە دوولایەنەییەکانی نێوان ئەندامانی گرووپ بە پێی بەربڵاویی گرووپ و هاوتەریب لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی ئەندامەکانی بە ڕێژەیەکی بەرەوژوور زیاد دەکات و ئاڵۆزتر دەبێت و لە ئاکامدا ناسین و لێك تێگەیشتنی دوولایەنە بە بەراورد لەگەڵ گرووپە بچووکترەکان دژوارتر دەبێت.

### ٣. هاوشێوەبوونی کولتووری

هاوشێوەیی کولتووری یەکێکی دیکە لەو فاکتەرانەیە کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ یەکگرتوویی گرووپی هەیە. هاوشێوەبوونی کولتووری دەتوانرێ لە پەیوەندیی لەگەڵ پێوەرە جۆراوجۆرەکاندا دیراسە بکرێت چینی کۆمەڵایەتی، وردە کولتوورە قەومی، زمانی، بیروباوەڕی و پیشەییەکان و هەروەها ئاستی خوێندەواری چەند نموونەیەك لەم پێوەرانە دێنە ئەژمار.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم پێوەرانە دەتوانرێ نموونەگەلی جۆراوجۆر بخرێنەڕوو بۆ وێنە گرووپەکانی پێکهاتوو لە ئەندامانی وردە کولتوورە قەومی یان زمانییەکان و ئەندامەکانی توێژ یان چینێکی کۆمەڵایەتی بەبێ گومان خاوەن یەکگرتوویی و یەکپارچەیی و بەردەوامییەکی زیاترن هەتا ئەو گرووپانەی کە لە پەیوەندیی لەگەڵ ئامانج یان ئامانجگەلێکی تایبەت ئەندامەکانی خۆیان لە وردەکولتوور یان توێژە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان، پێك دێنن.

# جۆرەکانی گرووپی کۆمەڵایەتی

یەکێك لە گرینگترین جۆرەکانی دابەشکردنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان، دابەشـکارییەکەی "چـارلز هۆرتن کولی"یە. ناوبراو گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لە باری جۆری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بـە دوو دەستە گرووپە یەکەمینەکان و گرووپە دووەمینەکان دابەش دەکات. مەبەست لە گرووپە یەکەمینـەکان ئەو گرووپانەیە کە تێیاندا پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان زۆر نزیك، دۆستانە و ڕووبەڕوویـە. لـە بـاری دەروونییەوە، دەرەنجامی ئەم گردبوونەوە دۆستانەیە جۆرێك توانەوەی تاکـەکان لـە گشـتێکی هاوبـەش دایە بە شێوەیەك کە لانیکەم لە بارەی زۆر لە ئامانجەکانی ژیانی تاکەکەسی، هەرکەس تێکەڵاوی ژیـان و ئامانجـەکانی گـرووپ دەبێـت. بـوونی پەیوەندییـە ڕووبـەڕوو و نزیـك لـە یـەکترەکان لـە گرووپـە یەکەمینەکان پێویستی بە سنوورداربوونی ئەندامانی گرووپ لە لایەك و بەردەوامیی پەیوەندییەکان لـە لایەکی دیکەوە هەیە. ئاکامی ئەم پەیوەندییانە، هاوکاریی سۆزداری و کـارلێکی دوولایەنـەی پـڕ لـە خۆشەویستی لەنێوان تاکەکان دایە.

گرووپە یەکەمەکان لە بەکۆمەڵایەتی کردنـی منداڵانـدا ڕۆڵێکـی زۆر گرینگییـان هەیـە. خێزان، گرووپە خزمایەتییەکان، گرووپی منداڵانی یاریکەر لە گەڕەکێك، گرووپی هاوسـێیەتی لە کۆمـەڵگە نەریتییەکان چوند نموونەیەك لە گرووپە یەکەمینەکان دێنە ئەژمار.

بەڵام گرووپە دووەمینەکان ئەو گرووپانە دەگرێتەخۆ کە تێیاندا پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان، فەرمی، وشك و مەنتیقییە و پانتاییەکەی سنووردارە. لەم گرووپانەدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنـەمای جۆرە گرێبەستێك شکڵ دەگرن و هەڵگری ئامانج و مەبەستێکی تایبەتە. ڕێکخـراوە ئیـداری، بازرگـانی، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، لەسەر بنەمای گرێبەستێك و پێویستییە تایبەتە کۆمەڵایەتییەکان پێك دێن و ئامانج لە پێکهاتنیان، ئەنجامدانی چالاکی و کردەوەی گونجاو لەگەڵ بابەتە پێویستەکانی ئەندامەکانە. لەم گرووپانەدا پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان فەرمییە، واتە گشت ئەندامان بە لەبەرچـاو گـرتنی ماهییـەتی ئامانجی گرووپی خۆیان پەیوەندییەکی شیاو لەگەڵ کەسانی دیکە دادەمەزرێنن.

لە گرووپی یەکەمیندا، چالاکییەکان زیاتر تاکەکەسین، لـە حاڵێکـدا کـە لـە گرووپـی دووەمینـدا تاکەکەس ڕۆڵێکی کەمتر هەیە. لە گرووپی یەکەمیـدا پەیوەندییـەکان عـورفی و نـاڕەسمین، بـەڵام لـە گرووپی دووەمیدا چالاکیی ئەندامەکان لەسەر بنەمای یاسا دانراو و فەرمییەکانن.

لە گرووپی یەکەمیندا، هاوکارییەکە ڕاستەوخۆ و خۆبەخۆییە و کارەکان بە شێوەی هاوبەشی ئەنجام دەدرێن و بەڕێوەبردنی گرووپ بە شێوەی ناوەندگەرێتی نییە، لە حاڵێکدا لە گرووپی دووەمین، هاوکاریی ڕەسمی و بەڕێوەبردنی گرووپ بە شێوەی سانترالیستی و ناوەندگەرێتییە.

بە سەرنجدان بەوەیکە گوترا، بوونی پەیوەندییە نزیك و دۆستانەییەکان لەنێوان ئەندامانی گرووپی یەکەمین، دەبێتە هۆی ئەوەکە ئەندامەکان زیاتر لە گرووپە دووەمینەکان توانای پاراستنی یەکڕیزی و یەکگرتوویی گرووپیان هەیە. لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی ئێستادا بە پێچەوانەی کۆمەڵگە کشتووکاڵییەکانی کۆن، کەمتر دەرفەت و دەرەتانی پێکهێنانی پەیوەندییە نزیك و پڕ لە خۆشەویستییەکان دێتە کایەوە و لە ئاکامدا بە ڕادەی کۆمەڵگە کشتوکاڵییەکان یەکگرتوویی و هاوشێوەییان تێدا نییە و ئەندامەکان لە دڵگەرمی و ئاسوودەیی و خۆشییەك کە لە کۆمەڵگە نەریتییەکانی جۆری یەکەمین هەبوو، بێبەشن.

لە دابەشکاریی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان پێوەری دیکەیش بەکار دێن کە لە خوارەوەدا بە کورتی ئاماژەیان پێدەکەین:

**ئا ـ لە باری قەوارەوە (بچوکی و گەورەیی گرووپ):** لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانرێ گرووپەکان لە باری ژمارەی ئەندامەکان و بەربڵاوییان دابەش بکرێن. گرووپە بچوکەکان وەك خێزان و بە تایبەت خێزانی ناوکی، گرووپی بە قەوارەی مامناوەندی وەك حیزب یان سەندیکا، ئەنجومەنە کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئایینی و زانستییەکان و گرووپی بەربڵاوتر وەك گرووپی عەشیرەتی، گوندنشینی و شارنشینی.

**ب ـ لە باری ئەرك یان ئامانج:** لەوانەیە گرووپ تەنیا خاوەنی ئامانجێك یان ئەرکێکی دیاریکراو بێت، وەك ئەنجومەنێکی وەرزشی. یان خاوەن ئامانج و ئەرکی فرە و فرەچەشن بێت وەك خێزان.

**پ ـ لە باری ڕێکخراویی و ڕێکخستن:** لەوانەیە گرووپ خاوەنی ڕێکخستنی تەواو نوێ و گەشەسەندوو و ڕێکوپێك بێ کە تێیدا تەواوی پێوەندییەکان لەپێشدا دیاری کراون وەك حیزب یان یەکێتیی کریکاری یان وەرزێری. لە لایەکی دیکەوە لەوانەیە گرووپ بێ ڕیکخستنێکی دیاریکراو و لەبار بێت، وەك گرووپی هاوگەمەکان ( هەواڵ لە گەمە و یاریدا) کە ڕێکخستنێکی جێگرتوو و ڕێکوپێکیان نییە.

**ت ـ لە باری چۆنییەتی بەشداریی تاکەکان:** لەوانەیە لە یەکێك لە شێوازەکانی دڵخوازانە، بەناچاری و نائاسایی دەربکەوێ. لەوانەیە گرووپ دڵخوازانە بێت وەك ئەنجومەنێکی وەرزشی، ئەدەبی یان هونەری کە تاکەکان بە حەز و مەیلی خۆیان تێیدا بەشدار دەبن. لەوانەیە

گرووپ بە زۆری بێ وەك عەسكەری، یان نائاسایی بێت وەك بەستراوەیی تاك بە گرووپێكی قەومی یان نەژادی ( لە پەیوەندیی لەگەڵ جۆری ڕەنگ) كە ئەندامبوون تێیدا لە دەرەوەی ئیرادە و ئیختیاری تاكەكەسە.

## ڕاكێشی سروشتی و ڕاكێشی هەڵسەنگێنراو و حیسابكراو

فێردیناند تونیس (F.Tonies) لە باسی كۆمەڵ و كۆمەڵگە ناوی دوو جۆرە پەیوەندیی كۆمەڵایەتی دێنێ كە یەكێكیان لەسەر بنەمای ڕاكێشی سروشتی و ئەویتریان لەسەر بنەمای ڕاكێشی هەڵسەنگێنراو دەزانێ. ناوبراو پێی وایە پەیوەندییەك كە لەنێوان گرووپە نەریتییەكانی كۆمەڵگە كشتووكاڵییەكان، گرووپە خێزانی و خزمایەتییەكان بوونی هەیە پەیوەندییەكی سۆزداری، هەستی و خوێنییە كە ئەو بە ڕاكێشی سروشتی ناو دەبات. لەبەرامبەر ڕاكێشی سروشتی، ئەو پەیوەندییانەی كە بەسەر كۆمەڵگە پیشەسازییەكاندا زاڵە، لە جۆری ڕاكێشی هەڵسەنگێنراو و حیساب بۆكراو لەقەڵەم دەدات و پێی وایە لێرەدا ئەو پێوەندییانەی كە تاكەكان بەیەكەوە دەبەستێتەوە لەجۆری ئەو پەیوەندییانەیە كە زیاتر لەسەر بنەمای بەرژوەندیی و زیان و قازانجە ماددییەكانە. تونیس پێی وایە كە پەیوەندییەكانی جۆری یەكەم لە "كۆمەڵ" و پەیوەندییەكانی جۆری دووەم لە "كۆمەڵگە"دا دەبینین و ئەمە هەر ئەو واتایەیەكە "چالز هۆرتن كولی" لەبارەی گرووپە یەكەمین و دووەمینەكان باسی كردووە.

## گرووپی ژێدر (مەرجەع) یان دادوەری

گرووپی ژێدەر (مەرجەع) یەكێكی دیكە لە جۆرەكانی گرووپە كۆمەڵایەتییەكانە كە تاك لە بەراوردكردنی بەهای خۆی لەگەڵ كەسانی دیكە هەڵیدەسەنگێنێ و یان بە دەستەواژەیەكی دیكە تاك لە دادوەری و لە كردەوەكانی خۆیدا ئیلهامی لێوەردەگرێ و بە بنەمای داوەریی خۆی دادەنێت. یەكێك لە كۆمەڵناسان كە بۆ یەكەم جار ئەم زاراوەیەی بەكار هێناوە، پێی وایە كە شوێنگە و پلەوپایەی كۆمەڵایەتیی تاك لە ڕێگەی شوێنگەی ڕێژەیی لەگەڵ تاكەكانی دیكەوە پێناسە و وەسف دەكرێ. بەم پێیە بۆچوونی تاك لە پێگە و پلەوپایەی خۆی پەیوەندیی بە

گرووپێکی تایبەت لە تاکەکان هەیە، کە ئەو خۆی لەگەڵ ئەوان بەراورددەکات و تاکەکان زیاتر ئەو بەهایانە قبووڵ دەکەن، کە لە گرووپەکانی مەرجەعەوە فێریان بن.

گرووپەکانی ژێدەر لەژێر ناوی گرووپەکانی دادوەری و گرووپە مەرجەعییەکان دەناسرێن. وەك نموونە برا و خوشکە گەورەکان، گرووپی مەرجەع یان داوەری خوشك و برا بچووکترەکان پێك دێنن و هەروەها مامۆستایان دەتوانن بۆ خوێندکار و قوتابییەکان وەك گرووپی مەرجەع لەقەڵەم بدرێن. سەبارەت بەو تازەلاوانەی کە لە گەڕەکەکانی شوێنی نیشتەجێبوونیان خەریکی یاری کردنن و بە حەز و تاسە و زەوقێکی زۆرەوە هەوڵ دەدەن لە تکنیك و جووڵەکانی ئەندامانی تیپی میللی توپی پێ یان یەکێك لە تیپە بەناوبانگەکان لاسایی بکەنەوە، گرووپی ژێدەر یان دادوەرییەکەیان هەر یاریکەرەکانی تیپی نەتەوەیی یان تیمەکانی دیکەن کە لاسایی جووڵە و کردەوەکانی ئەوان دەکەنەوە.

گرووپی کۆمەڵایەتی دەتوانرێ بە پێی چۆنییەتی ڕەوشی جێگیربوون بە سێ دەستە دابەش بکرێت:

**ئا. گرووپەکانی کۆچەری تەواو:** کە بە هۆی ڕەوشی گوزەران بەردەوام لە حاڵی جووڵە و کۆچکردن دان. عەرەبە سەحرانشینەکان کە ژیان و گوزەرانیان بە هۆی ئابوورییەکی پشت ئەستوور بە وشترداریییە، هەروەها " قەرەجەکان" لەم جۆرە گرووپە دێنە ئەژمار.

**ب. گرووپەکانی نیوەکۆچەری یان نێوە نیشتەجێ:** کە ئابوورییەکەیان لەسەر بنەمای پەروەردە و ڕاگرتنی ئاژەڵەکان ڕاوەستاوە و بەشێك لە ساڵ خەریکی ڕۆیشتن و کۆچکردنن و بەشەکەی دیکەی ساڵ لە شوێنێکی دیاریکراو نیشتەجێ دەبن. ئەم جۆرە ژیانەی گرووپ، لەسەر بنەمای ژیانی نیوە گەرمێن و کوێستانییە. ( ئەوەی کە لە کوردەواریدا گەرمێن و کوێستانی پێدەڵێن و هاوینان بەرەو کوێستانەکان دەڕۆن و زستانانیش بۆ گوندەکان دەگەڕێنەوە. خێڵ بەرەوژوو و بەرەوژێر) بەشێکی زۆر لە عێل و عەشیرەتەکانی ئێران ئەم جۆرە ژیانەیان هەیە و لە ڕێڕەوێکی دیاریکراودا هاتووچۆ دەکەن. زستانان لە ناوچە گەرمەکان و هاوینانیش لە ناوچە بەرز و کوێستانییەکان بەسەر دەبەن.

**ج. گرووپە نیشتەجێیەکان:** کە خەڵکی دانیشتووی گوند و شارەکان پێك دەهێنن.

کۆمەڵناسان و مرۆڤناسان پێیان وایە کە یەکجێ نشینی بە کەڵك وەرگرتن لە زەوی و ئابوریی کشتوکاڵی دەستی پێکردووە. لەم قۆناغە لە مێژووی ژیانی مرۆڤ قۆناغێکی زۆر درەوشاوە و پڕبەرهەم بووە، چونکە بە نیشتەجێبوون لەسەر زەوی و بەهرەوەرگرتن لێی، مرۆڤەکان توانیویانە دەست لە گەڕانی بیابانەکان هەڵگرن و بە شێوەی گرووپی نیشتەجێ و لەسەر بنەمای هاوکاری و هەرەوەزی، هێزەکانی خۆیان کۆ بکەونەوە و لەڕێگەی گواستنەوەی

میراتە کولتوورییەکان لە وەچەیەك بۆ وەچەیەکی دیکەوە دەوڵەمەندتری بکەن و خۆشگوزەرانی زیاتر بۆ خۆیان دابین بکەن.

## گرووپەکانی گوشار

گرووپەکانی گوشار ئەو گرووپانەن کە هەوڵ دەدەن کاریگەریی لەسەر دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دابنێن بەبێ ئەوەی کە دەستی بەسەردا بگرن. گوشاری ئەم گرووپانە لـە ڕێگـەی جۆراوجـۆری وەك خەباتی ڕاگەیاندن و پڕوپاگەنـدە، هەڕەشـە، مـانگرتن، بـایکۆت کـردن، ڕێپێـوان و ... جێبـەجێ دەکرێـت. ژان مینـۆ (Jean Meynaud) کۆمەڵناسـی هاوچـەرخی فەڕەنسـی، گرووپەکانی گوشار بە پێی ئامانجێك کە هەوڵی بۆ دەدەن بۆ دەدەن بۆ دوو دەستە دابەش دەکات:

ئا ـ گرووپە پیشەییەکان: ئەو گرووپە گوشارانە دەگرێتەخۆ کـە ئامـانجی سـەرەکی ئـەوان بەدەستهێنانی ئیمتیازی ماددیی زیاتر بۆ ئەندامەکانییـەتی. لـەم دەسـتەیەدا دەتـوانین نـاوی یەکێتییـە کرێکارییـەکان، سـەندیکاری فەرمانبـەران، یەکێتییـە پیشـەییەکان، کۆمپانیـا هەرەوەزییەکانی وبەرهێنان و ... بێنین.

ب ـ گرووپـە ئایدۆلۆژیکـەکان: گرووپـە ئایینییـەکان، نەتـەوەخوازەکان، ئازادیخوازەکـان، لایـەنگرانی بـیروڕای مرۆڤدۆسـتانە، زانایـانی زانسـتە سروشـتییەکان و زانایـانی زانسـتە ئاکارییەکان لەم دەستەیەدا جێدەگرن. گرووپگەلی دیکەی وەك داکۆکیکارانی مـافی مرۆڤـ و مافی ژنانیش دەتوانرێ بەم گرووپانەوە زیاد بکرێن.

"مینۆ" لە توێژینەوەکانی خۆیدا، بەڵگەی نوێ و سەرنجڕاکێشـی لـەبارەی چـالاکییەکان و ڕۆڵی گرووپەکانی گوشار کۆ کردۆتەوە و نفووز و کارتێکەریی ئـەوانی بـە شـێوەی دیـار و بـە شـێوازی جۆراوجـۆر لەسـەر سیاسـەتوان و فەرمانبـەرانی پلەبـەرز نیشـان داوە. ئـەو باسـی گرووپەکانی گوشار لە فەڕانسە، بریتانیا و ئەمریکای کردووە و ئەو ڕێگـە و شـێوازانەی ڕوون کردۆتەوە کە ئەوان بۆ ڕازیکردن و گوشار هێنان بۆ سەر ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان و گەیشتن بـە بەرژەوەندییەکانی خۆیان سوودیان لێوەرگرتوون. (٣)

## ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی هەشتەم

١ـ اگبرن و نیم کف، زمینه جامعه‌شناسی، اقتباس أ.ح.أریانپور، تهران، ١٣٤٢، ص ١٢٠ ـ ١١٢.

٢ـ برای اتلاع بیشتر رجوع کنید به کتاب "روانشناسی اجتماعی" تـألیف مـزون نـو ترجمـه علـی محمـد کاردان، دانشگاه تهران ١٣٣١.

٣ـ برای اطلاع بیشتر از گروههای فشار رجوع کنید به "تغییرات اجتماعی" نوشـتە گـی روشـه، ترجمـه منصور وثوقي، ص ١٧١ـ١٧٧.

# بەشی نۆیەم

## خێزان و خزمایەتی

خێزان یەکێك لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییە یەکەمینەکانە کە بە بنەما و بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دەدرێ و بێجگە لە ئەرکی منداڵ بە دونیا هێنان و پەروەردەکردن و لە ئاکامدا بەردەوامیی وەچەکان و مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤ، ئەرکگەلی جۆراوجۆری دیکەی وەك چالاکییە ئابووری، پەروەردەیی و فێرکارییەکان و کۆمەڵایەتی کردنی تاکیشی لە ئەستۆیە. خێزان وەك فاکتەرێکی نێوانجیکارە کە پێش پەیوەندیی ڕاستەوخۆی تاك لەگەڵ گرووپ، ڕێکخراو و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، ڕۆڵێکی گرینگی لە گواستنەوەی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان و میراتە کولتوورییەکان لەسەر شانە. بە سەرنجدان بەوەکە خێزان پەیوەندیی لەگەڵ سیستەمی پێگەیی کۆمەڵگەدا هەیە، پێگەی کۆمەڵایەتی تاکیش تا ڕادەیەکی زۆر پشت ئەستوور بە پێگەی کۆمەڵایەتی خێزانە.

ئەمرۆکە توێژینەوە لەسەر خێزان وەك دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی و خانەی سەرەکی کۆمەڵگە، یان بچووکترین یەکەی بنەڕەتی کۆمەڵگە لە لایەن زۆر لە کۆمەڵناسان و دەروونناسە کۆمەڵایەتییەکان گرینگیی پێدراوە و بە تایبەت ئەم بایەخ پێدانە زیاتر بۆ لای ئەو گۆڕانکارییانەیە کە لە پەیوەندیی لەگەڵ گەشەی پیشەسازی و پەرەسەندنی شارنشینی لە ڕەهەند و بوارەکانی خێزاندا بەدی هاتووە. کەسانێك لە دەیەکانی ڕابردوودا لەسەر بنەمای ئەو شتەیکە بەسەر رۆژئاوادا تێپەڕ بووە، پێیان وابوو کە دامەزراوەی خێزان بە تێپەڕینی زەمەن بەرەو سستی و لاوازی دەچێ و گۆڕانکارییە هێواش و لەسەرەخۆکان ئەم دامەزراوەیەیان لە

هەمبەر ئالوگۆڕە خێرا ئابووری و تکنیکییەکانی شارستانییەتی ڕۆژئاوا هەتا لێواری لێك هەلوەشان پێش بینی دەکرد. بەلام لە سەردەمی ئێستادا ئەم تیۆرییە ڕەشبینانە نە تەنیا لە ڕۆژئاوادا پەسند ناکرێ بەلکوو لە بنەڕەتدا لە ولاتانی ڕۆژهەلاتیش کە کولتوورەکەیان جیاوازیگەلی ئاشکرای لەگەل کولتووری ڕۆژئاوا هەیە، بە هیچ جۆرێك دروست دەرناچێت. تەنانەت لەو کۆمەلگەیانەشدا کە حەزێك بۆ لاوازکردنی ڕێوشوێنە یاسایی و ئایینییەکانی هاوسەرگیری هاتۆتە کایەوە، بە زوویی کێشە و دەرەنجامە نالەبارەکانی ئەم شێوازەی ژیانی هاوسەرێتی ڕوون بۆوە و لایەنی یاسایی بە کردەی هاوسەرگیری درا و، یاساگەلی نوێ بۆ پاراستنی خێزان وەك خانەی سەرەکی ئۆرگانیزمی کۆمەلگە دانرا و جێبەجێ کرا.

لە کۆمەلناسیدا خێزان وەك دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتی سەرەکی کە خاوەنی ژیانێکی تایبەتە، بە شێوازی زانستی توێژینەوەی لەسەر دەکرێ و چۆنییەتی پەیدابوونی خێزان و پەرەسەندن و گۆڕانکارییەکانی بە درێژایی مێژوو ڕوون دەکرێتەوە و هەروەها کێشە و ئاستەنگییە خێزانییەکان و هۆکار و شوێنەوار و دەرەنجامە کۆمەلایەتییەکانی سەرچاوەلێگرتووەکانی تاووتوێ دەکرێ.

توێژینەوە لە بواری خێزاندا لەم ڕوانگەیەوە بایەخی هەیە کە لە کۆمەلگە ئەمڕۆییەکاندا خێزان تووشی گەلێك گۆڕانکاریی ناهاوئاهەنگ بۆتەوە و وردەوردە فۆرم و شێوازی پێشووی خۆی لەدەست دەدا و بە شێوەیەکی نوێ پەرە دەستێنێ، لە ئاکامدا لە ئەرکەکانی خێزاندا گۆڕانکاریی ناهاوئاهەنگ لەگەل گۆڕانە پێکهاتەییەکانی هاتۆتە کایەوە. پەیوەندییەکانی ناو خێزان، پەیوەندییەکانی نێوان باوکان و دایکان لە لایەکەوە لەگەل منالەکانیان ( کیژ و کوڕەکان) و هەروەها پەیوەندییەکانی نێوان منالەکان لەگەل یەکتر و لەگەل دایك وباوکەکانیان، کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بارودۆخە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەلگە و زۆر گۆڕانکاریی تێدا پێك هاتووە و لەم بارەوە لەوانەیە تووشی خەسارهەلگری ببێتەوە و دووچاری لێك هەلوەشان بێ. بەم پێیە خێزان کە توخمی سەرەکی کۆمەلگە پێك دێنی، لە زۆر لە کۆمەلگە ڕۆژئاواییەکان پتەویی خۆی لەدەست داوە و بە هێواشی بەرەو لاوازی چووە و ولاتە ڕۆژئاواییەکان لەم بارەوە هەست بە مەترسی دەکەن و دەترسن کە ئیتر نەتوانن پێش بە خەسارە خێزانییەکان بگرن. گرینگیی توێژینەوە لە بواری خێزاندا بەتایبەت بۆ پێشگرتن لە دەرکەوتنی ئەو گرفتانەی کە کۆمەلگە لەگەلیان بەرەوڕوویە، کارێکی پێویستە.

## پێناسەی خێزان

خێزان بریتییە لە گرووپێك لە تاکەکان ( دوو کەس یان زیاتر) کە پەیوەندیی خزمایــەتییان لەنێودا هەیە و لە شوێنێکی تایبەتدا ژیان بەسەر دەبەن و خواردنێکی هاوبەشیان هەیە.

ئەم گرووپە بە تایبەتی لە کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆییدا لە باوك، دایك و منداڵەکان پێك دێت. بە دەستەواژەیەکی دیکە خێزان ڕێکخراو یان کۆمەڵەیەکـە کـە لەسـەر بنـەمای خزمایــەتیی خوێنی و خزمایەتی لە ڕێگەی هاوســەرگیرییەوەیە. خێــزان دامەزراوەیــەکی کۆمەڵایەتییــە و لەهەموو شوێنێك و هەموو سەردەمێکدا بــوونی هەیــە و بــەبێ ئــەو مانــەوە و بــەردەوامیی کۆمەڵگە مەیسەر نابێ. هیچ کۆمەڵگەیەك نییە کە تێیدا سیستەمی خێزانــی بــوونی نــەبێ. هەر یەك لە ئێمە بە شێوەیەك لە شێوەکان لەناو خێزاندا چاومان بە ژیان هەڵێناوە و لە کــۆڕی بنەماڵە و لەژێر چاوەدێری و پەروەردەی خزم و کەسانی خۆماندا پێگەیشتووین و ئاشنای ژیانی کۆمەڵایەتی بووین و بە ئەگەری زۆر خۆشمان تووشی پێکهێنانی خێــزان بــبین. زاراوەی خێــزان لەگەڵ کۆی ئەندامانی ماڵباتێك جیاوازی هەیە. لە خێزاندا پەیوەندییە خزمایەتییەکان بوونیان هەیە بەڵام لە کۆی ئەندامانی ماڵباتێکدا ئەم پەیوەندییــە مــەرج نییــە، لەوانەیــە کەســانێك پێکەوە ژیان بەسەر ببەن بەڵام هیچ جۆرە پەیوەندییەکی خزمایەتی لەنێوانیاندا بوونی نەبێ. لە سەرژمێری گشتیی ئێران بۆ کۆی ئەندامانی ماڵباتێك دوو مەرجی سەرەکی لەبەرچاو گیراوە:

**١ـ هەبوونی شوێنی نیشتەجێبوونی ئاسایی هاوبەش**

**٢ـ خەرجیی ئابووریی هاوبەش**

بەدەستەواژەیەکی دیکە کۆی ئەندامانی ماڵباتێك بە ژمارەیەك لەو کەسانە دەگــوترێ کــە لەژێر میچێکدا ژیــان بەســەر دەبــەن و لــە دەوری سـفرەیەك نـان دەخـۆن، بــەدەر لــە جــۆری پێوەندییەك کە لەنێوانیاندا هەیە. لە حاڵێکدا کە خێزان یەکەیەکی ژیانە کە لــە ژن و پیــاو و منداڵەکان پێك هاتووە کە پەیوەندیی خزمایەتییان پێکەوە هەیە.

## خێزان لەناو ئاژەڵاندا

خێزان تەنیا تایبەت بە جیهانی مرۆیی نییە، چونکە لەناو زۆر لە ئاژەڵەکانیشدا ئێمە ڕێکخراوی خێزانی دەبینین. ئەو ئاژەڵانەی کە پاراستن و پێگەیاندنی بێچووەکانیان پێویستی بە هەبوونی دایك و باوکە، خاوەنی جۆرە پەیوەندییەکی تاڕادەیەك جێگیر و سەقامگیرن. ئەم دۆخە لە نێو زۆر لە بوونەوەران تەنانەت لە ئاستەکانی خوارەوەشدا دەبینرێ. لەنێو باڵندەکاندا دایك و باوك پێش هێلکەکردن هێلانە و ماڵێك بۆ خۆیان دروست دەکەن و دوای کەوتن لەسەر هێلکەکانیان و بەدونیا هاتنی جوجکەکانیان، تا کاتی پەڕوباڵ دەرهێنان و وەدەسهێنانی توانایی خۆبەخێوکردن دەیانپارێزن. پەنگوئێنەکان کە لە سەرمای جەمسەری باشووردا هێلکە دەکەن، هێلکەکانیان لەژێر باڵ و پەڕەکانیان گەرم دادێنن و لە کاتی هاتنەدەری جوجکەکان، دایك و باوکەکانیان دەوریان دەگرن بۆ ئەوەی لەسەرمای ئەو شوێنە بیانپارێزن. لە ئەمریکا جۆرە ورچێکی ڕەش هەیە کە هەتا تەمەنی دوو ساڵی بێوەڵەکانی دەپارێزێ. ورچە مێیەکە دەرحەق بە بێوەڵەکانی بە بەزەیی و گیانفیدا و لە هەمانکاتدا سەختگرە. لە ساڵی دووهەمدا دایکەکە بێچووەکانی ناچاردەکا لە دارودرەخت سەرکەون. کاتێك کە دڵنیا بوون کە دەتوانن لەدار و درەخت سەرکەون، وێڵیان دەکەن و دوای کاری خۆیان دەکەون. واتە لەڕاستیدا بەم شێوەیە منداڵەکانیان تاقی دەکەنەوە بۆ ئەوەی خاترجەم بن ئاخۆ ئەوان دەتوانن بەبێ هاوکاری دایك و باوکیان درێژە بە ژیان بدەن؟ بێوەڵە ورچەکە ماوەیەك لەسەر دارەکە دەمێنێتەوە و لە برسان هاواری لێ هەڵدەستێ، کاتێك دایکی لەژێر دارەکە نابینێ بە ناچار دێتە خوارەوە و ژیانێکی سەربەخۆ دەست پێدەکا. لە ئاستەکانی سەرتردا شێوازێکی ڕێکوپێکتر و ڕێکخراوتر لە خێزان بەرچاو دەکەوێ. بۆ وێنە لەنێو مەیموونەکاندا بنەماڵە لە مەیمونێکی نێر، چەند منداڵێك و یەك یان چەند مەیمونی پیر کە بەسەریەکەوە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی پێك دێنن، پێك هاتووە. لە ناو هەندێك لە ئاژەڵەکاندا لەوانەیە نێر و مێیەکە تا کۆتایی تەمەن پیکەوە ژیان بەسەر ببەن. بەڵام خێزان لەناو ئاژەڵەکاندا تەنیا لایەنی غەریزەی هەیە لە حاڵێکدا کە خێزانی مرۆیی تەنیا بەرپرسی زاوزوێ نییە، بەڵکوو تێیدا پەروەردەکردنی کەسایەتی و کۆمەڵایەتیکردنی منالانیش بایەخی پێدەدرێ. لە خێزانی مرۆییدا یاسا ئەخلاقییەکان و هەست و سۆزی بالا بوونی هەیە.

## ئاخێزگەی خێزان

دەربارەی ئاخێزگەی خێزان، واتە چۆنییەتی پەیدابوون و شێوازە سەرەتاییەکانی، زانیارییەکانمان زۆر بەرتەسکە و زیاتر لەسەر بنەمای گریمانەیە.

هێگڵ دەڵێ: خێزان یەکەمین گرووپی سروشتییە. بە بڕوای ڕۆسۆ خێزان کۆنترین کۆمەڵگە و یەکەمین نموونەی کۆمەڵە سیاسییەکانە. کۆمەڵناسان، خێزان بە یەکەمین ناوکی سەرەتایی کۆمەڵگە دەزانن و پێیان وایە کە خێزان بنەما و بناغەی پێکهاتنی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان بووە. وا دێتە بەرچاو کە یەکەمین یەکەی کۆمەڵایەتی خێزان بووە کە بەرەبەرە گەشەی سەندووە و بە شکڵی یەکەی گەورەتری وەك قەبیلە، تاییفە، کۆمەڵگەی گوندنشینی، کۆمەڵگەی شارنشینی و سەرەنجام کۆمەڵگەی نەتەوەیی دەرهاتووە.

مالینۆفسکی دەڵێ: خێزان و تاییفە هاوکات دەگەڵ یەکتر بوونیان هەبووە و ئەمە پێویستییەکانی کۆمەڵگە بوو کە دیاری دەکرد کامیان لەوەی دیکە لەسەرترە و بایەخی زیاترە.

لە ڕوانگەی دۆرکایمەوە خێزان و پەرەسەندنی بەرەبەرەیی ئەو، هاوتەریب لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵ و کامڵبوونی مرۆڤ چۆتەپێش و درێژەی هەیە. (١)

کۆنترین و سادەترین شێوازی خێزان گرووپی بەربڵاوی خێزانییە کە بە کلان (Clan) ناسراوە. کلان گرووپێك لە تاکەکان دەگرێتەخۆ کە خۆیان بە خزمی یەکتر دەزانن و ئەم پەیوەندییە خزمایەتییانە لەسەر بنەمای تۆتەمە . تۆتەم (Totem) نیشانەی دیار و سەمبول ودروشمی کلانە. تۆتەم گیا یان ئاژەڵ یان یەکێك لە دیاردە سروشتییەکان یان بوونەوەرێکی ئەفسانەیییە کە پەیوەندیی تایبەتی لەگەڵ گشت تاکەکانی " کلان " هەیە و جێگەی ڕێزی تاکەکانی گرووپە. ئاڵقەی پەیوەندیی تاکەکان لەگەڵ تۆتەم لە پەیوەندیی خوێنیی لە خێزان، بە واتا نوێ و ئەمڕۆییەکەی، زۆر بەهێزترە. ژنان و پیاوانی کلانێك ، خۆیان بە خوشك یان برا دەزانن و لەم ڕوانگەیەوە ناتوانن پێکەوە هاوسەرگیری بکەن. "ژان کازینۆ" کلان بە پێکهاتوو لە ئەو ژن و پیاوانە دەزانێ کە خۆیان بە منداڵەکانی باوەگەورەیەکی هاوبەش دەزانن و نیشانە و هێمای ئەم باوەگەورەیە تۆتەمە کە زیاتر ئاژەڵ و هەندێکجار گیا و بە دەگمەنیش شتێك یان بوونەوەرێکی ئەفسانەییە. بۆ نموونە تاکەکانی کلانی کانگۆرۆ گومانیان هەیە کە باوباپیریان کانگۆرۆ بووە و خۆشیان بە کانگۆرۆ دەزانن، چونکە تۆتەمەکەیان کانگۆرۆیە. (٢)

## پەرەسەندنی خێزان و جۆرەکانی

شکڵ و شێوەی خێزان بە درێژایی مێژوو بەردەوام لە گۆڕان دابووە. هەروەك گوترا، کۆنترین شێوازەکەی بە شێوەی کلان بووە کە بە پێچەوانەی خێزانی ئەمڕۆیی هاوبەشێتیی لە خوێندا تاکەکانی بەیەکەوە نەدەبەستەوە. لە دونیای ئەمڕۆدا خێزان لەسەر بنەمای هاوسەرگیری پێك دێت کە بەدیهێنەری پەیوەندیی هاوخوێنیی واقعییە. کلان سەرەنجام لە نیشتمانێکی دیاریکراو جێگیر دەبێ و بەم شێوەیە یەکەمین ئاوایی دروست دەبێ و بەدوای ئەویشدا تایبەتمەندیی تۆتەمی بەرەو لاوازیی دەچێ و پەیوەندییەکانی تاکەکان لەسەر بنەمای لێك نزیکایەتیی شوێنی دادەڕێژرێ. کلان لەسەرەخۆ لێك بڵاو دەبێ و خێزان لەسەر بنەمای هاوخوێنی پەیدا دەبێ. لەم قۆناغەدا هێشتا خێزان بە شکڵی بەربڵاوە و ئەرکگەلی جۆراوجۆری لە باری ئابووری، سیاسی، یاسایی، ئاکاری و ئایینی لەسەر شانە.

لە خێزانی فراواندا بایەخی باوك و دایك بە پێی بارودۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی سەردەم جیاوازە. هەندێك لە کۆمەڵناسان پێیان وایە سەردەمێك بەڕێوەبردنی ڕێکخراوی خێزان لە ئەستۆی دایك بووە و بە دوای ئەودا باوك سەرپەرشتیی کاروبارەکانی خێزانی بەدەستەوە گرتووە. خێزانی جۆری یەکەم کە دەسەڵات و ئیختیار لەدەست دایك دابووە "دایك سالاری" و جۆری دووەم " باوکسالاری" پێ‌گوتراوە. لە قۆناغی کۆکردنەوەی خۆراکدا کاروبارە ئابوورییەکانی خێزان لەدەست ژندا بووە و پیاوەکان خەریکی ڕاو و شکار و بەرگری لە خێزانەکانیان بوون. لە ئاکامدا ژن، گەورە و سالاری بنەماڵە بوو و پلە و پایەیەکی بەرزی هەبووە. بە گۆڕانی شێوەی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی کشتوکاڵ، ڕۆڵی ئابووریی ژن بەرەو کزیی چووە و پیاو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وەبەرهێنانی بەدەستەوە گرتووە و لە ئاکامدا خێزان بە شێوازی باوکسالاری دەردێت. لە خێزانی باوکسالاریدا دەسەڵات لەدەست پیاودایە و لە ژێر چاوەدێری ئەودا ژنان و کوڕەکان تا کاتی مردن و کچەکان تا کاتی مێردکردن ژیان بەسەر دەبەن. باوك لە خێزاندا سالار و هەمەکارەیە و میراتی ڕابردووەکان بۆ داهاتووەکان دەگوازێتەوە. لە نێو سامییەکاندا بنەمای خێزان لەسەر ڕەسەنایەتیی باوك بووە کە بە باڵادەستیی تەواو بەسەر ژیانی ژنان و مناڵانی خۆی حاکمی خێزان بوو. لە نێو زۆربەی هۆزەکاندا، سیستەمی باوکسالاری باو بووە. لە هەندێك لە کۆمەڵەکاندا خێزان بە شێوەی هەبوونی پێوەندیی خزمایەتی لە خێزاندا لە ڕێگەی دایکەوە بووە کە دایك ڕەچەڵەکی خۆی بۆ

منالّەکان دەگواستەوە. لەهەندێکی دیکە باوك ڕەچەڵەکی بوونی هەبووە کە ڕەچەڵەك لە ڕێگەی باوکەوە بۆ منالّەکان دەگوازرایەوە.

خێزان بە پێی ژمارەی هاوسەریش بۆ سەر یەك هاوسەری و فرەهاوسەری دابەش دەبێ. چەندهاوسەری خۆی بەدوو شێوەی چەند مێردی و فرە ژنی بوونی هەبوو. فرەژنی لە ئابووری بەستراوە بە کشتوکالّ و ئاژەڵداری دێتە کایەوە، بەم پێیە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی فرەژنی فاکتەری ئابوورییە. ژن نە تەنیا ئەرکی ئابووری هەیە و بۆ مێردەکەی وەك کرێکاری بێحەقدەست دێتە ئەژمار، لە هەمان کاتدا بە جێگەی سامانێکە کە دەبێتە هۆی ڕێز و ئابڕووی پیاوەکە. هۆکاری دیکەی چەند ژنی پەیوەندیی بە پەیوەندییە تایبەتەکانی کۆمەڵگەی عەشیرەتی هەبووە کە بە هاوسەرگیری لەسەر بنەمای گۆڕینەوە، پێشی شەڕ و بەزم دەگیرا و ئاساییش و ئارامی بۆ ناو هیزە بچووکەکان دەگەڕایەوە. یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی فرەژنی بەهای کۆمەڵایەتی پیاوە، چونکە لە هەندێك لە خێزانەکاندا نەبوونی کوڕ دەبێتە هۆی ئەوەکە پیاوەکان ژنی زۆر هەڵبژێرن. نەزۆکی ژنیش هەندێکجار هاوسەرگیریی سەرلەنوێ و فرەژنی لێ دەکەوێتەوە.

## خێزانی ناوکی (ژن و مێردی)

خێزان لە دونیای ئەمڕۆدا ژن و مێرد و منالّەکان لە چوارچێوەی خۆیدا جێدەکاتەوە. لە تایبەتمەندییەکانی خێزانی ئەمڕۆیی، بچووکی قەوارەکەیەتی. واتە ژمارەی تاکەکانی کەم و سنووردارە. چونکە منالّەکان دوای هاوسەرگیری و لە هەندێك جار دا پێش هاوسەرگیریش خێزانی باوکییان بەجێ دەهێڵن و لە شوێنێکی دیکەدا ژیان بەسەر دەبەن و خێزان بە شێوەی خێزانی باوك ـ دایکی دەردێت، واتە تەنیا دایك و باوکی یەکەم لە خێزاندا دەمێننەوە. لە خێزانی ناوکی یان ژن و مێردیی ئەمڕۆدا گرینگیی بە پەروەردەکردنی کەسایەتی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی منالّ دەدرێت، لە ئاکامدا حەزی هەبوونی منالّی زۆر کەمتر بۆتەوە. هەرچەند ئەم کارە لەنێو توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگە جیاوازی هەیە، بەڵام حەزی گشتی لەم بارەیەوە بەچاو دەکەوێ. ژن بە وەئەستۆگرتن و ئەنجامدانی کار خاوەن سەربەخۆییەکی زیاترە. ئەم کارە لە هەندێك بابەتدا ئاڵۆزیی لەناو بنەماڵەدا دێنێتە کایەوە و دەبێتە هۆی ناجێگریی و لێك هەڵوەشانی خێزان. بەڵام لە زۆربەی کاتەکانیشدا ڕێزی دوولایەنەی نێوان ژن و پیاو بەدوای خۆیدا دێنێ و خێزان وەك ژینگەیەکی تەندروست بۆ پەروەردەکردنی کەسایەتی منالّەکانی

بەسەر دێت. خێزانی ناوکی، بناغەی کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی ئـەمڕۆیی پێـك دێنـێ و لـە پەیوەندیی لەگەڵ گەشە و پەرەسەندنی شارنشینی و پیشەسازی لـە شـارەکان دروسـت دەبـێ. چەند جیاوازییەك خێزانی ناوکی لە گشت جۆرەکانی خێزان جیـا دەکاتـەوە کـە گرینگترینیـان بریتین لە: جیاوازی لە کار و ئەرك ، جیاوازی لە قەوارە، لە پەیوەندیی لەگەڵ قـەوارە هـەروەك گوترا خێزانی ناوکی بە بەراورد لەگەڵ خێزانی بەرفراواندا خاوەنی قەوارەی بچووکترە و لە ژن و مێرد یان ژن و مێرد و منداڵەکانیان پیك هاتووە.

جۆری بەرچاوی خێزانی ناوکی لە شارە پیشەسازییەکانی ڕۆژئاوایی بەرچاو دەکـەوێت. لـە ئێراندا خێزانی ناوکی نزیك بە لەسەدا **٧٣**ی خێزانەکانی شـار و لـە سـەدا **٧٢**ی خێزانـەکانی گوندی لەخۆ دەگرێ کە تایبەتمەندیگەلی تایبەت بەخۆی هەیە.

لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئەم جۆرە خێزانە یەکێکیان ئەوەیە کە ئەرکـە کۆنـەکانی بـە ئەستۆی دامەزراوەگەلێکی لە دەرەوەی ژینگەی خێزانییـە و ئـەویتر ئەوەکـە خێزانـی نـاوکی هەرگیز پەرە ناستێنێ و زیاد ناکات. کاتێك کە منداڵانی خێزان دەگەنە تەمەنی یاسایی و دێنە ناو کۆمەڵگە، وەك ئەندامێکی چالاك لە خێزان دێنـەدەر و خۆیـان بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ خێزانێکی نوێ پێك دێنن. بەم پێیە خێزانی ژن و مێردی یان ناوکی بە بڵاوبوونی ئەندامەکانی و سەرەنجام بە مردنی دایك و باوك یان جیابوونەوەیان لە یەکتر، لێك هەڵدەوەشێ.

خێزانی ناوکی خۆی دەتوانێ بۆ چەند جۆرێك دابەش بێ. بۆ هـەر یـەکێکیان دەبـێ چـەند یاسا و ڕێسایەك لەبەرچاو بگیرێن کە گرینگترینیان بریتین لە:

**ـــ شێوازی هەڵبژاردنی هاوسەر و ژمارەی هاوسەرەکان**

**ـــ ڕادەی بەستراوەیی بە تۆڕی خزمایەتی**

**ـــ گرینگیی ڕۆڵی ژن و مێرد**

**ـــ قەوارەی خێزان**

جەمشیدی بێهنام یەکێك لە کۆمەڵناسە ئێرانییەکان لەسەر بنەمای پێوەرەکانی سـەرەوە، خێزانی ناوکی شاری بەسەر سێ جۆردا دابەش دەکات کە دەتوانێ وەك نموونەیەك بۆ توێژینـەوە و دابەشکاریی جۆرەکانی خێزان سوودی لێ وەربگیرێ.(٣)

### ١ـ خێزانی سەربەخۆی ناوکی (جۆری یەکەم)

پیشەی سەرۆکی خێزان لە کارە بەرز و ناوئجییە ئیدارییەکان یـان پیشـە ئازادەکـان دایـە. پێوەری بەستراوەبوون بەم جۆرە خێزانە زیاتر ڕادەی خوێندەوارییە هەتا داهات، و بەم هۆیەوە لە خێزانەکانی خاوەن کادری باڵای ئیداری یان پیشەی ئازادی پڕداهات ( وەك پزیشـکی، پـارێزەر لە دادگا) هـەتا خێزانـەکانی فەرمانبـەری کۆمپانیـا تایبەتییـەکان لەوانەیـە لـەم گرووپـەدا جیٚبگرن.

خوێندنی سەرۆکی خێزان زیاتر لە سەروی دیپلۆمەوەیـە و هاوسـەری سـەرۆکی خێـزانیش خوێندەوارییەکەی هەر لەم ئاستە یان کـەمێك خوارتردایـە و جـاری وایـە کـاریش دەکـا. لـە هەڵبـژاردنی هاوسـەردا ئـازادیی هەیـە. چوارچـێوەی هەڵبـژاردنی هاوسـەر زۆر بەرفراوانـە و هاوسەرگیری لەناو خزمان و لەگەڵ کەسانی دەرەوەی خزمایەتیش باوی هەیـە. ژن و پیـاو وەك دوو هاوسەر بە یەکسانی ژیان بەسەر دەبەن. ژن هۆگریی بە دەرخستنی کەسایەتی هەیـە و لـە کاروبارەکانی خێزانیـدا ژن و پیـاو، بەهاوبەشـی بڕیـار دەدەن و ئـەم بابەتـەش دەبێتـە هـۆی دەرکەوتنی ناکۆکیی زیاتر و لەوانەیە جیابوونەوەی زیاتریشی لەچاو جۆرەکانی دیکـەی خێـزان تێـدا بکەوێتـەوە. ژمـارەی منداڵـەکان و چـۆنییەتی بارهێنانیـان لـە بابەتـە سـەرەکی و هەستیارەکانی خێزانە. خێزان هەوڵ دەدا لە ئامرازەکانی خۆشگوزەرانی ڕێژەیی بەهرەمەند بیٚ. هەبوونی ئۆتومبێلێکی بچووك، تەلـەویزیۆن و ... بـۆ زۆربـەی ئـەم خێزانانـە بۆتـە شـتێکی ئاسایی، ژیان لە ئاپارتومان و شـوقەکاندا لەناویانـدا بـرەو دەسـتێنیٚ. ئەوانەیکـە پڕداهـاتن هەبوونی خانووی سەربەخۆ بە یەکێك لە ئامانجە گرینگەکانی ژیان دەزانن. ئاستی بەکارهێنانی خێزانـەکان بـەرزە و هۆگرییـەکی زیـاتر بـە بـەکارهێنانی شـتومەك و خزمەتگوزارییـە جوانکارییەکان دەدەن.

بەشـێکی گـرینگ لـە بودجـەی خێـزان بـۆ خەرجییـەکانی پەیوەندیـدار بـە جلوبـەرگ، تەندرووستی، گەشتوگوزار تەرخان دەکرێت. خێزان حەزی لە پشووەکانی ساڵانەیە و لە بنەڕەتدا تێپەڕکردنی کاتەکانی بێکاری لە بابەتە جێگە سەرنجەکانی خێزانە. خێزان سەربەخۆیی دارایـی هەیە و ژن و پیاو داهاتـەکانیان بـە هاوبەشـیی خـەرج دەکـەن. لـە سـەرەتای دروسـتکردنی بنەماڵەدا لەوانەیە لە لایەن خێزانی باوك یـان کەسـانی تـۆڕی خزمایـەتی هاوکـاریی دارایـی پێشکەشی خێزان بکریٚ. پابەندبوونە کۆمەڵایەتییەکانی خێزان دەرحەق بەتۆڕی خزمایـەتی تـا ڕادەیەك کەمە. لە ئێراندا زۆربەی ئـەم خێزانانـە لـە تـاران و چـەند شـاری گـەورەی ئێرانـدا نیشتەجێن.

### ٢- خێزانی سەربەخۆی ناوکی (جۆری دووەم)

سەرۆکی خێزان لە خزمەتگوزارییە ئیدارییە پلە نزمەکان یان خزمەتگوزاریی بازرگانیدا کار دەکات. جاری وایە خاوەن پیشەیەکی دەستی یان کرێکارێکی شارەزایە. خوێندەواریی سەرۆکی خێزان لە خوار دیپلۆمەیە و جاری وایە بڕوانامەی شەشی سەرەتایی هەیە. هاوسەری سەرۆکی خێزان کەمتر لە دەرەوەی ماڵ کار دەکات، بەڵام لە شارە ویلایەتییەکاندا لەوانەیە لە پیشەسازیی خێزانیدا چالاکیی بنوێنێ. پیاو سەرتریی تەواوی خۆی لە شوێنکاری خێزاندا دەپارێزێت، بڕیاری گرینگ دەردەکات و ژن ژێردەست و ملکەچی بڕیارەکانی سەرۆکی خێزانە. هیچ سنووردارێتییەك لە ژمارەی مناڵەکاندا نییە و لە بنەڕەتدا خێزان لەسەر هەبوونی مناڵی زۆر هاوڕایە و بیروباوەڕی ئایینی و داب و نەریتەکان هاندەر و یاریدەدەری ئەم کارەن. پیاو بەخێوکەر و بژیو پەیداکەری خێزانە. تاکەکانی خێزان زیاتر لە یەك یان دوو ژووردا ژیان بەسەر دەبەن و ئەگەر خێزان داهاتێکی زیاتری هەبێ، حەزیان لە هەبوونی خانوویەکی بە ملکەوە هەیە هەرچەند بچووکیش بێت. شوێنی نیشتەجێبوونی ئەم خێزانە لە شوێنە تایبەتییەکانە ( بۆ نموونە لە تاران لە ناوچەی نیوبازنەیی کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە دەست پێدەکات و بەرەو ڕۆژهەڵات و باشوور دەڕوات وەك شەقامەکانی گورگان، حەڤدەی شەهریوەر، ڕەی و.. یان شارۆچکە بەستراوەکانی وەك نارمەك و چوارسەد دەزگا).

### ٣- خێزانی ژن و مێردی کۆچەر

ئەم جۆرە خێزانە زیاتر لە کۆچەرەکانی گوند یان شارۆچکەکان پێك دێت کە لە چەند ساڵ پێشترەوە لە شارە گەورەکاندا ژیان بەسەر دەبەن. هەنووکەش کۆمەڵگەی شار ئەوانی تەواو لەخۆیدا جێ نەکردۆتەوە و هەم لە باری کۆمەڵایەتی و هەم لە باری شوێنەوە دەتوانرێ بە "پەڕاوێزنشین" ناویان ببەین.

سەرۆکی خێزان لە خزمەتگوزارییەکانی بەشێك یان وەك کرێکارێکی ناپسپۆڕ لە هەندێك پیشەسازی (بە تایبەت پیشەسازی خانوبەرە) خەریکی کارە. بە هۆی نەبوونی تۆڕی خزمایەتی لەو شارەی لێی نیشتەجێن، خێزان پابەندبوونی کۆمەڵایەتی زۆری نییە و بەم هۆیەشەوە تاکەکانی زۆر هەست بە غەریبی دەکەن. پیاوەکان زۆربەیان نەخوێندەوارن و لە کاروبارە خێزانییەکاندا سەرتری تەواوی خۆیان پاراستووە. شوێنی نیشتەجێبوون هەژارانەیە و جاری وایە

چەند خێزانێك بە شێوەی بەکۆمەڵ ژیـان بەسـەر دەبـەن. توێژینـەوە لەهەنـدێك ناوچـە ئـەوە دەردەخا کە بەپێچەوانەی کۆمەڵە ڕۆژئاواییەکان کە کۆچکردنی گوندنشینەکان بۆشار شـێوازی هاوسەرگیریی ناوخۆیی بۆ ژن هێنان لە دەرەوە یان لە بێگانەکان گۆڕیوە، لە ئێراندا بـە هـۆی هەست کردن بە غـەریبی و خۆبەبێگانە زانین لە شارەکان بۆ کۆچەرە گوندییەکان، هاوسەرگیریی ناوخۆیی هەروا باوی هەیە.

خێزانی ژن و مێردی یان ناوکی لە ئێراندا زۆر نوێیە و لە ناوەندە شاری و پیشەسـازییەکان بەرەبەرە پەرە دەستێنێ، بەم هۆیەوە دەتوانرێ بگوترێ کە گۆڕانکارییەکانی خێـزان لـە ئێـران واتە گۆڕانی قەبارە یان ڕەهەندەکانی، گۆڕانی ئەرکەکانی خێزان و گۆڕانکاریی پەیوەندییەکانی ناوخێزانی زیاتر بۆ شارەکان و ناوەندە پیشەسازییەکان دەگەڕێتەوە، ئەگەرچی لـە شـارەکانیش هێشتا تۆڕە خزمایەتییەکان کەم و زۆر دەسەڵاتی خۆیان پاراستووە و وەك پەیوەنددەرێك لـەناو خێزان و کۆمـەڵگە ڕۆڵ دەگێڕن. بێگومان ئاڵووگۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئـەم دواییانـەی ئێـران گۆڕانکاریی قووڵی لە پێکهاتە و ئـەرکی خێزانـی ئێرانـی بـە تایبـەت خێزانـی گوندنشـین و هەروەها لە شێوازە ڕەفتارییەکانی تاکەکاندا هێناوەتە کایەوە کە خۆی بابەتی توێژینەوەی نوێ دەخاتە بەردەست. توێژینەوەکانی داهاتوو ئەم گۆڕنکارییانە ڕوون دەکاتەوە.

### خێزانی لێکدراو

خێزانی لێکدراو خێزانێکە کە لەسەر بنەمای پەیوەندیی خوێنی یان پەیوەنـدیی لەڕێگـەی هاوسەرگیرییەوە ڕاوەستاوە و چەند گرووپی خـوێنی و چـەند گرووپـی ژن و مێردایـەتی لـەخۆ دەگرێ. خێزانی لێکـدراو منالـەکانی خـۆی دوای هاوسـەرگیریش لەخۆیـدا جـێ دەکاتـەوە و پەرسەندن و بەرفراوان بوونیشی هەر بەم هۆیەوەیە و بەم شێوەیە لەوانەیە چەند وەچەیەك لەژێر میچێکدا و لە خانوویەکی هاوبەشدا ژیان بەسەر ببەن. ئەم جۆرە خێزانە کە زیاتر تایبـەت بـە کۆمەڵگە خاوەن ئابوورییە کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییەکانە، لەوانەیە شـێوازی باوکسـالاری یـان دایـك سـالاری، بـاوك نشـینی و دایـك نشـینی و شـێوازگەلی لـەم جـۆرە بگرێتـەخۆ. بـە دەستەواژەیەکی دیکە، بەپێی دەسەڵات و زاڵبوونی دایك یان باوکی بنەماڵـە چـەند جـۆرێکی جیاوازی هەیە. لەم شێوازە لە خێزان، دایك و باوکی یەکەم، بڕیـاردەری خێـزانن و کوڕەکـان و نەوەکان و بووکەکان پەیڕەوییان لێ دەکەن و ئەگەر باوك ودایك بە هۆی بەتەمەنییەوە نـەتوانن ئەرکەکانی سەرپەرشتی بەڕێوە بەرن، کوڕی گەورەی خێزان جێگەیان دەگرێتەوە. کچەکان دوای

مێرکردن ماڵی باوك جێدەهێڵن و بەم پێیە خێزانی لێکدراو زیاتر بە شێوەی بـاوك نشـینییە و لەو جۆرانەی کە زاوا لە ماڵی خەزووردا بژین زۆر دەگمەنە. باوك ڕۆڵی سەرەکی لە پەروەردە و بارهێنانی منداڵەکانی لـە ئەسـتۆیە، جـەغزی هەڵبـژاردنی هاوسـەر سـنووردار و پابەندبوونـە کۆمەڵایەتییەکان زۆرن.

منداڵەکان زیاتر بەدوای پیشەی باوکیـان دەکـەون و ئەرکگـەلی جۆراوجـۆر لەسـەر شـانی خێزانە. شێوازی بەرهـەمهێنانی خێزانـی و هاوکـاری و هـەرەوەزی جـێگیر لەسـەر ئـەو، بـە کۆمەڵایەتی کردن و پەروەردەکردنی منداڵەکان، چاوەدێری پیرەکان و داکۆکی کردنی تـەواو لـە ئەندامەکان، لەئەرکە قورسـەکانی ئـەم خێزانـە دێنەئـەژمار. بـە وتـەی سـاموئێل کـۆنیگ (S.Konig)، کۆمەڵگەی کشتوکاڵی بە شێوەی سروشتی بـۆ شـێوازی خێزانـی باوکسـالاری گونجاوە و خێزانی وەرزێرەکە تێیدا ئەرکی ئابووری گرینگی هەیە ( واتە خێزان بـە یەکەیـەکی ئابووریش دێتە ئەژمار)، پێویستی بە بەڕێوەبەرێکی بەرهەمهێنانە کە هەر لـە کۆنـەوە پیـاو بووە. بێجگە لەمەش لە کۆمەڵگەیەکی گوندنشـینی یـان عەشـیرەتی مـاڵ نەتـەنیا ناوەنـدی چالاکییە ئابوورییەکانە، بەڵکوو شوێنی گشت چالاکییە فێرکاری، پەروەردەیی، کۆمەڵایـەتی، خۆشگوزەرانی و تا ڕادەیەکیش ئایینییەکان دێتە ئەژمار. لە ئاکامدا زنجیرەیەك کە تاکـەکانی خێزان بەیەکەوە دەبەستێتەوە زۆر بەهێزە و ئەندامانی خێزان لەژێر چاوەدێری تـۆڕێکی پتـەوی خزمایەتی بە یەکتر بەستراونەتەوە. لە پەیوەندیی لەگەڵ جۆرەکانی خێزانی لێکـدراو دەتـوانرێ باس لە جۆرێك خێزانی پێکەوە بەستراو یان بەکۆمەڵ بکرێ کە لەنێو ئیسـلاوەکانی باشـوور و وڵاتانی ئیسکاندیناوی لە ژێر ناوی "زادروگا" ناسراوە.

ئەم جۆرە خێزانە کە باشترە گرووپی خێزانی پێ بڵێین، لەڕاسـتیدا بـە شـێوەی گرووپێکـی هەرەوەزی بوو کە بە هاوبەشی خەریکی کاری کشتوکاڵ بوون. خواردن بە شـێوەی بەکۆمـەڵ و لەسەر سفرەیەك دەخورا و هەر کەس بە پێی ڕێکخستنێك کە لەسەر بنەمای تەمـەن و ڕەگـەز بوو لە جێگەیەکی دیاریکراودا جێی دەگرت. ئەندامانی زادروگا بە پشـت بەسـتن بـە میراتـی بنەماڵەیی ژیانیان بەسەر دەبرد و سیستەمی باوکسالاری تێیدا بالادەست بوو.

چەندین جۆری خێزانی پێکەوەبەستراو لە هیندوستان و ژاپۆن ( یابـان) بوونیـان هەیـە کـە بنەمای هەبوونیان چالاکییە ئابوورییەکان و هاوپێوەندییـە ئایینییـەکان یـان بـە وتـەی ئـیبن خەلدوون دەمارگیرییە ئایینییەکانە.

خێزانی " ستاکی"یش جۆرێکی دیکە لە خێزانی لێکدراوە کە تەنیا یەکێك لە کوڕەکان دوای هاوسەرگیری دەبێتە میراتگری کاروبارەکانی زەوییەکان و منداڵەکانی دیکە لەنێوان بەسەڵتی مانەوە و جیابوونەوە لە خێزان یەکێکیان دەبێ هەڵبژێرن. بە شێوەیەکی گشتی بە پێی پێوەری جۆراوجۆر دەکرێ خێزانی لێکدراو دابەش بکرێ و هەر لەم پێوەندییەشدا دەتوانرێ لە زاراوەگەلی وەك خێزانی لێکدراوی دایك ناوی، باوك ناوی، باوکنشینی، دایکنشینی، باوکسالاری، دایکسالاری، باوك سەردەستی، دایك سەردەستی، باوك تەوەری، دایك تەوەری، باوك ڕەچەڵەکی و دایك ڕەچەڵەکی کەڵك وەربگیرێ.

لۆپلەی (Leplay) کۆمەڵناسی فەڕەنسی، لە پەیوەندیی لەگەڵ هۆکارە ژینگەیی و جوگرافییەکان، دابەشکارییەکی دیکەی لە خێزان خستۆتەڕوو. ئەو دەڵێ کە دەشتە بەرفراوان و بەربڵاوەکان بۆ ژیانی چادرنشینی و شوانی لەبارن و وەها ژینگەیەك خێزانی بەبڵاوی باوکسالار بە هیرارکییەتێکی بەهێز، ڕووحییەی قەوی، بیر و باوەڕی ئایینی و ڕێزدانان بۆ نەریتەکان و پەیوەندییە خێزانییە بەهێزەکان دێنێتە کایەوە. لەحاڵێکدا کە لە وڵاتانێکی وەك نەرویج کە لەناو کۆمەڵێك دۆڵ و شێوی سروشتی دروست بووە، لە بەرامبەر ڕووحییەی بەهێز و هاوپێوەندیی پتەوی خزمایەتی، تووشی تاکگەرایی و گرینگیی سەربەخۆیی کەسایەتی دەبینەوە، بەم پێیە لە وەها ژینگەیەك بە جێگەی خێزانی فراوان و لێکدراوی باوکسالاری کە چەندین وەچە لە خۆیدا جێ‌بکاتەوە و وەچەیەکی نوێش بۆ پەیڕەویکردن لە نەریتەکانی باب و باپیران پەروەردە بکات، خێزانێك دێتە کایەوە کە تێیدا هەستی سەربەخۆیی و داهێنان لە منداڵەکاندا گرینگییەکی تایبەتی هەیە.

بە کورتی دەتوانین دابەشکارییەکەی" لۆپلەی" بە شێوەی خوارەوە بخەینەڕوو:

### ١ـ خێزانی باوکسالاری

واتە خێزانێك کە تێیدا باوك دەسەڵاتی تەواو و ڕەهای لەژێردەست دایە و منداڵەکان تەنانەت دوای هاوسەرگیریش لەژێر چاوەدێری خێزان دان. لەم خێزانە لەبەرچاوگرتنی فەرمان و ئەمری گەورەترەکان و ڕێزدانان بۆ نەریتی ڕابردووەکان، یاسای سەرەکییە. لەم خێزانەدا کەسایەتی تاك لەخێزاندا تواوەتەوە و بەم پێیە بڕیار لەئەستۆی خێزانە نەك تاك.

### ٢. خێزانی کەسایەتی پەروەر

خێزانێکە کە تێیدا بە هۆی دوورکەوتنەوەی جوگرافیایی و تایبەتمەندییە ناوچەییەکان، کەسایەتی تاکەکەسی و دێموکراسی بایەخ پەیدا دەکات و بەم پێیە شوێنکەوتنی کوێرکوێرانە و نەریت پەرستی خێزانی باوکسالاری نابینرێ. ئەم جۆرە خێزانانە لەناوچەگەلێك دروست دەبن کە لە باری جوگرافییەوە بە تەواوی لەگەڵ ناوچە دەشتاییە پان و بەرینەکان جیاوازی هەیە و دەرەتانی پێکهاتنی کۆمەڵگە بەربڵاوەکان بوونی نییە.

### ٣. خێزانی ناجێگیر و لەرزۆك

لۆپلە جۆری سێیەمی خێزان بە خێزانی ناجێگر و لەرزۆك ناو دەبات، واتە خێزانێك کە نە تاکەکانی لەسەر بنەمای باوباپیران پێدەگەیەنێ و نە هەستی سەربەخۆیی و پشت بە خۆ بەستنیش لە منداڵەکانی دروست دەکات.

## پێکهاتەی خێزانی عەشیرەتی

خێزانی عەشیرەتی لە ئێراندا ئەگەرچی خاوەن پێکهاتەیەکی ڕاوەستاو لەسەر بنەمای باوکسالارییە و لەژێر نفووز و باڵادەستیی پیاودایە، بەڵام ناتوانرێ بە "خێزانی لێکدراو" یان بەربڵاو یان "باوکسالار" دابنرێن، چونکە لە ئێراندا تەنیا لە سەدا ٦ی گشت خێزانە ئێرانییەکان کە سەرۆکەکانیان زیاتر لە وردەمالیکە قەدیمییەکان، یان پاشماوەی خان و ئاغاکان یان لە بازرگانە گەورەکانی شارن، لەم پلەیەدا جێ دەگرن. لە حاڵێکدا کە لەسەدا ٧٣ی خێزانەکانی شار و لەسەدا ٧٢ی خێزانە گوندنشینەکان لە خێزانی ژن و مێردایەتی پێك دێن. بەڵام ئەم جۆرە خێزانە ژن و مێردییانە، تایبەتمەندیی خێزانی ژن و مێردیی یان ناوکی ڕۆژئاواییان نییە، بەڵکوو لەژێر کاریگەریی بارودۆخ و وەزعی ژیان کۆچ نشینی و وەرزێری دایە. تۆڕە خزمایەتییەکان لە نێو عەشیرەکاندا دەکرێ لە شکڵی تایفە، تیرە، بۆنکوو، یان ماڵ ببینرێن.

خێزانی ناوکی بە شێوازی ڕۆژئاوایی لە ئێراندا بە خێزانێکی زۆر نوێ دێتە ئەژمار و لە ناوەندە شاری و پیشەسازییەکان لەحاڵی پەرەسەندن دایە و لەم ڕوانگەیەشەوە دەکرێ بگوترێ کە گۆڕانکارییە خێزانییەکان لە ئێران لە پەیوەندیی لەگەڵ گۆڕانی قەبارە، ڕەهەند، کەمبوونەوەی ئەرکەکان، ئاڵوگۆڕەکانی پەیوەندییە خێزانییەکان و بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی

که لەژێر ناوی گواستنەوەی خێزان لە حاڵەتی نەریتییەوە بۆ حاڵـەتی نـوێی ڕۆژئـاوایی ئـەنجام دراوە، ڕووی لە هەندێك لە توێژەکانی حەشیمەتی شارە گەورەکانە. ئەگەرچی لـە شـارەکانیش بە تەواوی گرینگییەك کە ئەم گۆڕانکارییانە لە پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتی ـ ئـابووری خێزانـدا هەیانە، هەنوکەش تۆڕە خزمایەتییەکان کەموزۆر توانایی خۆیان پاراستووە و وەك پەیوەنددەری نێوان خێزان و کۆمەڵگە ڕۆڵیان هەیە. لە نێو عەشیرەتەکاندا، هەر خێوەتێك سەر بە خێزانێکی سەربەخۆیە کە وەك یەکەیەکی بەرهەمهێنان و بەکارهێنان دێتە ئەژمار. بـە دەسـتەواژەیەکی دیکە هێمای ڕواڵەتی و بەرچاوی هەبوونی وەهـا یەکەیـەکی کۆمەڵایـەتی خێوەتـە. ئێسـتاکە خێزانە عەشیرەتییەکانی ئێران بە هۆی لاوازیی ئاژەڵداریی نەریتی لەگەڵ کێشـە و گـرفتی زۆر بەرەوڕوویە، تێڕامانەکان ئەوە دەردەخەن کە گرووپگـەلێکی زۆر لـە خـەڵکی عەشـیرەتی وەك گوندنشینەکان بۆ کار ڕوویان لە شارەکان کردووە و بە پیشە درۆیینەکان و بێکارییە شاراوەکان خەریکن. وادێتە بەرچاو کە کێشەکانی خێزانی عەشیرەتی لە ئێران بە گرینگییـەکی زیـاترەوە تـاوتوێ بکرێـت بـۆ ئـەوەی بـە دۆزینـەوە هۆکارەکـانی ئـەو پشـێوییانە پـێش بـە خەسـارە کۆمەڵایەتییەکانی بگیرێت.

## ئەرکەکانی خێزان

خێزان وەك نێوەنجیکار لە کۆمەڵایەتیبوونی منداڵ و هاوئاهەنگیی قووڵی ئەو لەگەڵ نۆرمـە کۆمەڵایەتییەکان، گرینگی و بایەخێکی زۆری هەیە. لایەنـە قـووڵ و شـاراوەکانی کەسـایەتی مرۆڤ لە پەروەردە و فێرکردنی قۆناغی منداڵییەوە سەرچاوە دەگرن و لەبەر ئەوەکـە سـاڵەکانی سەرەتای ژیانی مرۆڤ لە ژینگەی خێزانیـدا تێپـەڕ دەبـن و لـەم قۆناغـە دایـە کـە بناغـەی کەسـایەتییەکەی دادەنرێـت، دەتـوانرێ لـە گرینگیـی خێـزان و کاریگەرییـەك کـە لەسـەر پەروەردەکردنی تاك و هێزە ڕوحی و ئەخلاقییەکانی ئەو هەیەتی، تێبگەین.

بێجگە لە ئەرکی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی کردنی منداڵ، ئەرکەکانی دیکـەی خێـزان لـە پەیوەندیی لەگەڵ جۆرەکانیدا، جیاوازە. بـەڵام لـە هـەر حاڵـدا دەتـوانرێ تایبەتمەندیگـەلێکی سەرەکیی هاوشێوە لە جۆرە جیاوازەکانی خێزاندا دیاری بکەین. ئەرکی منداڵ بە دنیـا هێنـان، پێکهێنانی شوناسی کۆمەڵایەتی، پشیتوانی و ڕێنوێنیی تاك لـەو ئەرکانـەن کـە لـە تـەواوی کۆمەڵگەکان و هەموو جۆرەکانی خێزاندا گشتییە.

له خێزانە نەریتییەکانی لە جۆری خێزانی گوندنشین، بێجگە لە ئەرکەکانی سەرەوە، چەند ئەرکێکی دیکەش لە ئەستۆی خێزانە کە گرینگترینیان بریتین لە:

## ئەرکی بەرهەمهێنان

خێزانی گوندنشین بە پێچەوانەی خێزانی شارنشین، یەکەیەکی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانە کە تاکەکانی لەژێر چاوەدێری باوك، کە بەڕێوەبەرێتی مەزرای بەئەستۆوەیە، خەریکی کاری بەرهەمهێنان دەبن. لەڕاستیدا منداڵانی پیشەوەرانی شار لە کارگە خێزانییەکاندا ئەرکگەلێکیان لە ئەستۆ بوو کە هەنووکەش کەم تا زۆر ئەم جۆرە کارگە خێزانییانە بوونیان هەیە. لە خێزانی گوندنشین تەنانەت منداڵانیش ڕۆڵیان لە بەرهەمهێناندا هەیە. کوڕەکان لە کاروبارەکانی مەزرا و پاراستن و لەوەڕاندنی مەڕەکان یاریدەی باوکیان دەکەن و کچەکان لە دروستکردنی شیرەمەنییەکان، بەرەچنین، حەسیر تەنین و تەشی ڕستن و کاروبارەکانی ناوماڵ هاوکاریی دایکیان دەکەن. کۆچکردنی گوندنشینان بۆ شار و پەرەسەندنی پشەسازی بەرەبەرە گۆڕانکاری لە ئەرکی بەرهەمهێنانی خێزاندا پێك هێنا و لە ئاکامدا بەرەبەرە خێزان وەك یەکەیەکی بەرهەمهێنان و بەکارهێنەر بوو بە خێزانێکی ناوکی.

## ئەرکی پەروەردە و فێرکردن

خێزان لە کۆنەوە شوێنی فێرکردن و بارهێنانی منداڵەکان بووە. لە خێزانی گەورە باوکسالاری کۆندا فێرکردن و ڕاهێنانی منداڵەکان لەلایەن دایك و باوك، باوەگەورە و دایەگەورە باو بووە و زیاتر ئەم فێرکارییە بە فێربوونی قورئان و کتێبە ئایینییەکان دەستی پێدەکرد. بێجگە لە فێرکارییە ئایینییەکان، هەروەك پێشتریش گوترا، خێزان لە ڕێگەی گواستنەوەی دابوڕەسم و نۆرمە کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان و بە شێوەیەکی گشتی کولتوور لە پەروەردەی منداڵ و کۆمەڵایەتیکردنیدا ڕۆڵێکی بەرچاویان دەگێڕا.

وادێتە بەرچاو ئەمڕۆکە گۆڕانکاریی زۆر لە بواری ئەرکی پەروەردەیی خێزاندا هاتبێتە کایەوە. لەنێوان وەچەی دایك و باوکەکان و منداڵەکاندا جیاوازیی کولتووری ئاشکراتر دەبێت و لەم بارەوە لەوانەیە خێزانەکان تووشی پشێوی و ئاستەنگیی زۆر بکاتەوە.

## فێرکردنی پیشە و تکنیك

لە خێزانە نەریتییەکاندا، باوکان بە مەبەستی دابینکردنی داهاتووی منالّەکانیان، پیشە و تکنیکێك کە دەیانزانی، فێری منالّەکانیان دەکرد و ئەم نەریتە نە تەنیا لە خێزانە پیشەوەر و پیشەسازەکاندا برەوی هەبوو، بەلّکوو دەولّەمەندانیش بۆ ڕۆژی تەنگانە منالّەکانی خۆیان بۆ فێربوونی پیشەیەك هان دەدا بۆ ئەوەی ڕۆژێك سوودی لێ ببینن. ئەم ڕاستییە لە ناوئاخنی ئەدەبیات و چیرۆکە بەجێماوەکانی، لە سەدەکانی پێشووە بەرچاو دەکەوێت.

بێجگە لە ئەرکەکانی سەرەوە، خێزانی باوك دوای جیابوونەوەی منالّەکان و پێکهێنانی خێزانی نوێ، پشتیوانییە ئابووری و کۆمەلاّیەتییەکانیان لە ئەوان درێژە پێدەدەن و تەنانەت لە زۆربەی بابەتەکاندا دایك و باوکی کوڕەکە یان کچەکە پەروەردە و پاراستنی نەوەکانیان بە ئەستۆوە دەگرن.

خێزانی نەریتی تەنانەت لە شارەکانیش کەم تا زۆر هەندێك لە ئەرکەکانی خۆی پاراستووە، هەنووکەش بە هۆی هەبوونی سۆزداریی توند، ئەندامەکانی خۆیان دوای جێهێشتنی خێزانیش لە کاتی دژواریی و کێشە ئابوورییەکاندا بە تەنیا ناهێلّنەوە و تاکەکان لە پشتیوانی و یارمەتییە جۆراوجۆرەکانی خزمەکانیان بەهرەمەندن.

## تۆڕی خزمایەتی

خزمایەتی کۆمەلّەیەك لە پەیوەندییەکانە کە بە هۆی نزیکایەتیی خوێنی، لە ڕێگەی هاوسەرگیرییەوە یان خزمایەتیی شیری لەنێوان ژمارەیەك لە تاکەکاندا دێتە کایەوە و دەبێتە هۆی دەروەستی و بەرپرسایەتی تاکەکان دەرحەق بە یەکتر و تۆڕێك دروست دەکات کە خاوەن هێز و توانایەکی زۆرە. تۆڕی خزمایەتی بە تایبەت لە کۆمەلّگە نەریتییەکان بەسەرنجدان بە ئەرك و دەسەلاّتەکەی، گرینگییەکی زۆری هەیە. لەڕوالّەتدا دەسەلاّتی تۆڕی خزمایەتی لەوانەیە بە هۆی پیشەسازی بوونی کۆمەلّگەکان کەم بێتەوە، بەلاّم نفووز و بەکاربردنی دەسەلاّتی ئەم تۆڕە تەنانەت لە کۆمەلّگە شارنشینییەکانیش لە گۆڕێ دایە و ئەم ڕاستییە لە ولاّتانی پیشەسازی جیهانی ئەمڕۆشدا هەر دروستە. بە پێی وتەی "ویلیام گود" نووسەری کتێبی " شۆڕشی جیهانی و مۆدێلی خێزانی" و " خێزان و کۆمەلّگە" ناتوانرێ هیچ

خێزانێك بە ناوکی لەقەڵەم بدرێت و ئەگەر مەبەستی ئێمە لە خێزانی ناوکی، خێزانێك پێکهاتوو لە ژن و پیاو و منداڵەکان بێ، باشترە بە جێگەی زاراوەی ناوکی زاراوەی خێزانی ژن و مێردیی بەکار بێنین.

ئەو توێژینەوە جۆراوجۆرانەی کە لەپێوەندیی لەگەڵ ئەرکی تۆرە خزمایەتییەکان ئەنجام دراون، سەلمێنەری بەردەوامیی دەسەڵاتی ئەو جۆرە تۆڕانەیە. ئەم توێژینەوانە کە لە وڵاتانێکی وەك ئەمریکا، بەریتانیا، لەهستان، بەلجیکا ئەنجام دراون ئەوە دەردەخەن کە بەشێکی بەرچاو لە خێزانە ناوکییەکان (ژن و مێردی سەربەخۆ) هەنووکەش لە کاروبارەکانی وەك ئاگالێبوونی منداڵەکان، یارمەتی لە کاتی نەخۆشی، یارمەتیی دارایی، هاوکاریی لە کاروبارەکانی ناوماڵ، دۆزینەوەی پیشە پەنا بۆ تۆڕی خزمایەتی دەبەن. بۆ نموونە ئەو توێژینەوانەی لە پێوەندیی لەگەل باخچەکانی ساوایانی حکومەتی لەلەهستان ئەنجام دراون، ئەوە دەردەخەن کە تەنیا لە سەدا یازدە لە دایکانی خاوەن پیشە پێیان خۆش بووە کە منداڵەکانیان بنێرنە باخچەی ساوایان لە حاڵێکدا کە لەسەدا سی پێیان باش بووە کە منداڵەکانیان بە باوەگەورە یان دایەگەورە بسپێرن. (٦)

لە ئێراندا بە شێوەیەکی گشتی قسە لەسەر سێ جۆر خزمایەتی بە شێوەی خوارەوە دەکرێت:

### ١ـ خزمایەتیی خوێنی:

جۆرە خزمایەتییەکە کە "نزیکایەتیی خوێنی"شی پێدەڵێن. پێوەندیی دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکانیان و هەروەها پێوەندیی نێوان خوشك و براکان و ... لەم جۆرە لەقەڵەم دەدرێت.

### ٢ـ خزمایەتی لەڕێگەی هاوسەرگیرییەوە:

ئەم جۆرە خزمایەتییە بە هۆی هاوسەرگیرییەوە دێتە کایەوە. هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی هاوسەرگیرییەوە پێوەندیی لەگەل یەکتر دروست دەکەن و دەچنە ناو تۆڕی خزمایەتییەوە، بە بەشێك لەم گرووپە دێنە ئەژمار.

### ٣ـ خزمایەتیی شیری:

جۆره خزمایەتییەکە کە بە هۆی هاوشیربوونی دوو کەس دێتە کایەوە کـە دیـارە لـە بـاری شەرعییەوە و هاوسەرگیریی نێوان کچ و کوڕێك کە شیریان لە دایکێك خواردبێ، بەم هۆیـەوە قەدەغەیە.

لە ئێراندا خزمایەتیی خوێنی لە دوو جۆرەی دیکە گرینگی و بایەخی زیـاتری هەیـە و بـە تایبەت هاوسەرگیرییە ناوگرووپییەکان دەبنە هۆی پەرەسەندنی تۆڕە خزمایەتییەکان. دەسەڵاتی ئەم جۆرە خزمایەتییە و بەربڵاویی ئەم حۆرە تۆڕانە لە گوندەکان و کۆمەڵگە عەشـیرەتییەکانی ئێراندا زۆر زیاتر لە شارەکانە و وادیارە کە پەرەسەندنی پیشەسازی و شارنشینی دەبێتە هـۆی دابەزینی توندی گرینگیی و ئەرکەکانی تۆڕی خزمایەتی بە شێوەی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان.

لە سیستەمی عەشـیرەتی، " تـیرە" وەك یەکەیـەکی خـوێنی یـان خزمایـەتی عەشـیرەت لەقەڵەم دەدەرێت و بەم هۆیەوە تاکەکانی ناو تیرە و تایفەیەك خزمایەتی لەگەڵ یەکتر هەیـە و پێوەندییەکانی هاوسەرگیریش بە شێوەی ناوگرووپییـە. ئـەو چادرنشـینانەی کـە لـە ناوچـە جۆراوجۆرەکـانی وڵات، بـە شـێوەی یەکجێنشـینی دەرهـاتوون پێوەنـدیی خزمایـەتی و هاوسەرگیریی ناوگرووپییان کەم تا زۆر پاراستووە. بۆ نموونە جافکانلووەکانی گوندی سەهلاوای قووچان لەگەڵ کەسانی تاییفەی خۆیان لە گوندەکانی دیکە هاوسەرگیری دەکەن. بەشـێوەیەکی گشتی هاوسەرگیری لەناو کوردەکـانی قووچـان بـەزۆری لـە جـۆری هاوسـەرگیریی خۆبـەخۆی خزمەکانە.

ئەمڕۆکە لە کۆمەڵگـە شارنشـین و گوندنشـینەکاندا تـۆڕی خزمایـەتی هـەروا توانـایی و کارتێکەریی بەرچاوی هەیە، خێزانەکانی ئەندامی تۆڕی خزمایەتی لەژێر نفـووز و چـاوەدێریی توندی گرووپی خزمان دان و بە هۆی ئەم فاکتـەرەوە زۆر لـە بـەها و نۆرمـە کۆمەڵایـەتی و نەریتییەکانیان هەروا بەپارێزراوی ماوەتەوە و تاکەکان لە جێبەجێکردنیاندا بەرپرسن.

## گۆڕانکاریی لە خێزاندا

لە ئێران، خێزان لە ماوەی سێ چارەکە سەدەی دواییدا، تووشی گۆڕانکاریی زۆر بۆتـەوە و هەنووکەش لە حاڵی گۆڕان دایە. خێزان لە شێوازی کۆنی خۆی هاتۆتەدەر و بە شێوەی خێزانی ناوکی ( ژن و مێردی) پەرەی سەندووە.

لەگەڵ ئەمەشدا خێزانی بەربڵاو کە پاشماوەی خێزانی باوکسالاریی کۆنـە، هەنووکـەش بـە تەواوی لەناو نەچووە و بە تایبەت لە ناوچە گوندنشینی و عەشیرەتییەکان و شارە بچووکەکاندا

کەم و زۆر بەچاو دەکەوێ. لەم جۆرە خێزانانەدا هەنووکەش باوکەکان دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خێزانیان لە ئەستۆیە و ژن و پیاو لەهەندێك بابەتدا تەنانەت ئەگەر منداڵەکان ژیانی هاوسەرگیریشیان پێك هێنابێ، لەژێر چاوەدێری باوکیاندا درێژە بە ژیانی ژن و مێردایەتی خۆیان دەدەن و لە باری ئابوورییەوە بەستراوە بە باوکی خۆیانن. بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە هەتا ئێستاش لەبارەی خێزانی ئێرانی لە باری کۆمەڵناسییەوە توێژینەوەیەکی هەمەلایەنە ئەنجام نەدراوە و زانیارییەکانی ئێمە زیاتر لایەنی ئامارییان بەخۆوە گرتووە کە لەسەر بنەمای سەرژمێرییەکان بەدەست دێت. لە سەرژمێری گشتیی ئێران، چوار جۆر خێزان قبووڵ کراون: (٧)

١ـ خێزانی ژن و مێردی بەبێ منداڵ.

٢ـ باوك و دایك و ئەو کوڕ و کچانەی کە ژیانی هاوبەشیان پێك نەهێناوە.

٣ـ باوك و دایك و ئەو کوڕ و کچانەی کە هاوسەرگیرییان کردووە بەڵام منداڵیان نەبووە.

٤ـ باوك و دایك و کور و کچ و نەوەکانیان.

لە خێزانی جۆری چوارەم کە سێ وەچە دەگرێتەخۆ و جۆرێك خێزانی بەربڵاو دێتە ئەژمار، بەڕادەیەکی زۆرلە گوندەکان و ڕادەیەکی کەمیش لە شارەکاندا نیشتەجێن.

## گرینگیی خێزان

خێزان لە دنیای ئەمڕۆدا زۆر لە ئەرکەکانی خۆی لەدەست داوە. پەیدابوونی دامەزراوەگەلی فێرکاری وەك: باخچەی ساوایان، دایەنگە، قوتابخانە، ڕێکخراوە ئابوورییی، یاسایی، دادوەری و ئاساییشییەکان کە بەشێکی زۆر لە ئەرکەکانی خێزان ئەنجام دەدەن، سنووردداربوونی ئەرکەکانی خێزانی لێ کەوتۆتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێك لە ئەرکەکانی خێزان هەروا لەجێی خۆیاندا ماونەتەوە. لە گرینگترینی ئەو ئەرکانە ئامادەکردن و بەردەوامیی وەچە و لەئاکامدا مانەوەی کۆمەڵگەیە. لە ئەرکەکانی دیکە ئاگاداریکردن و چاوەدێری منداڵەکان لەو کاتانەدایە کە توانای بەڕێوەبردنی خۆیان و درێژەدانی ژیانیان نییە. ئەرکی دیکەی خێزان بە کۆمەڵایەتی کردنی منداڵە. واتە خێزان لە ڕێگەی پەروەردە و فێرکردنەوە منداڵەکانی لەگەڵ کولتووری کۆمەڵگە ئاشنا دەکات و بۆ گونجان لەگەڵ کۆمەڵگە ئامادەیان دەکات. خێزان لە گەشەی کەسایەتی منداڵ پشکی سەرەکی هەیە. لایەنە قووڵ و شاراوەکانی کەسایەتی مرۆڤ لە پەروەردە و فێربوونی ئەو لە قۆناغی منداڵیدا سەرچاوەی گرتووە. لەبەر ئەوەی کە یەکەمین

ساڵەکانی ژیانی مرۆڤ لە خێزاندا تێپەڕ دەبێ و لەم قۆناغە دایە کە بناغەی یەکەمی کەسایەتی ئەو دادەنرێ، دەتوانرێ بە تەواوی لە گرینگیی خێزان و ئەو کاریگەرییەی کە لەسەر کەسایەتی تاك و پەروەردەبوونی هێزە روحی و ئەخلاقییەکانی ئەو هەیەتی، تێبگەین. کۆمەڵناسان و دەروونناسانی کۆمەڵایەتی لە باری کاریگەرییەك کە خێزان لە کامڵبوونی کەسایەتی تاکەکەسدا هەیەتی، پلەیەکی بەرزی بۆ دیاری دەکەن و گرنگییەکی زۆری بۆ دادەنێن.

## خێزان لە شاردا

لە شارەکان بە پێی گەورەیی و بچووکی و تایبەتمەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، خێزانەکان جیاوازییان لەگەڵ یەکتر هەیە. لە شارە گەورەکاندا خێزانە ناوکییەکان بە ڕێژەیەکی زیاتر بوونیان هەیە. لەم خێزانانەدا جاری وایە ژن و پیاو هەردوکیان چالاکیی ئابوورییان هەیە و جاری وایە پیاو بە تەنیایی خەریکی کارە و پێداویستییەکانی خێزان دابین دەکات و ژن لە ماڵدا دەمێنێتەوە و تەنیا سەرگەرمی کارەکانی ناو ماڵە. جۆرێکی دیکە، خێزانە کۆچبەرە گوندییەکانن کە چوونەتە شار و نیشتەجێ بوون. ئەم جۆرە خێزانانە لە ئاکامی لێك بڵاوبوونی خێزانی بەرفراوانی گوندنشینی هاتوونەتە کایەوە. بەم شێوەیە کە یەك یان چەند کەس لە پیاوان شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان بەجێهێشتووە و لەگەڵ ژنەکانی خۆیان چوونە شارەکان و پیشەیەکیان پەیدا کردووە و بە پێی پیشەکەیان لە شاردا نیشتەجێ بوون. ئەم جۆرە خێزانانە پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ شوێنی نیشتەجێبوونی پێشووی خۆیان نەپچڕاندووە و پەیوەندییەکی دوولایەنەیان لەگەڵ خزمەکانی خۆیان هەیە. لە نێو خێزانە بەربڵاوەکانی شاریدا کە ژمارەیان زۆر کەمە، زۆربەی کاتەکان باوکەکان، خەرجی ژیانی خێزانیی خۆیان دابین دەکەن و منداڵەکانیش هەر یەکێکیان بە پێی توانا هاوکاریی بودجەی خێزان دەکەن. لە هەندێك لەم جۆرە خێزانانەدا کە بە شێوازی خێزانی ژن و مێردی بە زیادەوەیە، دابینکردنی خەرجی ژیان لە ئەستۆی منداڵەکانە و دایك و باوکە پیرەکانیان لە لای ئەوان ژیان بەسەردەبەن. لە هەندێك لە شارەکان ڕووبەڕووی تۆڕە بەربڵاوەکانی خزمایەتی دەبین کە پێکهاتوو لە ژمارەیەکی زۆر لە خێزانەکانن کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە یەکە لێکجیاکانی نیشتەجێبوون ژیان بەسەر دەبەن و خاوەنی ڕەوشی ئابووری سەربەخۆن و زیاتر لە ناوچەیەکی تایبەت نیشتەجێن. بەڵام دەرحەق بە یەکتر پەیوەندی و دەروەستیی ئەخلاقی، ئابووری و کۆمەڵایەتیان هەیە و لە کاتی پێویستی و

گرفته ئابوورییەکاندا هاوکاریی یەکتر دەکەن. لەگەڵ هەبوونی ئەم گۆڕانکارییە فکرییانە و پەیدابوونی ڕوحییەی تاکگەرایی کاریگەریی لەسەر خێزانەکانی گرووپی خزمایەتی داناوە و پەیوەندییە دوولایەنەییەکانی نێوان ئەو خێزانانەی کە لەژێر ناوی تۆڕێکی خزمایەتی دان، بەرەو لاوازیی چووە.

بە هۆی کەمبوونەوەی ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان خێزانەکان و لاوازیی پەیوەندییە خێزانییەکان جۆرێك حاڵەتی تەنیا مانەوە و گۆشەگیریی خێزانی هاتۆتە کایەوە کە ئەم کارە خەسارگەلی کۆمەڵایەتی و دەروونیی زۆری بەدواوەیە.

## خێزان لە گونددا

خێزانی گوندنشین نە تەنیا ناوەندی پەروەردەی منداڵەکانە، بەڵکوو لە هەمان کاتدا یەکەیەکی بەرهەمهێنەری ئابووریشە و ئەندامانی خێزان وەك فەرمانبەرانی دەزگایەکی ئابوورین کە لەژێر چاوەدێری باوکی خێزان و بە هاوکاریی یەکتر بە کاری وەبەرهێنان خەریك دەبن. لەڕاستیدا دەتوانرێ بگوترێ کە هەر یەك لە تاکەکانی خێزانی گوندنشینی بە ژن و پیاو و منداڵەوە لە کاری بەرهەمهێناندا بە جۆرێك شوێندانەرن و هەر یەکێکیان بەشێك لە کارەکەیان بە ئەستۆوەیە. بنەمای خێزانی وەرزێر لەسەر توانایی باوك ڕاوەستاوە و ئەو لە جێگەی بەڕێوەبەری کاروبارەکانی وەرزێری یەکەیەکی ئابووری و لەهەمان کاتدا بەرپرسی دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەندامانی خێزانە. کوڕەکان دوای چوونە ناو پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە جاری وایە لەلای باوکیان دەمێننەوە و لەژێر پارێزگاریی ماددی و مەعنەوی ئەودا بەسەر دەبەن و لە هەمان کاتیشدا خۆیان و هاوسەرەکانیان وەك فەرمانبەری خێزانی بەربلاو، لە کاری بەرهەمهێناندا بەشدارن و هەموویان لەسەر زەوی و مەزرایەك کار دەکەن و بەهاوبەشی بەهرەی لێ وەردەگرن. لە زۆر بابەتدا ئەو منالانەی چوونە ناو ژیانی هاوسەرگیرییەوە، جیا لە ماڵی باوکیان ژیان دەکەن، بەڵام پەیوەندییان لەگەڵ باوك و خێزانی باوکدا پارێزراوە و لە باری ئابوورییەوە بەستراوە بە باوکی خۆیانن و یان ئەوەکە لە خێزانی باوکیان جیابوونەتەوەو لە شارەکاندا نیشتەجێ دەبن، بەڵام پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ خێزانی باوکیاندا نەپچڕاندووە. پوڵ و پارە بۆ دایك و باوکی خۆیان دەنێرن و ئەوانیش زۆرجار خواردەمەنی بۆ منداڵەکانیان ڕەوانە دەکەن. منداڵەکانیش جاری وایە دەگەڕێنەوە گوند و زۆر

جاریش هاوسەرەکانیان لەنێو خەڵکی گەرەکەکانی خۆیان یان خزمەکانی دانیشتووی گوند هەڵدەبژێرن.

لە گوندەکانی ئێرانیش جاری وایە تووشی تۆڕی خزمایەتی دەبین کە لە چەند خێزانی جودا لە یەکتر پێك دێت و لەنێویاندا پەیوەندیی دوولایەنەی ئابووری و کۆمەڵایەتی بەرقەرارە. ئەم خێزانانە بە گشتی گرووپێکی کۆمەڵایەتی پێك دێنن کە تاییفەی پێدەگوترێ. ئەندامانی گرووپی خزمایەتی لە زۆر بابەتدا لە بوارەکانی ئابووری وەك وەرزێری، کەڵك وەرگرتن لە شیری مەڕومالات و چەندین بواری دیکەدا هاوکاری و یاریدەی یەکتر دەکەن.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی نۆیەم

١ـ رحیمی موقّر، جامعەشناسی خانوادگی، ص ١٢.

٢ـ ژان کازنو، مردم شناسی، ترجمه ثریا شیبانی، موسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی ١٣٤٩، ص ١٨.

٣ـ جمشید بهنام، ساختهای خانواده و خویشاوندی در ایران، انتشارات خوارزمی، ١٣٥٢، ص ٢٢ ـ ١٩.

٤ـ فردریك بارث، ایل باصری، ترجمه کاظم ودیعی، ١٣٤٣، موسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی ص ٢٣.

٥ـ حبیب الله پیمان، توصیف و تحلیلی از ساختمان اقتصادی و اجتماعی و فرهنگی ایل قشقائی، دانشکده بهداشت ١٣٤٧.

٦ـ جامعەشناسی خانواده، دانشکده علوم اجتماعی ١٣٥٦.

٧ـ مهدی امانی، شکل و تحول خانواده در ایران، مرداد ١٣٤٩، بخش جمعیت شناسی موسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی دانشگاه تهران.

# بەشی دەیەم

## بەهاکان، نۆرمەکان و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی

### ئا ـ بەها کۆمەڵایەتییەکان

### ١ـ پێناسەی بەها کۆمەڵایەتییەکان

وشەی بەها هاوواتای وشەی ئینگلیزی (Value) بە واتای پلە، بایەخ، ڕێزگرتن، گرینگی پێدان، و (Valeur)ی فەڕەنسی بە واتای نرخ، ڕێژە و دراو هاتووە.(١)

لە کۆمەڵناسییدا "بەهای کۆمەڵایەتی" بریتییە لە شتێك کە جێگەی ڕێز و قبوولکردنی هەموانە. بەهای کۆمەڵایەتی ئەو بابەت و کاروبارانە لەخۆ دەگرێ کە باش و دڵخوازن و جێگەی ویست و ئارەزووی زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگەن. بەهای کۆمەڵایەتی یەکێك لە چەمکە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسییە و کۆمەڵناسان لەم بارەوە ڕوانگەی جۆراوجۆریان دەربڕیوە.

ئۆگبێرن (Ogburn) و نیمکۆف (Nimkoff) دەڵێن: بەهای کۆمەڵایەتی حاڵەت یان کردەوەیەکە کە لە لایەن کۆمەڵگەوە بایەخی پێدەدرێت. بەهای کۆمەڵایەتی، دەبێتە پاڵنەری بەریانە کۆمەڵایەتییەکان و بەریانە کۆمەڵایەتییەکان ئەو حەز و ویستە گشتییانەن کە لە تاکدا پێك دێن و تێگەیشتنەکان، هەست و سۆز و کردەوەکانی ئەو لە بوارە دیاریکراوەکاندا وەرێ دەخەن.(٢)

ئەم حەزە بە پێی کەسایەتی تاکەکان جیاوازە و بە شێوەی کەسایەتی توانایی‌خواز، زانستخواز، ڕێز خواز و ... دەردەکەوێ. (٣)

ژان کـازینۆ (Jean Cazneuve) دەنووسـێ: " بیروڕاکـان، نۆرمـەکان، ناسـیارییەکان، تکنیکەکان و ئامرازە ماددییەکان کە بیروڕا و حەزەکان لە دەورییاندا شکڵیان گرتووە و تـاقی کراونەتەوە، بەها کۆمەڵایەتییەکانی گرووپێك پێك دێنن.(٤)

بەهای کۆمەڵایەتی وەك دیاردەیەکی سەرتر لە تاکدا و وەك شتێکی دیار و کامڵ کە باشتر کردنی مەیسەر دەبێ بەڵام حاشالێکردنی نامومکینە، بەسەر تاکەکاندا دەسەپێنرێت.(٥)

بەهای کۆمەڵایەتی هەموو ئەو شتانە لەخۆ دەگرێ باش یان خراپ ـ کـە جێگـەی حـەز و هۆگریی مرۆڤن ـ هەر کارێك ـ ماددی یان مەعنەوی ـ کە لە کۆمەڵگەدا خاوەن ڕێز و بایـەخ بێ و پێداویستییە ماددی و ناماددییەکانی مرۆڤ دابین بکات، یان هـەر شـتێکی گرانبـایی و بەسوود، بە یەکێك لە بەها کۆمەڵایەتییـەکان لەقەڵـەم دەدرێ. کاتێـك ئەمـە فێـری منـداڵ دەکەین کە ڕێز لە کەسانی گەورەتر لەخۆی بگرێ و سڵاویان لێ بکا، گوێ لە قسـەی دایـك و باوکی بگرێ و ڕێزیان بۆ دابنێ و بە قسەیان بکات، لەڕاستیدا بەها کۆمەڵایەتییان بـە گـوێی ئەودا دەخوێنین و لە زەینی ئەودا جێ دەکەینەوە.

ماگ دۆگاڵ (Mc.Daugal) و لاسول (D.Lasswell) پێیان وایە تاکەکان بـۆ گەیشـتن بە ئامانج، واتە " بەها کۆمەڵایەتییەکان" لە ئامرازەکانی بەرەست سـوود وەردەگـرن. بـەڵام شێوە و کاتی دابین بوونی ویستەکان تەنیا لە چوارچێوەی کولتوور و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و بارودۆخ و ئەو بەربەستانەی کە لە کۆمەڵگەدا بوونیان هەیە، جێبەجێ دەبێ. مرۆڤ بۆ گەیشتن بە بەهای کۆمەڵایەتی کەڵك لە سەرچاوەکانی بەردەست وەردەگرێ و ئەم سـوود وەرگرتنـە لـە پێناو و لە ڕێگەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان ئەنجام دەدرێ. (٦)

بـەها کۆمەڵایەتییـەکان لەوانەیـە پشـت ئەسـتوور بـە بنـەما و دیاردەگـەلێك بـن کـە بەرژەوەندیی یان زیانی کۆمەڵایەتیان بـەدواوە بێـت. بـەم هۆیـەوە شـیاوی ڕوونکردنەوەیـە و دەتوانرێ لە ڕێگەی توێژینەوە و بەڵگەهێنانەوە هۆکارەکانی پەیـدابوونییان بخرێتـەڕوو و ئـەوە ڕوون بکرێتەوە کە بە چ شێوەیەك بەشێك لە بەها کۆمەڵایەتییە نوێیەکان دژایەتی لەگەڵ بەها کۆنەکان پەیدا دەکەن و نـاکۆکن و بـە پاسـاودانی هۆکارەکـانی ئـەم دژایەتییانـە و ناسـینی بابەتەکانی سەرچاوەگرتوو لێیان بوارێکی کۆمەڵایەتی لەبار بۆ قبووڵکردنی بەها نوێیەکان پێك بهێنرێت.

## ٢ـ فرەچەشنی و گۆڕانی بەها کۆمەڵایەتییەکان

بەها کۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندیی لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکاندا ڕێژەیین. لە هەندێك لە کۆمەڵگەکان لەوانەیە دیاردەیەك جێگەی ویست و ئارەزووی زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگە بێ و وەك بەهایەکی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم بدرێ، بەڵام لە کۆمەڵگەیەکی دیکە ئەو دیاردەیە وەك بەها نەناسرێ و تەنانەت دژەبەها بێت.

کلاکۆن (Kluckhon) دەڵێ: لە گشت کۆمەڵگە مرۆییەکان، بۆ پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ، مروڤ و سروشت، کار و کات و ... گرینگییەکی تایبەت دادەنێن و لە بواری ئەم بابەتە گرینگە پەیڕەوی لە بنەماگەلێکی دیاریکراو دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا لەکولتوورە جیاوازەکاندا، بنەماگەلی جۆراوجۆر بۆ نرخ دانان لەسەر ئەم بنەمایانە هەیە. لە ڕوونکردنەوەی ئەم گریمانەیەدا، کلاکۆن پێنج کۆمەڵگەی بچووکی خستە ژێر توێژینەوە و بەو ئاکامە گەیشت کە بۆچوونەکانی خەڵك لەم پێنج کۆمەڵگەیەدا لە یەکتر دوورە و تەنانەت دوو کولتوور سەبارەت بە کارێك خاوەن بۆچوونی هاوشێوە نین. (٧)

بەها کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەیەك لەوانەیە لە توێژێکەوە بۆ توێژێکی دیکە جیاوازی هەبێ و تەنانەت دژبەیەکیش بن. ئاکار، ڕەفتار، زەوق و حەز، شێوازی ژیانی کرێکار، وەرزێر، فەرمانبەر و سەرمایەدار جیاوازە و بە تێپەڕینی کات و سەردەم گۆڕانی بەسەردا دێت. هەروەها لەوانەیە لە قۆناغێکی دیاریکراو لە مێژوو، دیاردەیەکی تایبەت لە کۆمەڵگەدا وەك بەهای کۆمەڵایەتی بناسرێ بەڵام، لە کات و قۆناغێکی دیکەدا ئەو کارە جێگەی سەرنجی خەڵك نەبێ و وەك بەهای کۆمەڵایەتی لەقەڵەم نەدرێت و تەنانەت نەگونجاو و بێبایەخیش بێ.

بەهای کۆمەڵایەتی لە زەماندا گۆڕانی بەسەردا دێت. بایەخ و گرینگییەکەی کەم دەبێتەوە و لەوانەیە وردەوردە جێگەی خۆی بە بەهایەکی دیکە بدات و یان ئەوەی کە بە پێچەوانەوە، گرینگیی زیاتر بەدەست بێنێ و بە شێوەی بەهایەکی کۆمەڵایەتی بەرز دەربکەوێت.

## ٣ـ جۆرەکانی بەها کۆمەڵایەتییەکان

بەها کۆمەڵایەتییەکان چەندین جۆری جیاوازییان هەیە کە لەو جۆرانە دەتوانین ئاماژە بکەین بە: بەها کۆمەڵایەتییەکانی سامان، دەسەڵات، زانست، خۆشەویستی، ڕێز، پارێزکاری، دینداری، سەلامەتی و بەها ئەخلاقییەکان و ... . گەیشتن بە هەر یەك لەم بەها

کۆمەڵایەتییانە لەوانەیە ببێتە هۆکاری گەیشتن بە بەهایەکی کۆمەڵایەتی دیکە و یان بەدەسهێنانی بەهای کۆمەڵایەتیی هاوشێوە مەیسەر بکات. بۆ نموونە بەها کۆمەڵایەتییەکانی پارێزکاری و دینداری لە بەها کۆمەڵایەتییە قووڵ و ڕیشەدارەکانن کە بەها کۆمەڵایەتییەکانی وەك ڕێز و خۆشەویستیش بەدوای خۆیاندا دێنن. بێجگە لەمەش، پارێزکاری لەوانەیە وەك هۆکارێك، بەهای کۆمەڵایەتی پارێزکاری بەهێزتر بکات. حەزی چوون بۆ زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان لە کۆمەڵگەی ئێمە بە تایبەت لە کۆمەڵە گوندنشینییەکان، دەرخەری گرینگیی بەها ئاینییەکانە. توێژینەوەی بەربڵاو کە لە بواری ئەنگیزە و پاڵنەری گوندنشینەکان لە هەندێك لە ناوچە گوندنشینییەکانی ئێران ئەنجام دراوە، سەلمێنەری ئەم بۆچوونەیە. لە یەکێك لەم توێژینەوانەدا لە ٦٠ خێزانی گوندنشین پرسیار کراوە کە لە حاڵەتی هەبوونی پووڵ و پارەی تەواو چ کارێك ئەنجام دەدەیت؟ لە سەدا ٢١/٧ ی ئەوان، یانی زۆرترین ڕێژە، چوون بۆ زیارەتی ئەم شوێنانەیان نووسیوە. ئەم کارە بەبێ‌شك پەیوەندیی بە بڕوای پتەوی گوندنشین بە ئایینەوە هەیە. چوون بۆ زیارەت ئەنجامدانی ڕێوڕەسم (٨) و ڕێوشوێنی ئایینی تایبەتی لەگەڵە کە لەسەریەك بەهای کۆمەڵایەتی ڕێز بەدوای خۆیدا دێنێ. بەم هۆیەوە بابەتی زیارەت بەردەوام زەینی تاکی گوندنشین بەخۆیەوە خەریك دەکات و یەکێك لە ئاواتەکانی ئەوە و ئەو تاکە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هان دەدات. بەها کۆمەڵایەتییەکانی ئەخلاق و تەقوا لە هەندێك پیشەی وەك یاسا، پزیشکی، گرینگیی زیاتری هەیە. سوێندخواردنی یاسایی لە کۆتایی قۆناغی خوێندنی پزیشکی یەکێك لە نیشانە دیار و بەرچاوەکانی ئەمەیە. ڕێزدانان بۆ تاك لەوانەیە ئاکامی بەها کۆمەڵایەتییەکانی دیکە بێ، وەك ڕێزدانان بۆ کەسانی پیر و بەساڵاچوو کە یەکێك لە بەها کۆمەڵایەتییە کۆنەکانە و لە ڕابردوویەکی دوورەوە بە هەندێك گۆڕانکاریی کەم‌وزۆر ئاشکرا هەروا بەردەوام بووە و ماوەتەوە.

بەهای کۆمەڵایەتی پیری و بەساڵاچوویی تا ڕادەیەکی زۆر بە شارەزایی، کارامەیی و ئەو ئەزموونانەی کە مرۆڤ لە ماوەی ژیانی کردەییدا بەدەستی دێنێ، بەستراوەتەوە و لەو شوێنەی کە باس لە بەها کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان دەکرێ، قسە لە بەها کۆمەڵایەتییەکانی سامان، شارەزایی و ئەزموونیش لەگەڵ پیری و بەساڵاچوویی دەکرێ: " پیاوێك بوو خاوەن سامانی زۆر و بە تەمەن و بە ئەزموون..."، پیرەپیاوەکان لە ماوەی ژیانی پراکتیکیی دوور و درێژی خۆیان شارەزایی زیاتر وەدەست دێنن کە بە بەهای کۆمەڵایەتی و ڕێزی ئەوانەوە زیاد دەکات.

خاوەندارێتی و ملکدارییش لەو بەها کۆنانەن کە دەبنە هۆی وەدەسهێنانی بەهای کۆمەڵایەتی ڕێز و حورمەت بۆ تاك و زۆربەی کاتەکان تاك بە لەدەستدانی زەوییەکەی بێحورمەت دەبێ و ڕێز و ئابڕووی کۆمەڵایەتی خۆی لەدەست دەدات."... کوڕەکانم بەبێ ملك بێچارە و بێڕێز دەبن". بەهای کۆمەڵایەتی خاوەندارێتی و هەبوونی زەویوزار لە کۆمەڵگەی گوندنشینی یەکێك لە بەهێزترین پاڵنەرەکانە. خاوەن ملك بوون بۆ تاکی گوندنشین پاڵنەرێکی سادە نییە، بەڵکوو کارێکە کە بێجگە لە لایەنی بەرژەوەندێتی و بەرهەمی زەوی، پەیوەندیی بە ڕێز و ئابڕوو و پلەی کۆمەڵایەتی تاکەوە هەیە... لە کۆمەڵگەی گوندنشینی کەسێك کە زەویوزاری هەیە لە پێگەی کۆمەڵایەتی بەرزیش بەهرەمەندە و ئەو کەسەی زەویوزاری زیاتری هەیە، پێگە کۆمەڵایەتییەکەشی بەرزترە. خاوەندارێتی ملك و ماڵ لە کۆمەڵگەی گوندنشینی ناسێنەری کەسایەتی تاك و هۆکاری وەدەسهێنانی ڕێزی کۆمەڵایەتییە. بەم پێیە خاوەن زەوی بوون تەنیا لەبەر داهات و پوڵ پەیداکردن نییە، بەڵکوو لایەنە دەروونی ـ کۆمەڵایەتییەکانیشی شیاوی گرنگی پێدانن. بێجگە لەمەش زۆر شتی دیکە هەیە کە وەك پاڵنەری گرینگ لە ژیانی کۆمەڵایەتیی تاکدا دێنە ئەژمار. لە گوندەکان هەبوونی فەرش و قالیچە لە ڕابردوودا و لە سەردەمی ئێستاشدا ترومبێل ( سەیارە) و شتی لەم جۆرە و هەبوونی بینا و خانووی تازە دروستکراو لەسەر شێوازی بیناکانی شار، جۆرێك لە ڕێز و ئابڕووی کۆمەڵایەتی بۆ خاوەنەکەی بەدوای خۆیدا دێنێ. لە " برایم ئابادی کاشمەر" بەخێوکردنی مەڕوماڵات بە تایبەتی هەبوونی مانگا بە یەکێك لە بەها کۆمەڵایەتییەکان لەقەڵەم دەدرێ. ئەم بەها کۆمەڵایەتییە تەنانەت لە لایەلایەی دایکان بۆ منداڵەکانیشیاندا دەردەکەوێ. بەم هۆیەوە پاڵنەری بەخێوکردنی مەڕوماڵات بە هۆی بەهای بەرزی کۆمەڵایەتییەکەی لە گونددا بەهێزە. (٩)

خاوەندارێتیی زەویوزار دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە دەبێتە هۆی وەدەسهێنانی سامان و سامانیش یەکێك لەو بەها کۆمەڵایەتییانەیە کە بەهاکەی بۆ خاوەندارێتیی زەویوزار دەگوازرێتەوە. بەم هۆیەوە خاوەندارێتی یەکێك لە بەها کۆمەڵایەتییەکانە کە لەگەڵ ماڵ و سامان تێکەڵە."... تاقانەی سەردەمی خۆی بوو و لە هەر ساڵێکدا دووسەت هەزار دیناری بەرهەم هەبوو..." بەهای کۆمەڵایەتی سامان لە زۆر بابەتدا بە ئامانجی کۆتایی نایەتە ئەژمار، بەڵکوو وەك ئامرازێك بۆ وەدەسهێنانی بەها کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لەقەڵەم دەدرێت. کەسێك کە خاوەنی ماڵ و سامانە، دەتوانێ لە میوانداریکردنی خەڵکی دیکە سوود

لە سامانەی وەربگرێ و خۆشەویستیی بەدەست بێنێ و بە بەهای کۆمەڵایەتیی ڕێز و حورمەتی خۆیەوە زیاد بکات.

میوانداریی گەورەکان کە بە ڕێوڕەسمێکی تایبەتەوە لە لایەن خێزانەکانی سەر بە توێژی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە بەڕێوە دەچن، زیاتر بە مەبەستی وەدەسهێنانی بەهای کۆمەڵایەتی، ڕێز و خۆشەویستییە. ئەم کارە بە تایبەت لە ڕابردوودا گرینگییەکی زۆری هەبووە. "... هەر ڕۆژ خەرجی مەتبەخی ئەو دووهەزار دینار بوو و چوارسەد کەسی بە ماڵی خۆی بۆ مەککە دەبرد..." بەکەڵك وەرگرتن لە سامان هەروەها دەتوانرێ لە بواری کاروباری خێر و چاکە و بەرژەوەندیی گشتی وەك دروستکردنی نەخۆشخانە، دەرمانخانە، قوتابخانە و کاری دیکەی لەم جۆرە هەنگاو هەڵبگیرێ و خۆشەویستی هەمووان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و لە بەهای کۆمەڵایەتی ڕێز و حورمەت بەهرەمەند بێت.

هەروەك گوترا بەها کۆمەڵایەتییەکان جۆراوجۆرن و لە ڕێگەی جۆراوجۆرەوە بەدەست دێن. لە ڕێگەی دارایی و سامانەوە دەتوانرێ پرستیژێکی کۆمەڵایەتی بەرز بەدەست بهێنرێت و بوێری، بەهێزی، پیاوەتی و شارەزایی لە کاریشدا وەك بەهایەکی کۆمەڵایەتی سەرەکی لەقەڵەم دەدرێن. لە چیرۆکە کۆنەکاندا بە شێوەی جۆراوجۆر باسی ئازایەتی و پیاوەتی یان دڵفراوانی و میواندارییکردن و ... کراوە. و نموونەی زۆر جوانیش هێنراوەتەوە. بەڵام جاری وایە لەوانەیە چەند بەهایەکی کۆمەڵایەتی پێکەوە ببنە ئامرازێك بۆ وەدەسهێنانی دەسەڵات. بۆ نموونە " پیاوێك بوو خاوەن سامانی زۆر و بەهێز و جوانچاك و بە تەمەن و بەئەزموون و زانا، خاوەن منداڵی لێهاتوو و بەتوانا، کە هەموویان لە گوێڕایەڵی و بەقسەکردنیدا حازر و ئامادە بوون ...". لێرەدا دەبینین کە بەهای کۆمەڵایەتی سامان، تەمەن، شارەزایی و هەبوونی منداڵی لێهاتوو هەر یەکێکیان لە هەمان کاتدا کە بەهای خۆیان ڕادەگرن، لە بردنەسەری بەهای یەکتریشدا کاریگەری دوولایەنەیان هەیە و لەسەریەك دەبنە ئامرازێك بۆ وەدەسهێنانی ڕێز و دەسەڵاتی تاکەکە.

جاری وایە بە هۆی بارودۆخ و پێویستیی کۆمەڵایەتی، بەها وەك نۆرمێکی کۆمەڵایەتی پڕبایەخ دەردەکەوێ. داب و ڕەسمی میوانداری کردن لە کۆمەڵگە، بە تایبەت لە کۆمەڵگەی گوندنشینی و عەشیرەتی، یەکێك لەو نۆرمە کۆمەڵایەتییانەیە کە بەڕێوەبردنی دەبێتە ئامرازێك بۆ وەدەسهێنانی بەهای کۆمەڵایەتی ڕێز و حورمەت لە کۆمەڵگەدا.

### ب ـ نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان

نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان ئەو شێوازە ڕەفتارە دیاریکراوانەن کە لە گرووپ یان کۆمەڵگەدا باون و تاك لە ڕەوتی ژیانی خۆیدا فێریان دەبێت، بەکاریان دێنێ و هەروەها چاوەڕوانیشە کە تاکەکانی دیکەی ناو گرووپ یان کۆمەڵگە ئەنجامیان بدەن. بۆ نموونە شێوازی قسەکردن لەگەڵ کەسانی دیکە، سلاو کردن، ڕێزدانان، دەست لێدانەوە بەشێك لەو ڕێسا و ڕێوڕەسمانەن کە تاکەکان لە ڕێگەی فێربوون و بارهێنانەوە فێریان دەبن و بەکاریان دێنن و لە جێبەجێکردنی ئەم نۆرمانە چاوەدێری بەسەر کەسانی دیکەشدا دەکەن. بەها کۆمەڵایەتییەکان بەرەبەرە بە شێوەی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دەردێن و بە لەبەرچاوگرتنیان کۆمەڵگە ڕێکوپێکی بەدەست دێنێ. ئەگەر کەسێك نۆرمی کۆمەڵگە یان گرووپ لەبەرچاو نەگرێ، تووشی سەرکۆنە و تەنانەت سزا دەبێتەوە. بۆ نموونە "فەرموو کردن" یەکێك لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی ئێمەیە. هەمووی ئێمە کاتێك دەمانەوێ لە ژوورێك بچینەدەر یان ئەوەکە بچینە ناو ژووری نان خواردن، فەرمووی یەکتر دەکەین و لە چوونەدەر یان چوونەژوور لە شوێنێك، مافی وەپێشکەوتن و لەپێشدا ڕۆیشتن بە کەسانی گەورەترە. بەڕێوەبردنی ئەم ڕەسمە ئەخلاقییە ڕەزامەندیی ئێمە ڕادەکێشێ. لەبەرچاوگرتنی نۆرمی کۆمەڵایەتی تەنیا لە هەبوونی پاداشت یان سزا سەرچاوە ناگرێت. ئێمە لە بەڕێوەبردنی ئەم ڕێسا و نۆرمانە پێویستیمان بە وەبیرهێنانەوەی کەسانی دیکە نییە. ئەم ڕێسا و هەڵسووکەوتە جوانانە بەشێك لە وجوودی ئێمەیە و بە جۆرێك ناسیاریمان لەسەری هەیە و پێی ئاشناین و بەڕێوەبردنیان بە ئەرکی خۆمان دەزانین و بەکارنەهێنانیان ئێمە تووشی هەست کردن بە گوناح دەکات. بە دەبڕینێکی دیکە، تاکەکان لە حاڵەتی سەرپێچی کردن لە نۆرمە گرووپییەکانخۆیان سزا دەدەن. لەبەرچاوگرتنی نۆرمی کۆمەڵایەتی جۆرێك هاوئاهەنگی و سازان لەگەڵ کۆمەڵگەیە. لە زۆر بابەتدا هاوئاهەنگ بوون لەسەر بنەمای حەز و ویست و هۆگریی تاکە و جاری وایە بە پێی ئیجباری کۆمەڵایەتی جێبەجێ دەکرێ. تاك هەر لە سەرەتای منالی و شکڵگرتنی کەسایەتی لە ڕێگەی خێزان، باوك و دایك، خوشك و برا گەورەکان، دۆستان و خزمان بەرەبەرە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان فێر دەبێت و دەیانکاتە بەشێك لە کەسایەتی خۆی و فێر دەبێ کە ئەوەی کە

نۆرمی کۆمەڵایەتییە بەکاری بێنێ و ئەوەی کە بە پێچەوانەی نۆرمی کۆمەڵایەتییە، بەکاری نەهێنێ.

قبووڵکردنی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دوو حاڵەتی هەیە. یەکێك ئەوەکە کۆمەڵگە یان گرووپی وەك خێزان، باخچەی ساوایان یان قوتابخانە یارمەتی بەکۆمەڵایەتیبوونی تاك دەکەن و لە ڕێگەی فێرکردن، تاکەکان لەگەڵ نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی گرووپ ئاشنا دەکەن و ناچاریان دەکەن ئەنجامیان بدەن. دووهەم ئەوەکە تاك خۆی بە دیتنی ڕەفتارەکانی تاکەکانی گرووپ یان کۆمەڵگە شارەزای نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ و بەڕێوەیان دەبات.

لە هەر کۆمەڵگەیەکدا بۆ لەبەرچاوگرتن و بەڕێوەبردنی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، ڕێساگەلێکی عورفی و داڕێژراو ( نووسراو) بوونیان هەیە. ڕێساکان لە ڕێگەی چاوەدێری و کۆرنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی جێبەجێ دەبن. هەموو کەس ئەوانی تر لە بەڕێوەبردنی نۆرمی گرووپ یان کۆمەڵگەی خۆیان دەخەنە ژێر چاوەدێری. لە کۆمەڵە بچووك و سنووردارەکانی وەك گوند، عەشیرەت یان تاییفە کە پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان ڕووبەڕوو و نزیك و لەسەر بنەمای ناسینی دوولایەنەیە، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بایەخی زۆری هەیە و وێڕای گوشار خستنە سەر تاکەکان ناچاریان دەکات نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بەڕێوە ببەن. لە کۆمەڵگە گەورەترەکان، لە شارەکان بە تایبەت لە شارە گەورەکان کە خەڵك لێك نامۆن، کۆنترۆڵکردنی تاکەکان لە ڕێگەی دامودەزگاکانی بەڕێوەبردن، ئاساییش و سەربازییە. تێپەڕینی ترۆمبێل لە کاتێکدا کە چرای ڕێنمایی سوور بێ، قەدەغەیە و کارێکی دژەنۆرمە و جەریمەی لەسەرە. نۆرم ئەوەیە کە شۆفێرەکە ترۆمبێلەکە ڕابگرێ هەتا چراکە سەوز دەبێت. ئەو کات لە چوارڕێ یان شەقام تێپەڕ ببێ. ئەگەر تاکێکیش لە کاتی سووربوونی چرای ڕێنمایی لە شەقام یان چوارڕێ تیپەڕ بێت، لەلایەن کەسانێکەوە کە لە چاوەڕوانی سەوزبوونی چراکە دان، سەرکۆنە و سەرزەنشت دەکرێ. کاتێك کە چەند موسافیرێك لە گەراج چاوەڕوانی پاس دەکەن و چەند کەسێکیان جگەرە دەکێشن و کەسێك دێت و پێیان دەڵێ: برا بەڕێزەکان بۆ جگەرە دەکێشن؟ مەبەستی ئەوە نییە کە لێرەدا جگەرەکێشان قەدەغەیە و دژی نۆرمی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەیە، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە کە جگەرە نەکێشن. دیارە ئەمە کارێکی ئەخلاقییە و پێشنیارە پێیان دەکات و ئامۆژگارییان دەکات. ئەم کارە لەگەڵ کاتێك کە کەسێك لەناو پاسی ناوشاردا جگەرەیەك داگیرسێنێ و دووکەڵەکە بەبا دەکات، یان لە کاتێکدا کە جگەرەی بە لێوەوەیە و سواری پاس دەبێ، جیاوازی هەیە. جگەرەکێشان لەناو پاسەکەدا بە پێچەوانەی نۆرمی کۆمەڵایەتییە و

تاکی پێشێلکاری ئەم نۆرمە لەوانەیە لەگەڵ نارەزایەتی و سەرکۆنەی خەڵك بەرەورِوو بێتەوە و دەست لە کردەوە دژە نۆرمەکەی هەڵبگرێ. بەم شێوەیە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە لە بەرێوەبردنی نۆرمی کۆمەڵگە بە مەبەستی رێکوپێکی کاروبارەکانی کۆمەڵگە، جێگیرکردن و پاراستنی یەکریزی و یەکگرتوویی چاوەدێری یەکتر دەکەن. کاتێك هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە بەکار بێنن، هاوئاهەنگی و ئاساییشی کۆمەڵایەتی دێتە کایەوە. لە حاڵێکدا ئەگەر نۆرمەکان لەبەرچاو نەگرن یان ئەوەکە کۆمەڵگە خاوەن نۆرمگەلی دژبەیەك بێت، نارێکی و پشێوی لە کۆمەڵگەدا دێتە ئاراوە و سیستەمی کۆمەڵگەش تووشی لەرزۆکی و بێهێزی دەبێت. نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە چەند جۆرێکن. بەشێك لە گرینگترین نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بریتین لە:

**١ـ نەریتی کۆمەڵایەتی:** نەریتە کۆمەڵایەتییەکان ئەو رەفتارانەن کە لە سەرەتادا بۆ پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ بەدی دێن و بە هۆی دووپات بوونەوە لە درێژیی زەمەندا وردەوردە بە شێوەی جێگیر دەدرێن. وەك داب و رەسمی میوانداری لە کۆمەڵە گوندنشینی وعەشیرەتییەکان. لە گوندەکان و ناوچە عەشیرەییەکاندا بە هۆی نەبوونی هوتێل و موسافیرخانە یان شوێنێك بۆ مانەوە لە شەودا، موسافیرەکان زیاتر دەچنە ماڵی گوندنشین و عەشیرەتەکان. ئەم دیاردەیە وردەوردە بە هۆی دووپاتبوونەوە بە شێوەی یەکێك لە رەسمە پەسندکراوەکان دەرهاتووە و لە لایەن خەڵکی گوندەکان و عەشیرەتەکان و هەروەها کەسانێك لە کۆمەڵگە شارنشینییەکان کە لە رابردووی دوور یان نزیکدا ئاخێزگەی گوندی یان عەشیرەتییان هەبووە، جێبەجێ دەکرێ.

**٢ـ پەیمانی کۆمەڵایەتی:** پەیمانی کۆمەڵایەتی داب و رەسمێکە کە بە هۆی دۆخێکی تایبەت لەلایەن بەشێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە دێتە کایەوە و پێکەوە عەهد و پەیمان دەبەستن کە لە کارێکی تایبەتدا بە شێوەی یەکگرتوو هەنگاو هەڵێننەوە. بۆ نموونە کاتێك کە وەرزێرانی گوندێك وەك دژکردەوە بە رەفتاری خاوەن مڵکەکەیان یەك دەگرن و بریار دەدەن تا خاوەن مڵکەکە مەرجەکانیان نەهێنێتەدی، کاری کشتوکاڵ نەکەن. ئەم شێوە رەفتارەی وەرزێران پەیمانی کۆمەڵایەتی پێدەگوترێ.

**٣ـ رێورەسمە کۆمەڵایەتییەکان:** وەك رێورەسمی پێشوازی کردن لە میوان لە جەژنە گەورەکاندا.

**٤ـ بۆنە کۆمەڵایەتییەکان:** ئەو دابونەریتە کۆمەڵایەتییە تایبەتانەی کە خاوەنی پێشینە و گرینگییەکی زۆرن، وەك جەژنی قوربان و جەژنە ئایینییەکانی دیکە، بە بۆنە کۆمەڵایەتییەکان ناسراون.

**٥ـ ڕێوشوێنەکۆمەڵایەتییەکان:** وەك ڕێوشوێنی نان خواردن، جلوبەرگ پۆشین کە بە مەبەستی دڵخۆشکردنی کەسانی دیکە ئەنجام دەدرێ. پۆشینی جل وبەرگی ڕەش لە کاتی ماتەمیندا یەکێك لە ڕێوشوێنە کۆمەڵایەتییەکانە.

**٦ـ شێوازە قەومییەکان:** نەریتێك کە لەنێو گرووپێکی تایبەت لە خەڵك کە خاوەنی کولتوور یان وردەکولتووری هاوبەشن، بوونی هەیە وەك زووهەستانی بەیانان لەلای وەرزێران یان نەریتی پۆتلاچ لەنێو خەڵکە خۆجێییەکانی لێوارەکانی ئۆقیانووسی ئارام کە بە پێی ئەو نەریتە هەندێك خەڵات لەنێوان دوو خێزان یان کلاندا ئاڵوگۆڕ دەکرێ. ئەم نەریتە لە هەندێك ناوچەی دیکە بە شێوازی هاوشێوە بوونیان هەیە. لە کۆمەڵگەی گوندنشینی و عەشیرەتیی ئێران، ئەو خەڵاتانەی کە لە کاتی بووکێنی دا دەدرێن، شتێکی لەم جۆرەیە.

**٧ـ یاسا کۆمەڵایەتییەکان:** یاساگەلێکن کە لەسەر بنەمای زانیاری و وشیاری پێشوو لە مەجلیسی یاسادانانەدا دادەنرێن و بۆ پێشێلکردنیشیان سزاگەلێك پێشبینی کراون.

**٨ـ ئەخلاقی کۆمەڵایەتی:** ئەو نەریتە کۆمەڵایەتییەی کە خاوەن گرینگییەکی زۆرە و کۆمەڵگە پێشێلکردنی بە ناشیرین و ناپەسند دەزانێ، ئەمە ئەخلاقی کۆمەڵایەتی پێدەگوترێ، وەك ڕێزگرتن لە پیاوە پیرەکان کە ئەمە ڕەسمێکی کۆمەڵایەتییە.

**٩ـ ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان:** یاساگەلێکی تایبەتن کە کۆمەڵگە بە زانیاری و هۆشیاری پێشووترەوە دایان دەنێت. ئەم یاسایانە گشتگیر نین و پەیوەندییان بە گرووپێکی تایبەتەوە هەیە، وەك یاساکانی هاتوچۆ.(١٠)

کۆمەڵێك لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەی دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی دەردێت وەك دامەزراوەی کۆمەڵایەتی خێزان، باوك و دایك چاوەڕوانیی ڕەفتارێکی تایبەتیان لە مناڵەکانیان هەیە. منالەکان ڕێز بۆ باوك و دایکیان دادەنێن و بە قسەیان دەکەن، هەروەها باوك و دایك خواردن و جلوبەرگ بۆ منالەکانیان دابین دەکەن و خۆشیان دەوێن. ژن و مێرد و خوشك و براکان دەرحەق بە یەکتر ڕەفتاری دیاریکراویان هەیە، بەم پێیە لە خێزاندا، سیستەمێك لە نۆرمەکان دێتە ئاراوە کە بە شێوەی دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی دەردێنێ. خێزان خاوەنی دوو جۆرە نۆرمە. هەندێك لە نۆرمەکان تایبەتین و هەندێکی دیکەیان گشتی ترن. هەر ژن و پیاوێك

لەوانەیە بۆ خۆی لە خێزاندا نۆرمێکی تایبەتی هەبێ. بۆ نموونە کاتێك ژن و مێردی لوڕ لەگەڵ یەکتر بە شەقامدا دەڕۆن ژن دەبێ هەنگاوێك لەدوای پیاوەکەی بێ. لـە کۆمەڵگەیـەکی دیکـە لەوانەیە دۆخەکە بە پێچەوانە بێ. ژن لەوانەیە خواردنی بەیانی بۆ مێردەکـەی حـازر بکـات و یان ئەوەکە پیاو زووتر لە خەو هەستێ و سـەماوەرەکە داگیرسـێنێ و نـانی بـەیانیش ئامـادە بکات. ئەمانە نۆرمە تایبەتییەکانن بەڵام وەفاداربوونی ژن بۆ پیاوەکەی نۆرمێکی گشتییە.

## پ ـ کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی

کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بریتییە لەو ئامرازانەی کە کاریگـەریی لەسـەر ڕەفتـاری تاکـەکان دادەنێن و ئەوان ناچار بە پەیڕەوی لە نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکان دەکەن. لەحاڵەتێکـدا کـە تاکێك سەرپێچی لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بکات و کار و کردەوەی پێچەوانەی بەها و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بێ، لە لایەن گرووپ یان کۆمەڵگەوە سەرکۆنە دەکرێ و سزا دەدرێ. زاراوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە زمانی ئینگلیزیدا بە واتای دەسەڵات، توانایی، زاڵبوون و باڵادەستیی هاتووە. ئەم زاراوەیە لە زمانی فەرەنسی لەگەڵ چـەمکی ئیجبار(ناچـارکردن)ی کۆمەڵایـەتی یەك دێتەوە و ئەمە هـەر ئـەو واتایەیـە کـە ئۆگسـت کۆنـت لـەژێر ناونیشـانی "دەسـەڵاتی مەعنەوی" (Pouvoir Sprituel) بەکاری هێناوە.

لە ڕوانگەی ئۆگست کۆنتەوە تایبەتمەندیی سەرەکی ( دەسـەڵاتی مەعنـەوی) ئەوەیـە کـە ڕێنوێنیی بەرزی فێرکردن و بارهێنانی تایبەتی و گشتیی بە ئەستۆوەیە. دەسەڵاتی مەعنـەوی بریتییـە لـە سـەرجەم ئـەو بـیروڕا و عادەتانـەی کـە تاکـەکان بـۆ قبـووڵکردنی سیسـتمی کۆمەڵگەیەك کە تێیدا دەژین و ئەرکێك کە ئەنجامی دەدەن، ئامـادە دەکـات. نـاوبراو دەڵـێ پەروەردە و فێرکردن تەنیا تایبەت بە بەرەی لاو نییە، بەڵکوو وەچـەی پێگەیشـتوو و بـاڵغیش لەخۆ دەگرێ. بەم پێیە، گشت ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە. ئامانجی ئەو ئەرکانە ئەوەیە کە ئەو بنەمایانەی کە کاریگەرییان لەسەر تاکەکان هەیە، واتە بەهاکان، نۆرمـەکان و داب و ڕەسمەکان و ... بەوان نیشان بدات و بە کەڵك وەرگرتن لە ئاستی بـەرزی کاریگـەریی ئـامرازە ئەخلاقییەکان هەر کات کە تاکەکان لەم بنەمایانە دوور دەکەونەوە وەبیریان دێننەوە و ئەوان بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانە هان بدات. (١١)

لە ڕاستیدا کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بە پێی پێویستییەکە کە لەلایـەن کۆمەڵگـەوە دێتـە کایەوە و تاکـەکان بـە مەبەسـتی پاراسـتنی ڕێکـوپێکیی کۆمەڵگـە بـە قبـووڵکردنی بـەها

کۆمەڵایەتییەکان و لەبەرچاوگرتنی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان ناچار دەکات و لە بەڕێوەبردنی ئەم کاروبارانە، کۆمەڵگە سیستەمی خەڵات و سزای تایبەتی هەیە. بەم شێوەیە ئەو کەسانەی کە بە پێچەوانەی بەها و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان هەڵسوکەوت دەکەن، سەرکۆنە دەکرێن و سزا دەدەرێن و ئەوانەیکە ڕەفتارێکی گونجاو لەگەڵ نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەیان هەیە هان دەدرێن و خەڵات و پاداشت وەردەگرن.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی دەیەم

١ـ لغت نامه دهخدا، واژه ارزش

٢ـ اگ برن و نیمکوف، زمینه جامعه‌شناسی، ترجمه ا.ح. آریان پور، دانشگاه تهران ١٣٤٢، ص ١٤٣.

٣ـ پرویز صانعی، جامعه‌شناسی ارزشها، ١٣٤٧، ص٤١.

٤ـ ژان کازنو، مردم شناسی، جلد اول، ترجمه ثریا شیبانی، موسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی دانشگاه تهران، ١٣٤٩، ص.١٨٨

٥ـ هانری مندراس، مبانی جامعه‌شناسی، باقر پرهام، امیرکبیر، ١٣٤٩، ص.١٦٢

٦ـ پرویز صانعی، جامعه‌شناسی ارزشها، ١٣٤٧، ص.٣٩

٧ـ حشمن اللّه بیبی، متن سخنرانی، سمینار جامعه‌شناسی، دفتر شماره ٣٠، ص.٣٠

٨ـ علی اکبر نیك خلق، مقدمه‌ای بر جامعه‌شناسی روستائی ایران، پژوهشکده علوم ارتباطي و توسعه ایران، ١٣٥٨، ص.١٧١

٩ـ مقدمه‌ای بر جامعه‌شناسی روستایی ایران، سال ١٣٥٨، ص.١٧٥

١٠ـ با بهره‌گیری از آگ برن و نیمکوف، زمینه جامعه‌شناسی، اقتباس ا.ح.آریان پور، ١٣٤٤، ص ١٢٥.

١١ـ هانری مندراس، مبانی جامعه‌شناسی، ترجمه باقر پرهام ١٣٤٦، ص ١٦٤.

# بەشی یازدەیەم

## ڕۆڵ و پێگەی کۆمەڵایەتی

پێش باسکردن و نووسین لەسەر توێژبەندیی کۆمەڵایەتی و تیۆرییە پەیوەندیدارەکانی، ئەو چەمك و بابەتانەی پەیوەندییان بە توێژبەندییەوە هەیە و لەڕاستیدا وەك بنەما و بناغەی ئەو باسە لەقەڵەم دەدرێن، تاوتوێ دەکەین. ئەم بابەتانە بریتین لە: ڕۆڵی کۆمەڵایەتی، پێگەی کۆمەڵایەتی، بزاوتی کۆمەڵایەتی و جۆرەکانی کە لێرەدا یەك بە یەك لەسەریان دەدوێین.

## ڕۆڵی کۆمەڵایەتی

مەبەست لە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی (Social Role) یەکێك لەو چالاکییانەیە کە تاك لە کۆمەڵگەدا لە ئەستۆیەتی. چونکە ئەو ڕۆڵەی کە تاکەکەس لە ئەستۆی گرتووە، هەندێك چاوەڕوانی لە کەسانی دیکەدا پێك دێنێ، بەم پێیە دەتوانرێ بگوترێ: ڕۆڵ، بە واتای ئەو چاوڕوانییانەیە کە کەسی خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی دەبێ بیانهێنێتەدی. تاك لە کۆمەڵگەدا سەر بە گرووپە جۆراوجۆرەکانە و لە هەر گرووپێکدا بە پێی ئەو شوێنگە و پێگەی کە هەیەتی، ڕۆڵێکی تایبەت ڕادەپەڕێنێ. بۆ وێنە کەسێك لەوانەیە وەك باوك ئەندامی گرووپێکی خێزانی بێ کە ئەرك و ڕۆڵی باوکایەتی لەئەستۆیە. مامۆستا بێ و لە قوتابخانە ئەرکی مامۆستایەتی ڕاپەڕێنێ، کە ئامادەبوون لە ژووری خوێندن و وانەوتنەوەیە. لە گەڕەکی خۆی لەوانەیە ئەندامی ئەنجوومەنی گەڕەك بێ و ... لە هەرکام لەو گرووپانەدا ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە.

لە هەر کۆمەڵگەیەکدا لەسەر بنەمای هەندێك پێوەر و پێوانە، ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان لە نێو تاکەکاندا دابەش دەکرێن. کۆنترین پێوەرەکانی جیاکردنەوەی ڕۆڵ لەنێو ئەندامەکانی کۆمەڵگە، دابەشکردنی ڕۆڵ لەسەر بنەمای تەمەن و ڕەگەز و بارودۆخی کۆمەڵایەتی تاکەکەسە. منالان، لاوان، بەساڵاچووان هەر یەك لە دوو گرووپی ڕەگەزی پیاو و ژن ئەرکی دیاریکراویان هەیە و کەمتر دەست لە کاروباری یەکتر وەردەدەن. هەرچەند لە جیهانی ئەمڕۆدا هەندێك تێکەڵاویی لە ڕۆڵی کەسەکاندا هاتۆتە ئاراوە، بەڵام بە شێوەیەکی ڕێژەیی دەتوانین بڵێین کە پێوەری باسکراو تا ڕادەیەك گرینگیی هەیە بەڵام گرینگتر لەویش دابەشکردنی ڕۆڵەکان لەسەر بنەمای بارودۆخی کۆمەڵایەتی و چینایەتییە.

## جۆرەکانی ڕۆڵ

بە شێوەیەکی گشتی ڕۆڵەکان بە دوو دەستەدا دابەش دەبن: ڕۆڵی پێسپێردراو و ڕۆڵی.

### ١- ڕۆڵی پێسپێردراو

ڕۆڵی پێسپێردراو ڕۆڵێکە کە لە لایەن کۆمەڵگەوە بە تاك دەسپێردرێ. بە دەستەواژەیەکی دیکە ڕۆڵی دیاریکراو یان پێسپێردراو ڕۆڵێکە کە لەسەر بنەمای نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگەیەك بە تاکێك دەسپێردرێ و تاکەکانی دیکە چاوەڕوانی بەڕێوەبردنی ئەو ڕۆڵەی لێ دەکەن. بۆ نموونە ڕۆڵی مامۆستایەك کە وانەوتنەوەیە و لەسەر بنەمای یاساگەلێکی تایبەتی ئەنجام دەدرێ.

### ١- ڕۆڵی وەرگیراو

ڕۆڵێك کە کۆمەڵگە بە تاکی دەسپێرێ و دەیخاتە سەر شانی ئەو، وەك خۆی نامێنێتەوە بەڵکوو هەر تاکێك بە پێی حەز و ڕوانگەی خۆیەوە دەسکاری تێدا دەکات و بە پێی ویست و خواستی خۆی گۆڕانکاریی تێدا پێك دێنێ و بەڕێوەی دەبات. وەها ڕۆڵێك، ڕۆڵی "وەرگیراو"ی پێدەگوترێ. بێجگە لەو ڕۆڵە باسکراوانە، باس لە ڕۆڵە بۆماوەیی و وەدەسهاتووەکانیش کراوە، مەبەست لە ڕۆڵی بۆماوەیی لەڕاستیدا ڕۆڵێکە کە بە شێوەی سروشتی یان لە لایەن کەسانی دیکەوە بۆ تاك دیاری دەکرێ و گۆڕین و گۆڕانکاری تێیدا بە تایبەت لە کۆمەڵگە نەریتی و

وەرزێرییەکاندا زۆر دژوارە و لە هەندێك بابەتدا وەك ڕۆڵی کۆمەڵایەتی تاکەکان لە سیستەمی کاستیدا دەرفەتی گۆڕانی تێدا نییە.

ڕۆڵی وەرگیراو و ڕۆڵی دەستکەوتوو کە لە هەندیك لە بەرهەکانی نووسەراندا بە هەڵە وەك چەمکێك باسیان لێدەکرێ، ئەو ڕۆڵانەن کە تاك لە وەدیهاتن و پێکهاتنیاندا ڕاستەوخۆ دەستێوەردان دەکات بەم مانایە کە ڕۆڵی دەسکەوتوو ڕۆڵێکە کە تاك لە بەرامبەر ڕۆڵێکدا کە بەسەریدا دەبڕن یان پێی دەسپێرن، بۆ خۆی دروست دەکات. بۆ نموونە چاوەڕوانییەك کە لە کۆمەڵگەی نەریتیدا لە کوڕە وەرزێرێکیان هەیە ئەوەیە کە بە شێوازی باو و باپیرانی پیشەی باوك واتە وەرزێرییەکە درێژە پێبدا، جا ئەگەر کوڕە وەرزێرەکە شێوە و شێوازی باب و باپیرانی وەلا بنێ و لە جێگەی درێژەدانی پیشەی باوکی ڕوو لە شار بکات و کارێکی دیکە جیاوازلە کاری وەرزێری ئەنجام بدا، ئەم ڕۆڵە نوێیە "ڕۆڵی دەسکەوتوو"ی پێدەگوترێ. واتە ڕۆڵێك کە کوڕە وەرزێرەکە بە پشت بەستن بە توانایی و هەوڵی خۆی بەدەستی هێناوە.

بەڵام ڕۆڵی وەرگیراو، ڕۆڵێکی ئاساییە کە ڕۆڵگێڕی کۆمەڵایەتی بە پێی زەوق و حەز و داهێنانی خۆی گۆڕانی بەسەردا دێنێ و بە شێوەیەك کە خۆی حەزی لێدەکا، ئەنجامی دەدات و هەر بەم هۆیەشەوە ڕۆڵی پراکتیکی تاکیشی پێگوتراوە واتە ڕۆڵێك کە تاك بە کردەوە بەڕێوەی دەبات. بۆ نموونە ڕۆڵی وەرگیراوی مامۆستایەك شێوازێکە کە لە وانەوتنەوەدا بەکاری دێنێ و جۆری هەڵسوکەوتێکە کە لەگەڵ خوێندکاران هەیەتی. مامۆستا لەوانەیە لە هەمان کاتدا کە لە چوارچێوەی یاساکاندا کارەکەی دەباتە پێشەوە، بۆ بردنەسەری ئاستی زانیاری و زانستی خوێندکارانێك کە لە فێربوونی هەندێك لە بابەتەکاندا گرفتیان هەیە، دەتوانێ بێجگە لە خوێندنگە لە ماڵی خوێندکارەکانیش هاوکارییان بکات و کێشەکانی خوێندکارەکە لەگەڵ دایك و باوکیان باس بکا و شێواز و ڕێگەچارەی تایبەت بۆ قەرەبووکردنەوەی دواکەوتوویی خوێندکاران بخاتەڕوو یان خۆی لە کاتی موحازرەکاندا شێوازێك بگرێتەبەر کە ئاستی خوێندکارە دواکەوتووەکان بگەیەنێتە ئاستی خوێندکارە زیرەك یان مامناوەندییەکان ... بەم پێیە هەرکەس دەتوانێ ڕۆڵی پێسپێردراو خۆی بە شێوەیەك کە خۆی حەزی لێیە، و بە پشت بەستن بە داهێنان و حەزی خۆی بکاتە ڕۆڵی وەرگیراو.

## فرەیی و دژیەکی ڕۆڵەکان

کۆمەڵگە لە گرووپگەلی جیاواز پێك دێت و هەر تاکێك لەوانەیە کە سەر بە چەند گرووپێکی کۆمەڵایەتی بێ و چالاکییان تێدا بکات و لە ئاکامدا ڕۆڵی جۆراوجۆری بەئەستۆوە بن. لە هەندێك لە کۆمەڵگەکاندا ژمارەی ئەم ڕۆڵانە کەم و لە هەندێکیاندا زۆرە. لە کۆمەڵگە نەریتییەکانی پشت ئەستوور بە ئابووریی کشتووکاڵ، تاکەکان رۆڵی کەمیان لەسەر شانە. لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا، بە هۆی ئەندامێتی تاکەکان لە گرووپە کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و کولتوورییە جیاوازەکان، هەر یەك لە تاکەکان ڕۆڵی زۆر و جۆراوجۆریان بەئەستۆوەیە. هەرچەند کۆمەڵگەکان خاوەن پێکهاتەیەکی ئاڵۆزتر بن، هەمەچەشنی ڕۆڵەکان زیاترە. بەرهەمی فرەیی ڕۆڵەکان، دیاردەیەکە کە دژایەتی، ناکۆکی، پێکدادان یان دژبەیەکی ڕۆڵەکانی پێدەگوترێ. دژبەیەکی ڕۆڵەکان بەم واتایەیە کە لە ئاکامی فرەیی ڕۆڵەکان لەنێوان هەندێك لە ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکانی تاك و ڕۆڵەکانی دیکەیدا دژایەتی دروست دەبێ، هەندێك لە ڕۆڵەکان لەگەڵ ڕۆڵەکانی دیکەدا ناگونجێن و لە هەندێك بابەتیشدا لەوانەیە ڕۆڵێك کاریگەری لەسەر تەواوی ڕۆڵەکانی تری تاك دابنێ. بۆ وێنە کەسێك لەوانەیە بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەیەك بێ، لە حیزبێکدا چالاکی هەبێ و بیهەوێ لە بواری پیشەیی و سیاسیدا چالاکییەکی بەربلاو ئەنجام بدات و ناووناوبانگ وەدەست بێنێ. ئەو کەسە ناچارە ڕۆڵی باوکایەتی و خێزانیی خۆی بەرتەسك بکاتەوە و ئەرکی خۆی لەم بوارانەدا بە چەشنێکی باش بەڕێوە نەبات. لە ئاکامدا لەنێوان ڕۆڵی سیاسی و پیشەیی ئەو و ڕۆڵی باوکایەتی و خێزانی و هاوسەرێتیدا نەگونجان و دژبەیەکی دروست دەبێ. زۆرن ئەو کەسانەی کە ڕۆڵی خێزانی و باوکایەتییان، لە بەرژەوەندی ڕۆڵی سیاسی و پیشەییان لەناو چووە. دژبەیەکی ڕۆڵەکان زیاتر لە کۆمەڵە گەورەکانی شارنشینیدا کە پیشەکان زۆر و فرەچەشنن، دیتە ئاراوە.

لە کۆمەڵگە نەریتی و گوندنشینییەکاندا لە جێگەی دژبەیەکی ڕۆڵەکان، دیاردەی تێکەڵبوونی ڕۆڵەکان باڵادەستە. بەم واتایە کە لەم جۆرە کۆمەڵانەدا، ئەگەر لە هەندێك بابەتی دیاریکراویشدا کەسانێك خاوەنی پیشەی جۆراوجۆر بن، بەهۆی سنووردداربوونی کەشی گوند و پەیوەندیی چەند لایەنە و بەردەوامی تاکەکان لەگەڵ یەکتر، دژبەیەکییەك لەناو ڕۆڵەکانیاندا دروست نابێت. هێنری مێندراس کۆمەڵناسی فەڕەنسی بابەتی تێکەڵبوونی ڕۆڵەکان لەکۆمەڵگەی گوندنشینیدا بەم شێوەیە شی دەکاتەوە:

" کۆمەڵگەی گوندنشینی لەسەر بنەمای تێکەڵبوونی ڕۆڵەکان دامەزراوە. چونکە ئەم کۆمەڵگەیە گرووپێکە کە تێیدا "ناسیاریی دوولایەنە" هەیە بەو واتایە کە تێیدا هەرکەس تێگەیشتنێکی گشتی و غەیرە وەزیفی لە کەسایەتی و تایبەتمەندییەکانی ئەویتر هەیە. بە کەمێك جیاوازییەوە، هەر ئەو کەسانەی کە لە ئەنجومەنی گشتی گونددا ئەندامن، ئەنجومەنی سەندیکاش بەڕێوە دەبەن و لەکۆبوونەوەکانی کۆمپانیا هەرەوەزییەکانیشدا بەشدار دەبن ...

لە گونددا خەڵك دراوسێ یان خزمی یەکترن. هەموویان پێکەوە لە ژینگەیەکی پڕ لە خۆشەویستی و ڕێزی هەمیشەییدا ژیان بەسەر دەبەن کە لەسەر بنەمای نزیکایەتی شوێن و خزمایەتی و لێك نزیکیی ئابووری و پیشە سیاسی و ئەرکە ئایینییەکان، پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوانیاندا دادەمەزرێ.

تێکەڵبوونی ڕۆڵەکان بە تایبەت کاتێك کە یەکەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و خێزانی وەرزێر تێکەڵی یەکتر دەبن، دوو ئەوەندەی لێ دێت، چونکە لە وەها دۆخێکدا وەرزێر، نە تەنیا لە بڕیارەکانیدا دەبێ گرینگی بە فاکتەرە ئابوورییەکان بدات، بەڵکوو دەبێ بە هەمان ڕێژە فاکتەرە خێزانییەکانیش لەبەرچاو بگرێ. باوکی بنەماڵە کە سەرۆکی یەکەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵییە لە هەمان کاتدا بۆ مناڵەکانی ئەرکی وەستاکارێکیش بەڕێوە دەبات. دایك لە بنەماڵەدا زیاتر ئەرکی ژمێریاری نووسینگەیەکی بەئەستۆوەیە. بە کورتی ئەوەکە لە کاری وەرزێریدا جیاوازییەکی هەست پێکراو لەنێوان کاری سەرەکی و کارە پەرت و بڵاوەکانی ماڵ و کاتەکانی بێکاریدا نییە. کرێکارێك کە دوای تەواوبوون لە کاری ڕۆژانە لە کارگە، لە حەوشەی ماڵەکەیدا خەریکی سەوزە کردنە، یان بۆ سەرقاڵبوون شتێك دروست دەکا، لەڕاستیدا خەریکی "کات بەسەربردنی چالاك"ـە و ناتوانرێ لەگەڵ وەرزێرێك کە دوای تەواوبوون لە کاری ڕۆژانە سەوەتەیەك دروست دەکا یان ڕۆژنامەی سەندیکاکەی دەخوێنێتەوە، بەراورد بکرێ".(١)

لە کۆمەڵگەی گوندنشینیی ئێرانیشدا لە هەندێك بابەتی دەگمەن کە فرەیی ڕۆڵەکان لە بابەت تاکێکی دیاریکراوەوە بەرچاو دەکەوێ، دژیەکییەك لەنێوان ڕۆڵەکانیدا نایەتە کایەوە. بۆ نموونە جاری وایە کەسێك کە سەرۆکی ئەنجومەنی گوندە، لە هەمان کاتدا سەرۆکی خێزانێکە و لە مەزرای خۆیدا هەم کرێکارە و هەم بەڕێوەبەر. بێجگە لەوانەش ئەرك و بەرپرسایەتی دیکەشی لە پەیوەندیی لەگەڵ کۆمپانیا هەرەوەزییەکان و فەرمانگەحکومییەکان لەسەر شانە و

له پەنا ئەوانەشدا ئـەرکی باوکایـەتی و هاوسـەرێتی و بنەماڵـەییش ڕادەپـەڕێنێ و لـەوانیش بێئاگا نییە.

## دژیەکی ڕۆڵەکان لەناو خێزاندا

یەکێك لە بابەتە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسیی پەروەردەیی، دژیەکی ڕۆڵەکان لەناو خێزان و تاکەکانی دایە. چونکە ئەم دیاردەیە لەوانەیە لەنێوان ئەندامـەکانی بنەماڵـەدا کـە هەمیشـە پێکەوە پەیوەندیی و کارلێکی دوولایەنەیان هەیە، سەر هەڵبدات و لە ئـەرکی پـەروەردەکردنی منداڵەکاندا گیروگرفت بێتە ئاراوە و تەندرووستیان تووشی مەترسی بکاتەوە. بۆ نموونـە ئەگـەر منداڵێك یەکەم منداڵی بنەماڵە بێ، بە پێی ئەوەکە کوڕ یان کچە، دەبێ ڕۆڵی کوڕ یان کچ بوون فێر ببێ. کاتێك منداڵێك دێتە دونیاوە، ئەم منداڵە بێجگە لە ڕۆڵی کوڕ یان کچ بوون دەبێ ڕۆڵی خوشك یان برا بوونیش فێر بێ و بە ئەستۆوە بگرێ. زۆرجار بـۆ منـداڵی یەکـەم، بـەڕێوەبردنی ڕۆڵێك کە بە لەدایکبوونی منداڵی دووهەم ( خوشك یـان بـرا ) بـە ئـەو دەسـپێردرێ، کـەمێك دژوارترە. لێرەدا شێوازی باوك و دایك لە فۆرم پێدان بە پەرچەکرداری داهاتووی منداڵی یەکەم، دەرحەق بە منداڵی تازەهاتوو و گرووپێکی تر کە تێیـدا ئەندامـە، گرینگییـەکی زۆری هەیـە. منداڵ کە تا ئێستا تاقانەی ناو بنەماڵە بووە لەوانەیە خەیاڵ بکات کە ئەو خۆشەویستییەی کە کەسانی دیکە بۆ ئەو هەیانە، لەدەستی بدات.

منداڵی یەکەم دەبینێ یان وای بۆ دەچێ کە ڕەفتاری دایك و باوك دەرحەق بـە منداڵـە تـازە بـەدونیا هاتووەکـە، هـەروەك ئـەو ڕەفتارەیـە کـە لەگـەڵ ئـەو هـەیانبووە و لێـرەدا بابـەتی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە دایك و باوکیش دەبێ پێداچوونەوە بە ڕۆڵی پێشووی خۆیانـدا بکـەن و ڕۆڵێکی نوێ کە دایك و باوکی دوو منداڵن، فێر بن. بە پێچەوانەی ئەمە لەوانەیە ناسازگاری لە ڕۆڵەکانی منداڵی یەکەمدا بێتە پێش و ئـەم مەسـەلەیە تەندرووسـتیی دەروونـی ئـەو تووشـی مەترسی بکاتەوە یان ببێتە هۆی ئەوەکە گیروگرفت بۆ منداڵی دووهەم دروست بکات و زەربـەی لێ بدات. زۆرجار ئەم دژیەکیانە کاتێك دێنە کایەوە کە دایـك و بـاوك ڕۆڵـی نـوێی خۆیـان و ڕۆڵێك کە دەبێ فێری منداڵەکەیانی بکەن، لەبیر بکەن. لەم حاڵەتەدا منداڵ کە دەبێ لە هـەمان کاتدا چەند ڕۆڵێك فێر ببێ، تووشی دژبەیەکی دەبێ و ڕەفتارێکی ناتەواو و ناتەندروسـتی لـێ سەرهەڵدەدا کە لەژێر کاریگەریی ڕەفتاری دایك و باوکی دایە.

ئاندره لیشتێن بێرژێر (Andreh Lichten Berger) نووسەری فەڕەنسی کە لـە بـواری کۆمەڵناسی و پەروەردە و بارهێناندا توانایییەکی سەرنجڕاکێشی هەیە، لـە چـیرۆکێکی جوانـدا دیاردەی دژیەکی ڕۆڵەکانی لە خێزاندا، بە شێوەیەکی جوان باس کردووە: " تروت Trotteپێی وایە دوای ئەوەی کە خوشکە بچووکەکەی واتە لوست Lucette هاتە دونیـا، دایـك و بـاوکی جێگەیەکیان بۆ ئەو نەهێشتەوە. ئـەمڕۆ کاتێـك بـۆ مـاڵ گەڕایـەوە دایکـی بـە شـێوەیەکی لامسەرلایی ماچی کردووە و گرینگیی زیاتر بـە لوسـت دەدا. باوکیشـی بایـەخێکی ئـەوتۆی پێنادات. خەیاڵ دەکا کە ئیتر خۆشیان ناوێ. تروت لە گۆشەیەکدا دەست بە ئەژنۆ دادەنیشێ و لە خەیاڵی خۆیدا نوقم دەبێ. خەمێکی قـورس دڵ و دەروونـی دادەگـرێ. ئێسـتا ئـیتر تـەواو دڵنیایە کە ئەویان خۆش ناوێ. جاران کاتێك کە هاروهاجی دەکرد تـەنیا کـەمێك سـەرکۆنە و تەمبێیان دەکرد و دواتر هەموو شتێك تەواو دەبوو و بە توندی لە ئامێزیان دەگرت. هەربۆیـە ئەو پێی باشتر بوو کە بزۆزی بکا بۆ ئەوەی سەرکۆنەی بکەن. بەڵام ئێستا ئـیتر زۆر بـە باشـی تەمبێی دەکەن و دواییش لە ئامێزی ناگرن و نایلاوێننەوە. دەبێ چ بکرێ؟ جـاران ئـەویان زۆر زۆر خۆش دەویست. وەبیری دێتەوە کە کاتێك نەخۆش کەوتبوو، زیاتر لە لایان خۆشەویست بوو و بە شێوازی جۆراوجۆر نازیان دەکێشا و دەیانلاواندەوە. خۆزگە ئێستاش نەخۆش بوایە. دایـك و باوك بە ئارامی خەریکی قسەکردن لەگەڵ یەکتر بوون. تروت کەمێك بـیری کـردەوە و دواتـر باوێشکی دا و چوو بۆ سەر کورسییەکەی. زەختێکی زۆری خستە سەر دەسـکی کورسـییەکە. کورسییەکە دەستی بە چرپەچرپ کرد و تروت کەوتە سەر زەوی. باوکی بە خێرایی بۆ لای چوو و لە ئامێزی گرت. دایکیشی هەر بە پەلە ڕای کرد و لەدەستی باوکی دەرهێنا و لەسەر کۆشی خۆی درێژی کرد و دەستی بە سەر و ناوچەوانی داهێنا. تروت لە ژان و لـە خۆشـییان دەگریـا. دایکی نازی دەکێشا. تروت گنجێکی گەورەی لەسەر ناوچاوانە. لە حاڵێکدا کە هۆڕهۆڕ دەگریا و دەڵێ: ئەمن بە ئانقەست ئەم کارەم کرد. دایك و باوکی بە سەرسوڕماوییەوە سەیری یەکتریان دەکرد. ئەو بیری دەکردەوە کە ئـیتر گـەورە بـووە و خوشـکە تـازە لەدایکبووەکـەی جێگـەی گرتۆتەوە. بەڵام دەبینێ کە ئێستاکەش خۆشییان دەوێ. دایکی دەستەکانی لە گـەردنی تـروت هاڵاندووە و فرمێسکی چاوەکانی دەسڕێتەوە. باوکی دەستەکانی دەگوشـێ و قسـەی شـیرین و خۆشی بۆ دەکا. دوایی لە ئامێزی دەگرێ و کۆڵمەکانی ماچ دەکات و لەحاڵێکدا کـە چـاو لـە چاوانی دەبڕێ، دەڵێ: تروت گیان ئێستا ئارام بوویتەوە؟ تروت بە بزەیەك وەڵام دەداتەوە: بەڵێ بەڵام دووبارە پێم خۆشە گنجی دیکە لەسەر لایەکەی تری ناوچاوانم هەبوایە."(٢)

ئەو ڕۆڵانەی کە منـاڵان بەرەبـەرە فێریـان دەبـن، پەیوەنـدیی لەگـەڵ پێگـەی بنەماڵـە و تایبەتمەندییەکانی لە کۆمەڵگەدا هەیە. مناڵێك کە لەناو خێزانێکی موسوڵماندا لەدایك دەبێ و گەورە دەبێ، دایك و باوکی، ئەو ڕۆڵانەی کە پەیوەندییان بە تـاکێکی موسـوڵمانەوە هەیـە، فێری دەکەن. وەك نوێژکردن، ڕۆژووگرتن و ڕەفتاری گونجاو لەگەڵ نـۆرمی کۆمەڵگـە، دایـك و باوك و سەرەنجام کولتووری کۆمەڵگەی ئیسلامی. هەنـدێك لـە ڕۆڵـە خێزانییـەکان لەوانەیـە دەروەستی زیاتری بۆ تاك بەدواوە بێ. وەك ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکانی کچـێك کـە لەوانەیـە وەك کەسێك کە لە کارەکانی ماڵەوەدا هاوکاریی دایکی دەکا، ئاگای لە برا یان خوشـکی بچـووکتر لەخۆیەتی، لە هەمان کاتدا دەچێتە قوتابخانە، نووسین و خوێندنەوە فێر دەبێ و ئاگـاداری ئـەو شتانە دەبێ کە لە کۆمەڵگەکەیدا دێنە پێش. ئەگەر ڕۆڵی کچ لە بنەماڵـەدا بایـەخی هـەبێ، لەوانەیە کە کچەکە ڕۆڵەکانی دەرەوەی ماڵ وەلابنێ و هەر لەناو خێزاندا کار بکا. ئەگەر ڕۆڵی کوڕ ئەوە بـێ کـە لـە ماڵـدا هاوکـاریی بـاوکی بکـا، و داوای لـێ بکـەن کـە لـە کاروبـارە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوەی ماڵیش چالاکی بنوێنێ، ئەو کاری ماڵەوە جێ دێڵێ و لە دەرەوەی ماڵ کار دەکا و ئەمە لە کاتێکدا کە کارە کۆمەڵایەتییەکەی گرینگتر بێ.

ئەو ڕۆڵانەی کە مناڵەکان لەناو خێزاندا فێریان دەبن، فرەچەشن و جۆراوجـۆرن و پێ‌بـەپێی گەشەی مناڵ پەرە دەستێنن و زیاتر دەبن و لایەنی جۆراوجۆر بەخۆوە هەڵدەگرن. لـە ئاکامـدا مناڵ دەبێ هاوتـەریب لەگـەڵ گەشـەکردن، نـەرمی بنوێنـێ و خـۆی لەگـەڵ بـارودۆخی نـوێ بگونجێنێ. مناڵ لەژێر گوشاری باڵغ بوونی لاویدا زۆر هەستیارتر دەبێ و لەم قۆناغـەدا لەوانەیە گونجان لەگەڵ ژینگە تووشی هەندێك گیروگرفتی بکاتەوە.

لەم قۆناخەدا ڕۆڵی خێزان لە پەروەردە و پێگەیاندنیدا زۆر گرینگە و ئەمـە خێزانـە کـە دەتوانێ تواناییەکانی بگەشێنێتەوە و وەك تاکێکی تەندروسـت و بـەتوانا و بەسـوود و چـالاك پەروەردەی بکات.

## پێگەی کۆمەڵایەتی

پێگەی کۆمەڵایەتی (Social Status) بەها و بایەخێکە کە گرووپێك بۆ ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی لەبەرچاوی دەگرێ.(٣) بە دەستەواژەیەکی دیکە کاتێك کە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی تاکێك لە کۆمەڵگە یان گرووپدا لەگەڵ ڕۆڵەکانی دیکە بەراورد دەکرێت و پلەی گرینگیی و بایەخی ئەو ڕۆڵە لەو بەراوردکردنەدا دەردەکەوێ، ئەو ڕۆڵە هەڵدەسەنگێنرێ و بە پێی گرینگی و ئیعتیبارەکەی، پێگە و شوێنگەکەی دیاری دەکرێ. لەبەر ئەوەی کە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی تاکەکان لە کۆمەڵگەدا جیاوازە، بۆ نموونە ڕۆڵی شۆفێرێك، بەڕێوەبەرێك، مامۆستایەك، وەرزێرێك، پزیشکێك و ... لێك جیاوازە، پێگەی کۆمەڵایەتیشیان جیاوازی هەیە. هەر ڕۆڵێك، پێگەی کۆمەڵایەتی دیاریکراو و گونجاو لەگەڵ ئەو ڕۆڵەی هەیە. چونکە هەر تاکێك لە کۆمەڵگەدا ڕۆڵی جۆراوجۆر بە ئەستۆوە دەگرێ، کەوایە پێگەی جۆراوجۆری هەیە و ئەگەر ڕۆڵەکان هەموویان وەك یەك و هاوچەشن بن، پێگەکەش هاوفۆڕم دەبێ. پێگەی کۆمەڵایەتی تاکەکان بە پێی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان بەسەر دوو جۆردا دابەش دەبن:

### ١. پێگەی پێسپێردراو

پێگەیەکە کە کۆمەڵگە بۆ ڕۆڵێکی دیاریکراوی لەبەرچاو دەگرێ، هەندێك لە پێگە کۆمەڵایەتییەکان لە کاتی لەدایکبوونەوە بۆ تاك دیاری دەکرێن بۆ نموونە پێگەی کوڕە وەرزێرێك پێگەیەکی یۆماوەیی یە کە کۆمەڵگە پێی دەسپێرێ.

### ٢. پێگەی دەستکەوتوو (وەدەسهاتوو)

هەر تاکێك لەوانەیە بە پێچەوانەی ڕۆڵێك کە کۆمەڵگە پێی سپاردووە، ڕۆڵێکی دیکە بۆخۆی دیاری بکا و لە ئاکامدا پێگەیەکی دیکە وەدەست دێنێ کە جیاوازی لەگەڵ پێگەکەی پێشووی هەیە و پێگەی دەستکەوتووی پێدەگوترێ. بۆ نموونە لەوانەیە کوڕە وەرزێرەکە بەپێچەوانەی ڕۆڵێك کە کۆمەڵگە بۆی دیاری کردووە، لە ڕێگەی خوێندن بە هۆی توانایی و لێهاتوویی و چوونەسەری تەمەن و بەرزبوونەوەی پلەی خوێندن، پیشەیەك جیا لە پیشەی

وەرزێری ( پیشەی باوکی) وەك پزیشکی، ئەندازیاری، کاری تکنیکی و ... بەدەست بێنێ کە لە ئاکامدا بە پێی ڕۆڵێك کە دەیگێڕێ، پێگەی کۆمەڵایەتیشی دەگۆڕێ و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دیکە کە گونجاو بێ لەگەڵ ڕۆڵە نوێیەکەی، وەدەست بێنێ. ئەمە پێگەی دەستکەوتووی ناوبراوە. بە وتەی هێنری مێندراس پێگەی کۆمەڵایەتی و پیشەیی تاك چەند تایبەتمەندییەکی هەیە کە گرینگترینیان بریتین لە:پلەوپایە، سەرنج ڕاکێشی، ڕادەی ئازادی و حەقدەست.

لەسەر بنەمای ئەم چوار گۆڕاوە دەتوانرێ شوێنگە جۆراوجۆرەکان لە بنیاتی ئیداری (بوروکراتیك) دیاری بکرێن و بۆ هەر یەك لەوانە بە ئیعتباری ئەم چوار فاکتەرە نمرە دابنرێ.

زۆرجار لە هیرارکییەتی (پلەبەندی) کۆمەڵگە ئەوروپییەکان هەرچەندە کاری مرۆڤ سەرنجراکێشتر بێ، پلەوپایە و ئازادیی ئینسان و ڕادەی حەقدەستەکەشی زیاترە. لەو کۆمەڵگەیانەدا ئاغای گەورە کەسێکە کە زۆرترین حەقدەستی هەبێ، خاوەنی پرستیژێکی بەرز بێ، سەرنجڕاکێشترین کارەکان بەڕێوە ببات و کاتی کارکردنیشی لەبەردەست خۆی دابێ ( واتە خاوەن ئازادیی زیاتر بێ).

لە شوێنگە مامناوەندییەکانی هیرارکییەتی ئیداری، هەندێك پێیان باشە کە حەقدەستیان تا ڕادەیەك کەم بێ بۆ ئەوەی لە پلەوپایە یان پرستیژی بەرزتر و کاری سەرنجڕاکێشتر و ئازادیی زیاتر بەهرەمەند بن یان بە پێچەوانەوە کارێکی نەشیاو ئەنجام دەدەن بۆ ئەوەی حەقدەستی زیاتر بەدەست بێنن و سەرەنجام هەندێك کەسی دیکە ئازادیی بە قوربانی پلەوپایە دەکەن و لەم جۆرە ... بە کورتی ئەوەکە ئەم چوار تایبەتمەندییە لەوانەیە بە شێوازی جۆراوجۆر تێکەڵاوی یەکتر بن."(٤)

بە سەرنجدان بەوەیکە لەبارەی پێگەی کۆمەڵایەتی و ڕۆڵی کۆمەڵایەتی گوترا، کەسانێك کە لە کۆمەڵگەدا ڕۆڵی جیاواز بەئەستۆوە دەگرن، لە هەمانکاتدا کە لە گرووپێکی کۆمەڵایەتیدا لە پێگەیەکی باڵا بەهرەمەندن، لەوانەیە هەر لەو کۆمەڵگەیەدا، بەڵام لە گرووپێکی دیکەدا پێگەیەکی مامناوەندی یان خوارتر بۆخۆیان بەدەست بێنن. بۆ نموونە کرێکارێك کە هیچ پسپۆرێتی و زانیارییەکی زانستی نییە و لە یەکەیەکی بەرهەمهێنەردا کە شوێن و پێگەی تاکەکان بە هۆی پسپۆری و زانیاری زانستی و تکنیکییەوە دیاری دەکرێ، ناتوانێ شوێنگەیەکی پیشەیی لەبار و شیاوی هەبێ و بەم پێیە لە هیرارکییەتی کۆمەڵایەتی و پیشەیی ئەم گرووپە بەرهەمهێنەرەدا لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی نزمدا جێدەگرێ و بە بەراورد لەگەڵ

بەڕێوەبەران، ئەندازیاران و تـەکنیککاران و ئەندامــەکانی دیکـەی بەڕێوەبەرایەتییەکـە، ئـەو ڕۆڵەی کە ئەو ئەنجامی دەدا، ڕۆڵێکە کە بە ئاسانی جێگـۆڕکێی پـێ‌دەکرێ و لـە سیســتەمی بەهاکانی ئەو گرووپەدا بایەخێکی ئەتۆی نییە، بەڵام هەر ئەو کەسە لەوانەیـە لـە گوندەکـەی خۆی یان شوێنی نیشتەجێبوونی بە هۆی پارێزکاری، ئاکاری باش یان پێشـینەی بنەماڵـەیی و یان بە شێوەیەکی گشتی بەهۆی ئیعتیبارێك کە لە کۆمەڵگەی عەشیرەتی یان تایفـەیی خـۆی هەیەتی، پێگەیەکی زۆر بەرزی هەبێ و قسە، پێشنیار و ڕاسپاردەکانی زۆر بە باشی جێ‌بگرن، ڕێز و حورمەتی زۆری لێ بگرن و لەسەرووی خۆیانی دابنێن. پێگـەی کۆمەڵایـەتیش هــەروەك ڕۆڵی کۆمەڵایەتی دەتوانرێ بۆ سەر پێگەی پێ‌سپێردراو، بۆماوەیی، وەرگـیراو و دەسـتکەوتوو دابەش بکرێ کە بە پێی ئەوەی کە دەربارەی جۆرەکانی ڕۆڵ گوترا، پێناسەی پێگەکانیش دیـار و ئاشکرایە و پێویستی بە قسەلەسەرکردنی زیاتر نییە.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی یازدەیەم

١ـ هانری مندراس، در طـرح مسائل جامعه‌شناسی امروز، ترجمه دکتر عبدالحسـین نیـك گهـر، دانشـگاه مشهد سال ١٣٤٧، ص ١٩١ و ١٩٢.

٢ـ اقتباس از داستان ( خواهر کوچك تروت) نوشته اندره لیشتن بژرر نویسنده فرانسوی.

٣ـ رجوع شود به اگ برن و نیمکوف، زمینه جامعه‌شناسی ترجمه و اقتبـاس ا.ح.ئاریـان پـور، دانشـگاه تهران ١٣٤٣، ص ١٥٦.

٤ـ هانری مندراس، مبانی جامعه‌شناسی، ترجمه باقر پرهـام، انتشـارات امیرکـبیر، ١٣٥٠، ص ١٥٥ و ١٥٦.

# بەشی دوازدەیەم

## بزاوتی کۆمەڵایەتی

مەبەست لە بزاوتی کۆمەڵایەتی (Social Mobility) گواستنەوە و جێگۆڕکێی تاك یـان گرووپ لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دیکەیە. بە دەسـتەواژەیەکی تـر ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە پێگەی کۆمەڵایەتی تاك یان گرووپێك لە کۆمەڵگەدا دیتە کایـەوە، بزاوتی کۆمەڵایەتی پێدەگوترێ. ( بزاوتی کۆمەڵایەتی، جووڵەی کۆمەڵایەتیشی پێدەگوترێ).
بزاوتی کۆمەڵایەتی دوو لایەنی هەیە:

### ١- بزاوتی کۆمەڵایەتی ستوونی

بزاوتی کۆمەڵایەتی ستوونی بریتییە لە گواسـتنەوەی تـاك لـە پێگەیـەك بـۆ پێگەیـەکی کۆمەڵایەتی ناهاوشێوە. ئەم جۆرە بزاوتـە کۆمەڵایەتییـە بـە دوو شـێوازی بەرزبوونـەوە یـان چوونەسەری کۆمەڵایەتی و دابەزینی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە. واتە جووڵەی ستوونی بەرەوسەر و جووڵەی ستوونی بەرەوخوار. لە حاڵەتێکـدا بزاوتەکـە لـە جـۆری بەرەوسـەرە کـە تـاك لـە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی نزمەوە بۆ پێگەیەکی کۆمەڵایـەتی بـەرزتر بگوازرێتـەوە وەك بزاوتـی کۆمەڵایەتی هەندێك لە گوندنشینان بە هۆی خوێندنی باڵا و خەریك بوون بە پیشەی باش کـە لە جۆری بەرەوسەرچوونی کۆمەڵایەتییە.

ئەگەر کەسێك لە پێگەیـەکی کۆمەڵایـەتی بـەرزەوە بـۆ پێگەیـەکی کۆمەڵایـەتی نـزمتر بگوازرێتەوە، دەڵێن کە تووشی دابەزینی کۆمەڵایەتی بووە. لە ڕەوتـی چاکسـازی زەویوزاردا

هەندێك لە وەرزێران مافی ملکایەتی خۆیان بۆ خاوەن زەوییە گەورەکان گەڕاندەوە و لە ئاکامدا پێگەی کۆمەڵایەتییان دابەزی و هەندێك لە خاوەن زەوییە گەورەکانیش بە هۆی دابەشبوونی ملك و ماڵیان پێگەی کۆمەڵایەتییان تووشی دابەزین بوو و هەندێکیشان بە فرۆشتنی ملکەکانیان و تەرخان کردنی سەرمایە لە بوارەکانی وەبەرهێنانی پیشەسازیدا لە بواری کۆمەڵایەتی بەرز بوونەوە.

## ٢. بزاوتی کۆمەڵایەتی ئاسۆیی

بزاوتی کۆمەڵایەتی ئاسۆیی جۆرێك لە بزاوتی کۆمەڵایەتییە کە تاك لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی هاوشێوە بگوازرێتەوە. گواستنەوەی تاك لە پیشەیەك بۆ پیشەیەکی دیکە جۆرێکە لە بزاوتی ئاسۆیی. بۆ وێنە ئەگەر کرێکاری بواری وەرزێری بکرێتە کرێکاری خانووبەرە دروستکردن. یان کەسێك لە پیشەی وەستایەتییەوە ڕوو لە پیشەی دارتاشی بکات و ... دەڵێین بزاوتی کۆمەڵایەتی لە جۆری ئاسۆیی یە.
بزاوتی کۆمەڵایەتی لەوانەیە لەنێوان دوو یان چەند وەچەیەك بێتە ئاراوە، بۆ وێنە لەنێوان وەچەی منالەکان، باوکان و باپیرەکان لە باری پێوانەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی هەندێك ئالوگۆڕ دێتە ئاراوە، یان لە وەچەیەکدا بێ کە لەم حاڵەتەدا ئەو گۆڕانکارییانەی کە پێگەی کۆمەڵایەتی تاکێك یان گرووپێك لە ماوەی نەسلێکدا دێتەپێش، لەبەرچاو دەگرێ.

## هۆکارە کاریگەرەکان لە بزاوتی کۆمەڵایەتیدا

ئەو کۆمەڵناسانەی کە حەزیان لە تاوتوێ و توێژینەوەی بزاوتی کۆمەڵایەتییە، بۆ هەڵسەنگاندنی ڕادەی بزاوتی کۆمەڵایەتی چەند پێوەرێکی جۆراوجۆر بەکار دێنن. گرینگترین و سەرەکیترینی ئەو پێوەرانە پیشە و بارودۆخی پیشەیی، پەروەردە و بارهێنان و خوێندنە. لە پێوەرەکانی دیکە، هاوسەرگیری و وەدەسهێنانی سامانیش دەتوانرێ ئاماژەیان پێ‌بکرێ کە لە پلەی دووهەمی گرینگایەتیی دان.(١)
سورۆکین (Sorokin) گرینگیی بە بزاوتی کۆمەڵایەتی تاکەکان داوە و دەڵێ: ڕێگەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی کە لە باری مێژووییەوە سوودیان لێ وەرگیراوە، بریتییە لە سوپا، قوتابخانە، سیاسەت، گەیشتن بە سامان و ڕێکخراوە پیشەییەکان و بنەماڵە.

لەنێو هۆکارە کاریگەرەکان لە بزاوتی کۆمەڵایەتیدا فاکتەری ئایینیش باسی کراوە.(٢) سوروکین پێی وایە کە میرات و سامان و شوێنگەی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی بنەماڵەوە یەکێك لە ئامرازەکانی هەڵبژاردنی کۆمەڵایەتییە کە بە بابەتێکی کرداری دێتە ئەژمار. سوروکین دەڵێ: زانیارییە مێژووییەکان ئەوە دەردەخەن کە ڕەوتی هەڵبژاردنی تاکەکان بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی تا ئاستێکی باش کردارییە و بۆ مانەوە و بەردەوامبوونی کۆمەڵگە بەسوود و پێویستە چونکە باشترین و شیاوترین کەسەکانی بە پلە بەرزە کۆمەڵایەتییەکان گەیاندووە. بەردەوامبوونی کۆمەڵەکان نیشانەی ئەوەیە کە هەڵبژاردنی کۆمەڵایەتی نەشیاو نەبووە و ئەرکی سەرەکی خۆی بە چەشنێکی کەم و زۆر جێگەی ڕەزامەندی بەجێ گەیاندووە.(٣)

سورۆکین فاکتەری دانیشتووانی بە گرینگترین فاکتەری بەرزبوونەوەی کۆمەڵایەتی زانیوە چونکە نزمبوونی ئاستی منداڵبوون و لەدایکبوون لە چینە باڵاکاندا، هۆکاری پەیدابوونی شوێنگەی بەرز لەو چینەدا پێك دێنێ. فاکتەری تر پەیوەندی بە ناهاوشێوەبوونی کۆمەڵایەتی ـ دەروونی نێوان وەچەکان هەیە. بەم واتایە کە خێزانەکانی ناو توێژی باڵا خاوەنی منالّی کەم هۆش و بنەماڵەکانی سەر بە توێژە نزمەکان منالّی هۆشیارتریان هەیە. لە ئاکامدا لە باری کۆمەڵایەتییەوە بەرەو ئاستەکانی سەرەوە هەنگاو دەنێن و ئەوانەیکە سەر بە چینی باڵان، دادەبەزن. سوروکین بزاوتە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕوانگەی دەروونناسی کۆمەڵایەتی وەچەکان ڕوون دەکاتەوە و ئەوە هەمان ئەو شێوازەیە کە لە بەرهەمەکانی پاریتۆشدا بەرچاو دەکەوێ.

ویلفێردۆ پاریتۆ کۆمەڵناسی ئیتالّی پێی وایە بەستراوەبوون بە چینی بژاردەکان لە بنەڕەتدا میراتی و بۆماوەیی نییە و منالّەکان گشت تایبەتمەندییە باشەکانی دایك و باوکی خۆیان نییە. بەردەوام جۆرێك لە جێگۆڕینی بژاردە کۆنەکان لە لایەن بژاردە نوێیەکان دێتە ئاراوە کە لە توێژە نزمەکانی کۆمەڵگەن.

لەسەر بنەمای تیۆرە بەناوبانگەکەی پاریتۆ واتە "گەڕانی بژاردەکان" ئەگەر بژاردەکانی حکومەتی نەتوانن ڕێگەیەك بۆ ڕاکێشانی تاکە بەتواناکانی سەر بە توێژە نزمەکانی کۆمەڵگە بدۆزنەوە، کۆمەڵگە تووشی ناهاوئاهەنگی دەبێت و ئەم ناهاوئاهەنگییە پێویستە یان لە ڕێگەی پێکهێنانی بزاوتی کۆمەڵایەتی و جێگۆڕکێی پێگەیی چارەسەر بکرێ یان بەناچار بە پەنابردنە بەر توندوتیژی و ڕووخان و لەسەرکار لابردنی بژاردە گەندەڵ و نەشیاوەکان و لەجێدانانی کەسانی بەتواناتر و شیاوتر. لەڕاستیدا ئەگەر ئەم گەڕانەی بێڕاوەستانی بژاردەکان دەستەبەر بێ، دەبێتە چەشنێك هاوئاهەنگی لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا. ئەم ڕەوتە

جووڵەیەکی بەرچاو لــە بیروڕاکانــدا پێــك دێنــێ و هــەر بۆیــە گۆڕانکــاریی کۆمەڵایــەتی لــێ دەکەوێتەوە.

پییەر لاروك (Pierre Laroque)یش لە کتێبی چینە کۆمەڵایەتییەکان هەروەك سوروکین فاکتەری حەشیمەتی لە بزاوتی کۆمەڵایەتیدا بە کاریگەر دەزانێ و دەڵێ: لە چــینە نزمــەکانی کۆمەڵگەدا، ڕێژەی منداڵبوون زۆرە. لە حاڵێکدا کە لەناو چینە باڵاکاندا ڕێژەکەی لە ئاستێکی کەم دایە. لە ئاکامدا ئەم چــینە وردە وردە کــەمتر و بەرتەســکتر دەبێتــەوە و پێویســت دەکــا کەسانێك لە چینە نزمەکانەوە بۆ چینە باڵاکان بگوازرێنەوە بە تایبەت کــە "ســەر بــە چــینی باڵابوون" بە ئەنجامدانی کار و پیشە دەستەبەر بێ و بوونی ئەو پیشەیەش پێویست بێ.(٤) بۆ وێنە پیشەی پزیشکی کە پێشتر پەیوەندیی بە گرووپ و چینێکی تایبەتەوە بوو. ئەمڕۆکــە لــە ئاستەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە تاکەکان بە هۆی ئەو پیشەیەوە، دەچنە ناو چــینە باڵاکانــەوە. لێرەدایە کە وێکچوونی فکریی نێوان سوروکین و لارۆك دەردەکەوێ.

بزاوتی شــوێنی و کۆچــکردنی گوندنشــینان بــۆ شــار کــە بــەردەوام گــۆڕانی پیشــەی لــێ دەکەوێتەوە، یەکێك لە فاکتەرە گرینگەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتییە. کۆچ، زۆرجار خوێندنی باڵا و خەریکبوون بە پیشەی باش و چوونەسەری کۆمەڵایەتی بەدواوەیە. ئەم دیاردەیە تەنانەت لــە کۆچکردنە نێونەتەوەییەکانیشدا دروستە. چونکە کۆچکردن لە وڵاتانی جیهانی ســێهەمەوە بــۆ وڵاتانی پێشکەوتوو لەباری تەکنۆلۆژیا و بــواری گەشــەی زانســتییەوە، ئەمڕۆکــە شــێوازێکی حەتمی بەخۆوە گرتووە. چونکە وڵاتانی پێشکەوتوو بە هۆی لەرزۆك بوونی بــارودۆخی خێزانــی، کەمبوونەوەی ڕێژەی منداڵبوون و لەناوچوونی توێژی لاو، لەگەڵ کەمبوونــەوەی هێــزی مرۆیــی کارلێهاتوو ڕووبەڕوون و لە بیری ڕاکێشانی هێــزی داهێنــەر و ســامانە فکرییــەکانی جیهــانی سێهەم دان و لەڕێگەی سوود لێوەرگرتن و وەگەڕخستنی مێشکەکان، کەموکورییەکانی خۆیــان پڕ دەکەنەوە.

وادێتەبەرچاو کە پرۆسەی کۆچکردنی بژاردەکان و هێــزی مرۆیــی کارلێهــاتوو لــە جیهــانی سێهەم بۆ وڵاتانی پیشەسازی، لە درێژخایەندا گۆڕانکاری لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و کولتووری ئەم وڵاتانە بەدی بێنێ. بزاوتی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانــدا لە باری چۆنییەتی بارودۆخی گواستنەوە لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دیکە جیاوازی هەیە، لە هەندێك لە کۆمەڵگەکاندا بزاوتی کۆمەڵایەتی بــە ئاســانی جێبــەجێ دەبێ، هەندێکیان لەم بارەوە لە دۆخێکی دژوار دان و لە هەندێك لە کۆمەڵگــەکانیش توانــای

هاتنەکایەی بزاوتی کۆمەڵایەتی لەئارادا نییە. بەم پێیە لەم پەیوەندییەدا کۆمەڵگەکان بۆ سەر چوار جۆر دابەش دەبن:

**١ـ کۆمەڵگەی کراوە:** بە کۆمەڵگەیەك دەگوترێ کە بزاوتی کۆمەڵایەتی تێیدا بە ئاسانی جێبەجێ دەکرێ و تاکەکان دەتوانن بە کەڵك وەرگرتن لە هەلومەرج و کەرەسەکانی بەردەست پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان بگۆڕن و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دیکە وەدەست بێنن. هەرچەند لە ڕواڵەتدا بارودۆخی گۆڕینی پێگەی کۆمەڵایەتی لەم جۆرە کۆمەڵگەیانەدا بە ئاسانی جێبەجێ دەبێ، بەڵام بە ڕوونی دیارە کە لەم کۆمەڵگەیانە کە لە جۆی پیشەسازی دێنە ئەژمار، بە هۆی هەبوونی ئاستەنگی و گیروگرفتە ناڕاستەوخۆکانەوە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە لەوەها ئیمکاناتێك بەهرەمەند نین کە بتوانن بە ئاسانی پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان بگۆڕن. لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵگە پیشەسازییەکان وەك کۆمەڵگەی کراوە ناو نراون کە زیاتر لە هەر کۆمەڵگەیەکی دیکە دەرەتانی بزاوتی کۆمەڵایەتییان تێدا هەیە.

**٢ـ کۆمەڵگەی داخراو:** کۆمەڵگەیەکە کە بە هۆی هەبوونی لەمپەری زۆر، تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە توانای گۆڕینی پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان نییە و بزاوتی کۆمەڵایەتی لەم جۆرە کۆمەڵگەیانەدا بە دەگمەن دێتە کایەوە. دەکرێ کۆمەڵگە کشتوکاڵییەکانی ڕاوەستاو لەسەر بنەمای سیستەمی فیۆداڵی و شێوە فیۆداڵی لە چەشنە کۆمەڵگەیانە لەقەڵەم بدەین. لەم کۆمەڵگەیانەدا منالان، پیشەی باوکەکانیان درێژە دەدەن و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری کۆمەڵگە جۆراوجۆری و ئاڵۆزییەکی ئەوتۆی پێوە دیار نییە. لە کۆمەڵگە داخراوەکاندا گۆڕینی پێگە کارێکی زۆر دەگمەنە و ئەگەر جاروبار زۆر بە کەمی بابەتگەلێك لە جێگۆڕکێی پێگە بە هۆکارگەلی تایبەتی بێتە ئاراوە، لەبەر ئەوەی لە ڕوانگەی ئەندامانی کۆمەڵگەوە بە جۆرێك نۆرم شکێنی دێتە ئەژمار، بە ناخۆشی و بە سەرسوڕمانەوە لێی دەڕوانن.

**٣ـ کۆمەڵگەی نیوە کراوە:** کۆمەڵگەیە کە بە هۆی ڕوودانی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە، سیاسییەکان سیستەمی فیۆداڵی یان شێوە فیۆداڵیی کۆن لێك هەڵدەوەشێ و ئارام ئارام دەرەتان بۆ جێگۆڕکێی پێگەکان لەناو هیرارکییەتی کۆمەڵایەتی دابین دەبێ.

*ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە دەبنە هۆی ئەم لێك هەڵوەشانە، دەتوانرێ بە دوو دەستە دابەش بکرێن:*

ئاـ ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەدوای شۆڕشێکی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکی نەریتیدا دێنە پێشەوە.

ب ـ ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بە هۆی ئەنجامدانی ڕیفۆرمــە کۆمەڵایــەتی و ئابوورییــەکان لــە کۆمەڵگەدا دێنە کایەوە.

شۆڕشێکی سیاسی کە پێکهاتەی کۆمەڵگەی نەریتی دەگۆڕێ و دەرەتانێك بۆ گەشەی توێژە بێبەشەکانی کۆمەڵگە دەخولقێنێ، بەرەبەرە بەستێنی گۆڕانی پێگە کۆمەڵایەتییەکانیش خۆش دەکات. گەشە و پشکوتنی تواناییە شاراوەکان و دەشـت ڕاگەیشـتن بـە ئیمکانـاتی نـوێ لـەو هۆکارانەن کە گۆڕانگاریی پێگەییشی بەدواوە دێ.

بەشێك لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی ئابوورییەکان لەگەڵ ئەوەی کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە بە تەواوەتی ناگۆڕێن، پێداویستی و کەرەسـەی زۆر بـۆ جێگـۆڕکێی پێگـەیی بـەدی دێنن، بۆ نموونە بەڕێوەچوونی بەرنامەی ڕیفـۆرمی زەویوزار لـەو کۆمەڵگەیانـەی کـە لەسـەر بنـەمای سیسـتەمی فیـۆداڵی و شـێوە فیـۆداڵی ڕاوەسـتاون، هەڵوەشـانەوەی ئـەم جـۆرە کۆمەڵگەیانەی لێ دەکەوێتەوە. ئەم لێـك هەڵوەشـانە کـە گەشـەی شـارەکان و پەرەسـەندنی پیشەسازی بەدواوەیە، دەبێتە هۆی کۆچکردنی گوندنشینەکان بۆ شـارەکان. جـێگۆڕینی زۆری حەشیمەتی گوندەکان لە ڕووی شوێنەوە، ڕادەی بزاوتی کۆمەڵایەتی بە تایبەت لەنێو تازەلاوان و ئەو گرووپانەی کە لە تەمەنی کارکردن دان، بە خێرایی دەباتەسەر. شارەکان پڕ لـە خـەڵکی گوندنشین دەبن و لاوانی دێهاتی لە بەشەکانی پیشەسازی یان خزمەتگوزاریدا ڕەوانەی شارەکان دەبن. چوونەسەری حەشیمەتی شارە پلە یەکەکانی ئێـران بـە تایبـەت تـاران لـەم دوو دەیـەی دواییدا سەلمینەری ئەو ڕاستییەیە.

**٤ــ کۆمەڵگــەی کاســتی:** وشــەی کاســت لــە زاراوەی پورتوگــاڵی "کاســتا" (Casta)وەرگیراوە کە بە واتای نژاد، ڕەچەڵەك و ئەسڵە و بۆ یەکەم جار لە سەدەی شـازدەهەم سەبارەت بەو سیستەمەی لە هیند هەبووە، بەکار هاتووە. کاست لە کۆمەڵناسییدا سیستەمی چینایەتی سەربەخۆ و نەبەستراوەشی پێگوتراوە و ئەمە لەبەر ئەوەیە کە پەیوەندیی کاسـتەکان یان چینە بە تەواوەتی داخراو و بۆماوەییەکان و تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ یەکتر پچڕاوە.

لە سیستەمی کاستیدا بە هۆی قەدەغەبوون و سنووردارێتی فـراوان، بزاوتـی کۆمەڵایـەتی بەکردەوە سەر ناگرێ و تاکەکانی هەر کاستێك خۆیان بە شوێن و گرووپێکـی قـەومی تایبـەت دەبەسـتنەوە و پەیوەنـدییان بـە گرووپێکـی پیشـەیی و بـیروڕای ئـایینی تایبەتـەوە هەیـە و هاوسەرگیری لەگەڵ کەسانی سەر بە کاستەکانی دیکە قەدەغە و ڕێگە پێنەدراوە.

بەم پێیە کەسانێك کە ئەندامی کاستێکی دیاریکراون تەنیا دەتوانن پیشە یان چەند پیشەیەکی هاوشێوەی پیشەی باب و باپیرانیان درێژە پێبدەن. ئەندامانی کاست بە ئەنجامدانی هەندێك ڕێوڕەسم و بۆنەی تایبەت، بەردەوامی بە پەیوەندی و یەکگرتوویی نێوان خۆیان دەبەخشن و هەروەها لەنێو کاستەکاندا سزای زۆر توندیش بۆ هەموو ئەو کەسانە لەبەرچاو گیراوە کە یاسا و ڕێساکانی کاستی خۆیان ناپارێزن. ئەم سزایانە جۆاوجۆرن و چەند سزایەکی وەك میوانداری کردن، چوونە زیارەت، دابەزینی پلە و تەنانەت دەرکردن لە کاست لەخۆ دەگرن.

دیارترین و ڕەسەنترین فۆرمی کاست لە ڕۆژگارانی کۆنەوە لە هیندا هەبووە و هەنووکەش لەگەڵ ئەوەی کە ئەم وڵاتە هەوڵی زۆر لە بواری پیشەسازیدا دەدا کەچی زۆر لایەن و سیمای کولتووری ئەو وڵاتە بە شێوازی خۆیان ماونەتەوە. لە هیند ئەم سیستەمە لە پێنج پلە ( ڤارنا) پێك هاتووە کە لەڕووی گرینیگییەوە بریتین لە:

**١ـ براهما یان کاهینەکان**

**٢ـ کاشتر (کشاتریا) یان جەنگاوەران (سوپا)**

**٣ـ ویش (وایشیا) یان بازرگان و جوتیارەکان**

**٤ـ شوور (شودرا) یان پیشەگەر و کرێکارەکان**

**٥ـ ناپاکەکان یان پیسەکان کە نزمترین پلەیان هەیە.**

بێجگە لەم دابەشکردنەی سەرەوە یەکەی بچووکتری ناوخۆییش بوونیان هەیە کە "جاتی"(Jati)یان پێدەگوترێ و بریتییە لە گرووپە بچووکەکان کە لەسەر بنەمای هاوسەرگیری ناوخۆیی ڕاوەستاوە و تاکەکانیان سەرگەمی پیشەیەکن و لە سەربەخۆیی کولتووری و بیروباوەڕ و مافی دیاریکراو بەهرەمەندن. ئەندامەکانی هەر جاتییەك لە گوندێك یان چەند گوندی نزیك لەیەك سنووری دادوەری دادگایەکی کاست پێك دێنن کە لەژێر چاوەدێری ئەنجومەنێکدا دروست دەبێ کە "پەنجیاتی برادەری(Panchyat Of The Biradari)"پێدەگوترێ. ئەم ئەنجوومەنە کە لە پێنج ئەندام پێك هاتووە، خاوەن پلەیەکی بەرپرسایەتییە کە "سەر پەنج"ی پێدەگوترێ. بەم شێوەیە هەر کاستێك لە ئەژمارێکی زۆر "جاتی" پێك هاتووە و بە پێی هەڵسەنگانێك کە یەکێك لە توێژەران ئەنجامی داوە هەر ناوچەیەکی زمانی دوو هەزار "جاتی" لەخۆ دەگرێ. بە پێی بیروبۆچوونی هیندووەکان بەستراوەبوون بە کاستێك، بە هۆی لەدایکبوون لەو کاستە دایە و لەدایکبوونیش بە واتای ئەوەیە کە تاك، شایانی وەدەسهێنانی وەها پلەیەك

بێ. هەر بە پێی ئەم بیروبۆچوونانە، ئەگەر تاکێك لە جەستەی پێشوویدا کردەوەی باشتر ئەنجام بدا، لە پلەی بەرزتردا لەدایك دەبێ و بە پێچەوانەوە کردەوەگەلی ناپەسند کە تاکەکان ئەنجامی دەدەن لەدایکبوونی ئەوانی لە کاستە نزمەکاندا لێ دەکەوێتەوە. لە هەر کاستێکدا پەیوەندی تاکەکانیش لەژێر یاسا و بارودۆخی تایبەتدا بەرێوە دەچێ. بۆ نموونە چێشت خواردن لەگەڵ کەسانی سەر بە کاستێکی دیکە کردەوەیەکی ناپەسند و ناشیرینە و لە هەندێك بابەتدا سزای قورسی بەدواوەیە. تەنانەت جاری وایە چاولێکردنی خواردنی کەسێکی براهما لە لایەن کەسێك لە کاستی ناپاکەکان بۆتە هۆی ئەوەکە براهماکە خواردنەکەی برێژێ.

سیستەمی خواردنی کاستەکانیش لێك جیاوازە، بۆ نموونە، براهماکان لە بنەرەتدا گۆشت ناخۆن تەنانەت لە خواردنی هێلکەش خۆ دەبوێرن لە حاڵێکدا کە ناپاکەکان نە تەنیا گۆشتی ئاژەڵی وەك مەڕ و مانگا دەخۆن، بەڵکوو لە خواردنی گۆشتی بەرازیش کە لەلایەن تەواوی کاستەکانی دیکەوە بێزراو و پیسە، خۆ نابوێرن و باکێکیان لە خواردنی نییە و بەم هۆشەوەی بێزراوترین و نزمترین پیشە کە ئاگاداریکردن و بەخێوکردنی بەرازەکانە، لە ئەستۆی ناپاکەکانە.

لێك نزیکیی و هاوسێیەتی تاکەکانی کاستەکانیش بە پێی هەندێك ڕێسا بووە، بە شێوەیەك کە ئەندامەکانی کاستە جیاوازەکان هەر یەکێکیان دەبێ مەودای دیاریکراو لە یەکتر لەبەرچاو بگرن و بەم شێوەیە بە سەرنجدان بە پێنج پلەکەی سیستەمی کاست، براهمایەك دەبێ ئاگای لەوە بێ کە زۆرترین مەودا کە نەریت دیاری کردووە، لەگەڵ ئەندامانی کاستی ناپاکەکان لەبەرچاو بگرێ لە پێچەوانەی ئەم حاڵەتەدا ناچار بە خۆ پاککردنەوە دەبوون. براهماکان کە زۆربەیان خاوەن مڵکی گەورە و سەرمایەدارن، هەوڵیان دەدا کە پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ ئەو کرێکار و بەکرێگیراوانە نەبێ کە لەسەر زەوییەکانی ئەوان کاریان دەکرد یان جاری وایە لە کاتی پێدانی حەقدەستەکانیان، پوڵەکەیان بۆ فڕێ دەدان.

## گۆڕانكارییەكانی سیستەمی چینایەتی سەربەخۆ و نەبەستراوە لە پەیوەندیی لەگەڵ ئاڵوگۆڕە كۆمەڵایەتی و ئابوورییەكان

بە پەرەسەندنی پیشەسازی و گەشەی شارنشینی لە هینددا سیستەمی كاستی توانای ئەوەی نەبوو كە دەسەڵات و نفووزی خۆی بەسەر كۆمەڵگەدا درێژە پێبدا و بەم پێیە لە چەند دەیەی دواییدا تووشی زۆر گۆڕانكاریی قووڵ بۆتەوە.

ئەم گۆڕانكارییانە تەواوی لایەنەكانی سیستەمی كاستی بە شێوەیەكی یەكسان و وەك یەك نەخستۆتە ژێر كاریگەرییەوە و بەم هۆیەوە هەندێك لە بەهاكانی ئەم سیستەمە هەروەك خۆیان بەهێز ماونەتەوە. بەم پێیە بابەتێك كە لە پەیوەندیی لەگەڵ ئەم گۆڕانكارییانە دەخرێتەڕوو، ئەوەیە كە كام لە توخمەكانی كولتوور بە قووڵی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و چ فاكتەرگەلێكیش خۆڕاگرییان لە بەرامبەر پەرەسەندنی پیشەسازی و تەكنۆلۆژیای نوێدا كردووە؟ دەبێ بگوترێ كە ئەو بەشە لە كولتووری نەریتی زیاتر تووشی گۆڕان دەبێتەوە كە دژایەتی تەكنۆلۆژیای نوێ دەكات و لە بەرامبەردا ئەو بەهایانە پارێزراون كە سەرەڕای ئاڵوگۆڕی پێكهاتەی ئابووری و لێك هەڵوەشانی پێكهاتەی نەریتیی كۆن، دژایەتییەكی گشتی و قووڵیان لەگەڵ نوێخوازی و تەكنۆلۆژیای نوێ نییە.

بۆ نموونە پێكهێنانی دامەزراوە پیشەسازییەكان و زۆربوون و بەرفراوانبوونی زانكۆكان كە پێویستی بە كۆبوونەوەی گرووپگەلێكی بەربڵاو لە كرێكاران و خوێندكاران لە كەشوهەوایەكی یەكدەست دایە، بەستێنی پەیوەندیی نزیكی ئەندامەكانی كاستە جۆراوجۆرەكان دەخولقێنێ و یان لانیكەم بیروڕا توندڕەو و ڕوحییە وشك و نەگۆڕەكەیان نەرم و هێدی دەكاتەوە، چونكە بەشداریی خوێندكاران لە ژوورەكانی خوێندن یان لە تاقیگە و بەشداریی كرێكاران لە یەكە بەرهەمهێنەرەكاندا كە زۆرجار هەزاران كرێكار لە خۆیاندا كۆ دەكەنەوە، لەگەڵ بۆچوون و بەرنامەی كەسانێك كە لە هەوڵی جیاوازی و لێك دوورخستنەوەی تاكەكان لە یەكترن، بەهیچ جۆرێك ناگونجێ و ناتوانێ حاڵەتی پراكتیكی بەخۆوە بگرێ. بەم پێیە كرێكاران و خوێندكاران و فەرمانبەرانی ئەندام لە كاستە جۆراوجۆرەكان لەم ڕاستییە تێگەیشتن كە بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسم و بەرنامە و هەوڵدان بۆ پاراستنی دابونەریت و ڕێوڕەسم و عادەتەكانی كاست، لانیكەم لە شوێنە زانستی و

پیشەسازییەکاندا لەگەڵ یاسا و ڕێسا و پێوەرە نوێیەکاندا ناگونجێ و یان بۆ وێنە پاراستنی مەودای نێوان کاستەکان کە جاری وایە گەلێك زۆرە، لە سیستەمی وەبەرهێنان و لە مەیدانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی چاخی نوێدا بە کردەوە ناتوانێ ئەنجام بدرێ. بە دەستەواژەیەکی ڕوونتر بە چ شێوەیەك کرێکارانی تۆڕێکی بەرهەمهێنان دەتوانن داب‌وڕەسم و عادەتە کاستییەکانی خۆیان سەبارەت بە پاراستنی مەوداگرتن لە ئەوانی دیکە بە شێوازێك بپارێزن کە بیروڕای گشتی و ڕێساکانی کاستی ئەوان چاوڕوانی دەکا و لێیانی دەوێ یان چۆن خوێندکارانی گرووپێك یان تاقیگەیەك لە زانکۆ دەتوانن مەودای دیاریکراو لە لایەن کاستەوە لەبەرچاو بگرن و هەر بەم بەراوردکردنە لە گشت چالاکییەکانی دیکەی کۆمەڵایەتیدا، دابو ڕەسمی کاستەکان بەرەو لاوازی چووە و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری هۆکارەکانی تێکشکان و لێك بڵاوبوونی پێکهاتەی نەریتی کاستەکانی دابین کردووە.

بەڵام لە بەرامبەر ئەم ئاڵوگۆڕانەدا، هەندێك لە عادەتە کولتوورییەکانی وەك جۆری جل‌وبەرگ پۆشین و بە تایبەت شێوازی هاوسەرگیری ناو گرووپی کەم‌وزۆر لەنێوان کاستەکان ماوەتەوە و گۆڕانکارییەکانی پێکهاتەی ئابووری کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر بونیادی خێزان و هاوسەرگیری بەجێ نەهێشتووە. هەنووکەش لاوانی هیندی تەنانەت ئەوانەیکە خوێندنیان لە دەرەوەی وڵاتیش تەواو کردووە و بە شێوەی ڕاستەوخۆ پەیوەندییان لەگەڵ دنیای ڕۆژئاوا و ڕواڵەتەکانی ژیانی ئەورووپا هەبووە، حەزیان لە هاوسەرگیری ناوگرووپی کاستی خۆیان هەیە و بەم شێوەیە زۆر لەو بەهایانەی کە دژایەتییەکیان لەگەڵ داهێنانە تەکنۆلۆژییەکان و پرۆسەی گەشەی پیشەسازیدا نەبووە، بایەخ و ئەرکی خۆیان پاراستووە. بە سەرنجدان بەوەیکە گوترا، دەتوانرێ کاست بە نمونەیەك لە نایەکسانیی پتەو و جێگرتووی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم بدرێ کە لەلایەك جۆرە ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتییە و لە لایەکی دیکەشەوە سیستەمێك لە بەهاکانە. تایبەتمەندییەکەی وەك ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵەیەك لە پەیوەندییە مرۆییەکان بریتی لە دەستەبەندیی کۆمەڵایەتی کۆمەڵکە بۆ چینە سەربەخۆ و نەبەستراوەکانە کە بە شێوەی هیرارکییەتێکی دیاریکراو لەسەر یەکتر ڕاوەستاون و تایبەتمەندییەکەی وەك سیستەمێك لە بەهاکان، بەم مانایەیە کە تێیدا نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەی بنەمایەکی سروشتی و دیار قبووڵ کراوە.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی دوازدەیەم


١ـ علی اکبر نیك خلق، مقدمەای بر جامعەشناسی ڕوستایی ایران، پژوهشکده علوم ارتباطي و توسعه ایران ١٣٥٨ ص ٥٨ ـ ٦٣.

٢ـ احمد اشرف، جامعەشناسی تبقات اجتماعی در امریکا، موسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی ١٣٤٦ ص ٢٣ ـ ١٩.

٣ـ همان ماخذ ص ٢٣.

٤ـ پی یر لاروك، طبقات اجتماعی، ایرج علی أبادی، جیبی، ١٣٤٦ ص ٥١ و ٥٥.

# بەشی سێزدەیەم

## توێژبەندی و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان

خستنەڕووی پێناسەیەکی ورد و بێکەموکورتی بۆ چینی کۆمەڵایەتی کارێکی سادە و ئاسان نییە چونکە جیاوازی بیروڕا لەو بارەوە گەلێك زۆرە بەڵام ئەگەر بمانهەوێ پێناسەیەکی سادە لە چینی کۆمەڵایەتی بخەینەڕوو کە دوور لە لایەنی ئایدۆلۆژیکی بێ، دەتوانین بڵێین کە چینی کۆمەڵایەتی بریتییە لە کۆمەڵێك لە پێگە هاوشێوەکان. یان چینی کۆمەڵایەتی دەتوانرێ بە گرووپێکی زۆر بەربڵاو بزانرێ کە پێگەگەلی زۆر و هاوشێوە لەخۆ دەگرێ. پێش ئەم سەدەیە و هەتا سەدەی نۆزدەیەم، لە پەیوەندیی لەگەڵ توێژبەندیی کۆمەڵایەتی زاراوەی پلەبەندی یان "هیرارکییەتی"(Estate) بەکار دەهێنرا. لە سیستەمی فیۆدالیی ڕۆژئاوا، هیرارکییەتی لەسەر بنەمای پەیڕەوی کردنی خاوەن زەوییەکان لە یەکتر بوو. لە سەرووی هەرەمەکەدا پاشا وەك فیۆدالێکی گەورە کە خاوەن دەسەڵاتی سیاسی بوو، جێی گرتبوو و دوای ئەو پشت سەری یەك ئەو خاوەن زەوییانەی کە ملکەچی شا بوون لەژێر ناونیشانی وەك دوك، کۆنت، بارون و جەنگاوەرەکان بوون. دواتر هەرەمەکە بە وەرزێرانی بەستراوە بە زەوییەکان، یان ڕەعیەتەکان کۆتایی پێدەهات. پێگەی هەر یەکێك لەم توێژە خاوەن زەوییانە دیار و لە هەر پلەیەکدا ماف و ئەرکی تاکەکان دیاری کرابوو و پێگە کۆمەڵایەتییە میراتییەکەیان بە درێژایی چەند سەدە شکڵی گرتبوو و جێی خۆی کردبۆوە. لە کۆمەڵگەگەلی وەك هیند و سیلان سیستەمی هیرارکییەتی بە شێوازێکی زۆر ئاڵۆزتر و ڕێکخراوتر لە چوارچێوەی کاستەکاندا یان چینە سەربەخۆ و نەبەستراوەکان دەرهاتبوو و

مەودای چینایەتی زۆر تەواو و بەرچاو ئەم کاستانەی لێك جیا دەکردەوە کە لەلاپەڕەکانی پێشوودا باسی لێوە کراوە.

لە کۆمەڵگەی گوندنشینی ئێران هەتا چەند ساڵ پێش ئێستا دوو چینی گشتی بەرچاو دەکەوتن: یەکەم ئەو خاوەن زەوییانەی کە بە لەبەردەستدابوونی ئاو و زەوی، دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و سیاسی، چینی باڵادەستیان نە تەنیا لە کۆمەڵگەی گوندنشینی بەڵکوو لە تەواوی کۆمەڵگەی ئێراندا پێك هێنابوو و دووەم ڕەعیەتەکان کە لە لانیکەمی ژیانی ئاسایی بێبەش بوون و چینێکی گەورەیان پێك دەهێنا کە توێژی جۆراوجۆری لەخۆیدا کۆ کردبۆوە. جۆرج گۆرڤیچ کۆمەڵناسی فەڕەنسی کە لە بواری چینە کۆمەڵایەتییەکان تیۆر و بۆچوونەکانی لە کتێبێکدا لەژێر ناونیشانی " توێژینەوە دەربارەی چینە کۆمەڵایەتییەکان" خستۆتەڕوو یەکێك لەو کەسانەیە کە بۆچوونگەلی خاوەنڕایانی بەناوبانگی سەبارەت بە چینە کۆمەڵایەتییەکان بە دوورودرێژی تاوتوێ کردووە و هەڵیسەنگاندوون.

گۆرڤیچ لە سەرەتای ئەم کتێبەدا دەنووسێ:" پێش بەرزبوونەوەی کاری سەرمایەداری و پیشەسازی چینەکان بوونیان نەبوو ـ زیاتر پلە و پایە، گرووپ، دەستە، هاوپیشە بەرچاو دەکەوتن. پێش ئەمانەش کاستەکان بە پێگەی بۆماوەیی بوونیان هەبوو. بە دەستەواژەیەکی دیکە لە زۆر لە کۆمەڵگەکاندا گرووپە داسەپاوەکان بوونیان هەبوو کە جۆرە پەیوەندییەك لەسەر بنەمای هیرارکییەت لەنێویاندا بەرقەرار بوو. بەڵام بابەتێك کە دەخرێتەڕوو ئەمەیە کە داخوا دەتوانرێ ئەم جۆرە گرووپانە وەك چینی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم بدەین. تەنانەت کاتێك کە گرووپە ئابوورییەکان کە بناغەی پیکهاتنیان لەسەر پەیوەندییە ئابوورییەکانی وەك هاوبەشێتی لە سامان و لە کانەکاندا، داهات یان بەرژەوەندیی ڕاوەستاوە، جیاواز لەم توێژبەندییە فەرمییە پەیدا دەبێ، بۆ نموونە کۆیلە ئازادکراوەکان، کرێنشینانی ماڵیات لە ئیمپراتۆریی ڕۆما، بازرگانان و پیشەوەرانی سەردەمی ڕێنسانس و پرۆلیتەرەکانی ڕۆمی، لە هیچ یەك لەم بابەتانەدا ناتوانرێ بە دڵنیایی قسە لەسەر چینە کۆمەڵایەتییەکان بکرێ. (١)

گۆرڤیچ قسەی خۆی بەم شێوەیە درێژە پێدەدا:"کەوایە ئێمە باسەکە لێرەوە دەست پێدەکەین کە چینەکان جیاوازییان لەگەڵ پلەکان، گرووپە داسەپاوەکان و کاستەکان و هەروەها گرووپە ئابوورییەکان و پلەکانی کەسانی خاوەن چالاکییە جۆراوجۆرەکان هەیە. چین شتێکی دیکە و گرینگترە". (٢)

گۆرڤیچ دوای ئەوەکە پێناسەی زۆر و فرەچەشنی کۆمەڵناسە جیاوازەکان لەمەڕ چینی کۆمەڵایەتی دەخاتەڕوو، خۆی ئەم پێناسەیە پێشکەش دەکات:" چینە کۆمەڵایەتییەکان گرووپگەلی تایبەت و ڕاستەقینەی مەودادارن کە تایبەتمەندییەکانیان بریتین لە: سەرکاردایی، حەزی زۆر بە بنەماوەرگری، خۆڕاگری لە بەرامبەر نفووزی کۆمەڵگەی گشتی و ناکۆکی و دژایەتی سەرەکی دەرحەق بە یەکتر.(٣) ناوبراو لە پەیوەندیی لەگەڵ واتای هەر یەك لەو زاراوانەی لەم پێناسەیەدا بەکار هاتوون، شیکردنەوەیەکی سادەی خستۆتەڕوو کە ئێمە تەنیا بە کورتی ئاماژە بە هەندێك لە خاڵەکانی دەکەین:

لە پەیوەندیی لەگەڵ گرووپە ڕاستەقینەکان دەنووسێ: گرووپە ڕاستەقینەکان ئەوانەن کە ئەندامەکانیان بێئەوەی کە بە ئاشکرا بیانهەوێ یان لە بەرنامە و بانگەشەکانی ڕێکخراو یان دەسەڵاتێکی دیاریکراو پێڕەوی بکەن، دەبنە ئەندامیان. سەبارەت بە خۆڕاگری، ڕوونکردنەوەی گۆرڤیچ ئەوەیە کە گرووپە خۆڕاگرەکان لە بەرامبەر نفووزی کۆمەڵگەی گشت (کۆ) ئەوانەن کە هۆشیارانە یان ناهۆشیارانە زیاتر لە هەموان لە بەرامبەر نفووز و کارتێکەری کۆمەڵگەی گشتدا خۆڕاگری دەکەن. ئەم خۆڕاگرییە لەوانەیە هۆکاری جۆراوجۆری هەبێ. جاری وایە لەمەوە سەرچاوە دەگرێ کە گرووپە خۆڕاگرەکان هەست دەکەن کە لە پلەبەندیی جێگیری گرووپەکان وەلانراون. وەك ئەو کۆچەرانەی کە دەبینین مافی کارکردنیان نییە. کەمایەتییە ئیتنیکییەکان کە دەخرێنە ژێر ئازار و ڕاوەدونانەوە. ئەو بێکارانەی کە بۆ ماوەی ساڵانێکی دوورودرێژ بێکار دەمێننەوە. ناپاکەکان لە هیند و ...

بەڵام خسڵەتی بنەماوەرگری بە واتای ئەوەیە کە چینەکان مەیلی ئاشکرایان بۆ بنەماوەرگری هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەکە چینەکان"سەرکاردایی" بەردەوام بە نارێکخراوی دەمێننەوە، بنەما و ڕێکخراوبوون هەرگیز یەك شت نین. هەر چینێکی دروستبوو خاوەن بنەمایەکی تاك و پتەوە بەڵام ناتوانێ لە ڕێکخراوێکدا خۆی دەربخات. تەنانەت چەندین ڕێکخراوی پێکەوە گونجاو بە جۆرێکی بچووك و ناتەواو، توانای دەرخستنی ماهییەتی چینییان هەیە.(٤)

بە کورتی لە سەرجەم وتارەکەی جۆرج گۆرڤیچ لە بارەی چینە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانرێ پێناسەیەك بەم ناوەڕۆکەوە بخرێتەڕوو: چینە کۆمەڵایەتییەکان گرووپگەلێکی تایبەتی زۆر بەربڵاوی پێکهاتوو لە چەند گرووپی لاوەکین کە خاوەن یەکگرتووییەکی تایبەتن و لە بەرامبەر نفووز و کاتێکەریی کۆمەڵگەی گشتدا خۆڕاگری دەکەن، خاوەن خسڵەتگەلێکی وەك

بنەماوەرگری، وشیاریی گشتی و وردەکولتووری تایبەت و دژایەتیی سەرەکی لەناو خۆیاندان و بە پیشەسازییەوە بەستراونەتەوە.

چەمکی چین هەروەك گوترا لە سەدەی نۆزدەهەم و بۆ یەکەم جار لە لایەن ئادام ئیسمیت لە کتێبی "سامانی نەتەوەکان"دا بەکار هێنراوە. "سان سیمۆن"یش لە بەرهەمەکانی خۆیدا زاراوەی چینی پیشەسازی لە زۆر جێگەدا بەکار هێناوە. بەڵام لوتکەی پەرەسەندن و باوبوونی ئەم زاراوەیە هاوتایە لەگەڵ نفووزی مارکسیزم و گەشەسەندنی بزاڤە سۆسیالیستییەکانی ئەورووپا، لە ڕوانگەی مارکسیستییەوە چەمکی چین لە پەیوەندیی لەگەڵ بەرهەمهێناندا پێناسە دەکرێت.

مارکس پێی وابوو کە بە درێژایی مێژوو دوو چین لە بەرامبەر یەکتردا ڕاوەستاون و سەرچاوەی سەرەکیی دژایەتی ئەوانیش لە خاوەنداریێتی تایبەتی کەرەسە و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەزانێ کە یەکێکیان بەرژەوەندیی خۆی لە ڕاگرتن و درێژەدانی دۆخی ئاراییی دەزانێ و ئەوی دیکەیان قازانجی خۆی لە گۆڕانی ئەم ڕەوشە. مارکس مێژووی تەواوی کۆمەڵگەکان بە مێژووی شەڕ و ململانێی چینەکان دەزانێت کە لە سەردەمی کۆیلایەتی، پیاوە ئازادەکان و کۆیلەکان، و لە سەردەمی فیۆداڵی، خاوەن زەوییەکان و وەرزێرانی بەستراوە بە زەوی و لە سەردەمی پیشەسازی، خاوەن پیشەسازییەکان و پرۆلتاریا ( کرێکارانی شاری) لە بەرامبەر و ڕووبەڕووی یەکتر ڕاگرتووە.

لە ڕوانگەی مارکسیزم ئەو گرووپانە چین پێکدێنن کە ئەم تایبەتمەندییانەیان هەبێت: (٥)

**١ـ لە پرۆسەی وەبەرهێناندا شوێنگەی هەموویان یەکسان بێت.**

**٢ـ بەرژەوەندیی هاوبەشی ئابوورییان هەبێت.**

**٣ـ بارودۆخی ئابووریی هاوبەشی هەبێت.**

**٤ـ بە قۆناغی هۆشیاریی چینایەتی گەیشتبن.**

**٥ـ بە قۆناغی دژایەتیی چینایەتی گەیشتبن.**

**٦ـ لە باری دەروونی و چینایەتی پەیوەندییان بە یەکترەوە هەبێت.**

## تیۆرییـــەکانی پەیوەندیـــدار بـــە توێژبەنـــدیی و نایەکســـانییە کۆمەڵایەتییەکان

بە شێوەیەکی گشتی لە پەیوەنـدیی لەگـەڵ نایەکسـانیی و توێژبەنـدیی کۆمەڵایـەتی ئـەو بیرمەند و کۆمەڵناسانەی کە لەم بوارەدا بابەت و توێژینەوەیان پێشکەش کردووە، دەتوانین لـە چوار دەستەدا جێ بکەینەوە:

ئا ـ ئەو بیردۆز و ئایدیۆلۆگانەی کە توێژبەندی کۆمەڵایەتی بە هۆکارە سروشتییەکان پاساو دەدەن.

ب ـ ئەو بیرمەندانەی کە کێشەی دەرەکی یان دژایەتییە ناو گرووپییەکان بە بنەمای چینە کۆمەڵایەتییەکان دەزانن.

ج ـ تیۆرییەکانی مارکس لەبارەی چینەکان و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان

د ـ توێژبەندیی کۆمەڵایەتی لە ڕوانگەی فۆنکسیۆنالیستی.

هەر یەك لە ڕوانگەکانی سەرەوە بە کورتی تاوتوێ دەکەین:

### ئا ـ نایەکسانییە چینایەتییەکان و هۆکارە سروشتییەکان

کەسانێك کە نایەکسانییە چینایەتییەکان لە پەیوەندیی لەگەڵ فاکتەرە سروشتییەکان واتـە فاکتەرە بایۆلۆژی و ڕەگەزییەکان دادەنێن، زیاتر یا خۆیان لـە پـەیڕەوانی ڕێبـازی حەتمییـەتی جوگرافیایین، یان ئیلهامیان لەم ڕێبازە وەرگرتووە. بەم شێوەیە پەیوەندیی لـەنێوان جیاوازییـە نەژداییەکان و جیاوازییە ئیقلیمی و جوگرافییەکان دادەمەزرێنن. ئەم گرووپـە جیاوازییـەکانی کۆمەڵگە و گرووپە مرۆییەکان بە تایبەتمەندییە ڕەگەزییەکان ڕوون دەکەنەوە.

لە بەرهەمەکانی بیرمەندە کۆنەکان گرینگیدان بەم فاکتەرە بە مەبەستی جیـاوازیی نێـوان گرووپە مرۆییەکان بایەخێکی تایبـەتی هـەبووە. جەختکردنـەوەی لەسـەر ڕەگـەزی سـەرتر و پاراستنی لە نووسراوەکانی فەیلەسووفەکانی وەك ئەرەستۆ بـە زۆری بەرچـاو دەکـەوێت. بـڕوا

بەوەکە جیاوازیی ڕەگەزی بۆ نموونە لەنێوان کۆیلەکان و ئازادەکاندا کارێکی سرشتییە، نە تەنیا لە بەرهەمەکانی فەیلەسووفە یۆنانییەکان ئەمە بەرچاو دەکەوێت، بەڵکوو لەلای فەیلەسووفانی نەتەوە کەوناراکانی دیکەش باوی هەبووە. ئەم شێوە بیرکردنەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستیش هەر بەردەوام بووە و دواتر لە سەدە هاوچەرخەکان، بە بڵاوبوونەوەی داروینیزمی کۆمەڵایەتی هەندێك لە توێژەرە ڕەگەزخوازەکان بە نیازی پاساودانی زانستیی تیۆرییەکانی خۆیان بوون.

داروینیزمی کۆمەڵایەتی کە ئیلهام وەرگرتوو لە تیۆرییەکانی داروین لە پەیوەندیی لەگەڵ پلەبەندی گیا و ئاژەڵەکان دایە، بوونی هیرارکییەت و توێژبەندیی کۆمەڵایەتی بە بنەمایەکی سروشتی دەزانێ و پەسندی دەکات. بەم پێیە نە تەنیا بزووتنەوە و گۆڕانکارییەکان ڕەت ناکاتەوە، بەڵکوو بەربەرەکانیشیان لەگەڵ دەکات. نووسەری کتێبی کۆمەڵناسیی چینە کۆمەڵایەتییەکان لەم بارەوە دەنووسێ: " لە ڕوانگەی توێژبەندیی کۆمەڵایەتییەوە داروینیستە کۆمەڵایەتییەکان پێیان وایە کە مرۆڤ وەك هەموو ئاژەڵ و ڕووەکەکانی دیکە دەبێ پلەبەندی بکرێ و لە ڕەوتی هەڵبژاردندا ئەوانەیکە لە پلەیەکی بەرزتر دابن، سروشتییە کە لەسەرووی ئەوانی دیکەن. بەم پێیە کەسانێك کە توانایی سروشتییان هەیە فەرمانڕەوا و ئەوانەیکە لە تواناییە سروشتییەکان بێبەشن، جەماوەری کارەکەر و فەرمانبەر پێك دێنن. لە نوێنەرانی بەناوبانگی ئەم شێوە بیرکردنەوە دەتوانرێ ناوی سپێنسەر، باگهوت، گۆمپلۆویچ، راتز نهوفەر، فرانکلین، وارد، وودبێری ئیسمال و سامنێر بهێنرێ. بنەماکان و چوارچێوەی بیرکردنەوە و تیۆرییەکانی ئەوانە لە بارەی توێژبەندیی کۆمەڵایەتی کەم تا زۆر وەك یەکە." (٦)

لە پەیوەندیی لەگەڵ داروینیزمی کۆمەڵایەتی دەتوانین دوو ڕێباز وەك ڕێبازە لاوەکییەکان باس بکەین:

١ـ یەکێکیان ڕێبازی هەڵسەنگاندنی ژیانی کۆمەڵایەتییە کە دامەزرێنەرەکەی فرانسیس گاڵتۆنە و ئەوی دیکە ڕێبازی هەڵسەنگاندنی خەڵکە کە دامەزرێنەرەکەی لاپۆژی فەڕەنسییە. لە ڕوانگەی گاڵتۆن لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان لە باری تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکان و خسڵەتگەلێکی وەك ڕەنگی پێست، هێزی جەستەیی و تایبەتمەندییە دەروونییەکان، جیاوازییان لەگەڵ یەکتر هەیە بەم پێیە لە باری کۆمەڵایەتی و چینایەتیش لەگەڵ یەکتر یەکسان نین. گاڵتۆن پەیوەندییەك لەنێوان ئەم نایەکسانییە و فاکتەری بۆماوەیی دادەنێت و دەستێوەردانی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان تێیدا بە کاریگەر نازانێ، ناوبراو تواناییەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی

گشتی سەرچاوەگرتوو لە بۆماوەیی دەزانێ و بەم هۆیەوە گالتۆن پێی وایە کە ژینگەی کۆمەڵایەتی توانای نییە لە کەسانی بێتوانا کەسانی سەرکەوتوو و دیار دروست بکات.(٧)

یەکێکی دیکە لەو کەسانەی کە نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندیی لەگەڵ هۆکارە سروشتییەکان دەخاتە بەرباس، "مەگ دۆگاڵ"ـە کە تایبەتمەندییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ غەریزەکان دەزانێ.

کارڵ پیرسێن کە یەکێکی دیکە لە پێڕەوانی ڕێبازی هەڵسەنگاندنی ژیانی کۆمەڵایەتییە، ڕستەیەکی هەیە کە دەتوانرێ بە پوختە و دەربڕی بۆچوونەکانی ئەم گرووپە بزانرێ. ناوبراو دەڵێ: " ڕێگە بدەن کە نەردیوانی (پەیژە)ی پێشکەوتن لە چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە و لە گرووپێکەوە بۆ گرووپێکی دیکە بوونی هەبێ بەڵام مەهێڵن کە سەرکەوتن لەم پەیژەیە بە ئاسانی ئەنجام بگرێ. ئەوانەیکە خاوەن توانایی زیاترن بتهەوێ و نەتهەوێ سەردەکەون و ئەمە تاقانە ئیمتیازی بزاوتی کۆمەڵایەتییە." پلەبەندیی کۆمەڵایەتی تەنیا ڕووداوێکی مێژوویی نییە بەڵکوو سەرچاوەگرتوو لە هەڵوەژاردنێکی بەردەوامە کە لە باری ئابووری، کۆمەڵگە بۆ چینە جیاوازەکان کە بە شێوەیەکی گشتی بۆ جۆرە کارێکی تایبەتی گونجاون، دابەش دەکات. لەم ڕووەوە هەر چینێك دەبوایە کار بۆ پەروەردە و فێرکردنی گونجاو لەگەڵ لێهاتوویی و توانایی تاکەکانی بکات و فێرکردنی هەمووانی و یەکسان دەبێتە هۆی پشێوی لە کاروبارە سروشتییەکاندا. (٨)

٢ـ دووهەمین ڕێبازێك کە بە جەختکردنەوە لەسەر نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندیی لەگەڵ هۆکارە سروشتییەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا دامەزراوە، ڕێبازی هەڵسەنگاندنی خەڵکە. لاپوژی فەرەنسی دامەزرێنەری ئەم ڕێبازە لە هەوڵ دایە جیاوازییە ڕەگەزییەکانی قەومەکان دەربخات و ئەم جیاوازییە ڕەگەزییانە تەنانەت لە ناو قەومێکیشدا بە دروست دەزانێت. بۆ نموونە ناوبراو ڕەگەزی سپی پێستی ئەورووپا پێکهاتوو لە سێ نەژادی لاوەکی دەزانێ کە بریتین لە نژادی ئاریا، نژادی ئالپ و نژادی مەدیترانەیی. ئەو ئەم سێ ڕەگەزە لەسەر بنەمای جیاوازییە جەستەییەکان لێك جیا دەکاتەوە. بۆ نموونە ئارییاییەکان باڵابەرز و دەموچاو سپی و خاوەن کاپۆڵی درێژن لە حاڵێکدا تاکەکانی سەر بە ڕەگەزی مەدیترانەیی خاوەن باڵای کورت و ڕوخسارێکی ئامالْ ڕەشن و لەم نێوەدا ڕەگەزی ئالپ ئەو کەسانە دەگرێتەخۆ کە خاوەن باڵایەکی مامناوەنجین و ... "لاپوژ" هەوڵی داوە بۆ ئەوەی هەر یەك لە ڕەگەزەکانی سەرەوە بە خاوەنی جۆرێکی تایبەت لە توانایی، ڕەفتار و داهێنان بزانێ و

بەم هۆیەوە بڕوایەکی پتەوی هەیە کە چینە باڵاکانی کۆمەڵگە هەمیشە لـە تاکـەکانی نـژادی ئاریا پێك دێن. ناوبراو گرینگییەکی زۆریـش بـە تایبەتمەندییـە جەسـتەییەکانی ئـەم گرووپـە ڕەگەزییانە دەدات بە شێوەیەك کە لە ڕوانگەی ئـەوەوە درێـژایی کـاپۆڵی چـینە ئەشـرافەکان بەرزتر لە درێژایی کاپۆڵی چینە نزمەکانی کۆمەڵگە بووە.

وەها پاساوهێنانەوەیەکی ڕەگەزخوازانە کە لـە سـەدەکانی هـەژدە و نـۆزدە کـە جێگـەی پەسندی گشتی بوو، بە هۆی ئەو توێژینەوانەی کە لە لایەن بیرمەنـدان لـە پەیوەنـدیی لەگـەڵ هۆش و توانایی و داهێنانی مرۆڤـەکان ئـەنجام درا، بەرەبـەرە بایـەخی خـۆی لەدەسـت دا بـە شێوەیەك کە لە حاڵی حازردا ئەم تیۆری و گریمانانە بـە تـەواوی ڕەت کراونەتـەوە. بـۆ نموونـە ئەمڕۆ دەرکەوتووە کە هیچ چەشنە پەیوەندییەك لەنێوان کاپۆڵ و ڕەنگـی پێسـت و توانـایی و داهێنانی مرۆڤدا بوونی نییە.

### ب ـ نایەکسانییە چینایەتییەکان و کێشەی دەرەکی

یەکێك لەو کەسـە بەناوبانگانـەی کـە نایەکسـانییە کۆمەڵایەتییـەکان و پێکهـاتنی چینەکان لەگەڵ دژایەتی یان کێشەی دەرەکی لە نێـوان گرووپـە مرۆییەکانـدا، بەیەکـەوە دەبەستێتەوە، "عـبدالرحمن ابن خلدون"ـە کە لە لاپەڕەکانی پێشـوودا ئاماژەیـەکمان بـە بۆچوونەکانی ناوبراو سەبارەت بە پێکدادانی کۆمەڵە سەرەتاییەکان لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ کۆمەڵگە ئاڵۆزەکان، کرد.

لەڕاستیدا بەم هۆیەوە دەتوانرێ ئیبن خەلدوون لەم گرووپەدا دابنرێت چونکە خولی زنجیرەیی و بەردەوامی کێشەی دوو شێوازی بەرهەمهێنانی کۆچەری و یەکجێنشینی تاوتوێ دەکـات و پێکهاتنی دەوڵەت و لە ئاکامدا دروستبوونی چینەکان بە بەرهەمی باڵادەستبوونی تێکـەڵ بـە توندوتیژی یەکێك بەسەر ئەویتردا دەزانێ و بەم شێوەیە گرووپی زاڵ و سەرکەوتوو وەك چینێکی شاز و بژاردەو تایبەتمەندییەکی سەرتر بەسەر زۆرینەی بەزیو و شکست خواردوو لەقەڵەم دەدات.

پێش ئیبن خەلدوونیش ژمارەیەك لە بیرمەندە کۆنەکان تیۆری کێشەی دەرەکییان بە پەشـت بەستن بە هێز و پێکدادانی توندوتیژانە و شەڕی هەمیشەیی لەنێوان گرووپەکاندا باس کـردووە. "هێراکلیتـووس"، پلیبیـووس"، "ئێپیکـور" و "لوکریتـوس" نوێنـەرانی وەهـا شـێوە بیرکردنەوەیەکن.

یەکێکی دیکە لەو بیرمەندانەی کە وەك یەکێك لە دامەزرێنەرانی ڕێبازی کێشەی کۆمەڵایەتی نێوان گرووپەکان دیارە، تۆماس هۆبزی بەریتانییە. "تۆماس هۆبز" بۆچوونەکانی لە کتێبێك لەژێر ناونیشانی لۆیاتان(Leviathan) باس کردووە و پێی وایە کە لە بارودۆخی سروشتی کە پەیمان و گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان ڕەگەزی مرۆڤدا بوونی نییە، هەر تاکێك لەژێر کاریگەریی غەریزە سەرکێشەکانی خۆیدا بۆ کەسانی دیکە وەك گورگ وایە. لە "لڤیاتان"(لویاتان) وشەیەك کە دەرخەری پەیوەندییەکی جیا لە شەڕ و داگیرکاری و جاری وایە هەڵوەستەیەك لە شەڕدا بێت، نەهاتووە و بە پێی بنەماکانی هۆبز، ئەم ڕەوشە دەرەنجامی نەبوونی دەوڵەتێکی نێونەتەوەییە، چونکە پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتان هەنووکەش لە حاڵەتێکی سروشتی دایە کە شەڕی هەمووان بە دژی هەمووانە ... (٩)

یەکێك لە بەناوبانگترین لایەنگرانی تیۆری کێشەی دەرەکی، بیرمەندی نەمسایی سەدەی نۆزدەهەم " لودویك گومپلویچ"ـە کە زاڵبوونی گرووپێك بەسەر گرووپەکانی دیکەدا بە سەرچاوەی هاتنەدی دەوڵەت دەزانێ. ناوبراو کە بە یەکێك لە داروینیستە کۆمەڵایەتییەکان لەقەڵەم دەدرێت، پێی وایە کە شەڕ و کێشەی نێوان گرووپە مرۆییەکان بە شێوەی شەڕی مانەوە لە سروشت دایە و لە کاتێکدا کە کەمینەیەکی ڕێکخراو و ڕێکوپێك بەسەر کۆمەڵە بڵاو و بێسەرەوبەرەکاندا زاڵ دەبێت، چینی دەسەڵاتدار پێك دێنێ.

"ئیپن هایمێر" کۆمەڵناس و ئابووریزانی ئەڵمانی (١٩٤٣ ـ ١٨٦٤) یەکێکی دیکە لەو کەسانەیە کە ئیلهامی لە بۆچوونەکانی ئیبن خەلدوون وەرگرتووە، ئەو گۆڕانی دەوڵەت و چینی بالادەست بە دەرەنجامی توندوتیژانەی گرووپێك بەسەر گرووپێکی دیکەدا دەزانێ و پێی وایە دەوڵەت لە شەش قۆناغدا شکڵ دەگرێت بەم شێوەیە ئەم قۆناغانە، کە لە قۆناغی یەکەم کە قۆناغی کوشتن و داگیرکارییە دەست پێدەکا و هەتا دەسەلاتدارێتیی تەواوەتی گرووپی سەرکەوتوو بەسەر هەمووانداو پێکهاتنی دەوڵەت و چینە جۆراوجۆرەکان بە کۆتایی دەگات. (١٠)

### ج ـ تیۆرییەکانی مارکس لە بارەی چینەکان و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان

مارکس و پەیڕەوانی بە لایەنگرانی کێشەی نێوخۆیی یان ناوگرووپی دەزانن، بەم مانایە کە بەپێچەوانەی بۆچونەکانی ئەو بیرمەندانەی کە باسیان لێوەکرا، ئەم تاقمە بوونی چینەکان و

نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان بە دەرەنجامی دژایەتی نێوگرووپی یان کێشەی نێوان گرووپێك کە خاوەن کەرەسە و ئامرازەکانی بەرهەمهێنانن و گرووپێك کە خاوەنیان نین، دەزانن.

لە کۆمەڵناسیی مارکسدا، چوار خاڵی سەرەکی سەبارەت بە ململانێ کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەی خوارەوە بوونی هەیە:

١ـ بەردەوامیی و هەمیشەیی بوونی ململانێ کۆمەڵایەتییەکان لە گشت کۆمەڵگەکاندا بوونی هەیە، بەم مانایە کە دژایەتی، بەشێکی جیانەبۆوەی ژیانە و هەموو ئەو شتانەی کە بوونیان هەیە، بەردەوام و بێ‌ڕاوەستان پەیوەندییەکیان بە حاڵەتگەلێك لە کێشە و شەڕەوە هەیە. کۆمەڵگەش کە لە مرۆڤەکان پێك هاتووە، بەدەر لەم یاسایە نییە. چونکە لەڕاستیدا ململانێ پێویستی و بەستراوە بە زات و ئەرکەکانی کۆمەڵگەوەیە.

٢ـ بەپێی تیۆرییەکانی مارکس ململانێ کۆمەڵایەتییەکان، بریتین لە ململانێی ئەو بەرژەوەندییانەی کە بە ناچار دوو گرووپ لە بەرامبەر یەکتردا ڕادەگرن، چونکە لە کۆمەڵگەدا تەواوی دژایەتی بەرژەوەندییەکان لە کۆتاییدا بە ململانێ و ناکۆکی نێوان کەسانێك کە بەرژەوەندیی خۆیان لە پاراستن و درێژەدان بە دۆخی ئارایی دەزانن و کەسانێك کە بەرژەوەندیی خۆیان لە گۆڕانی ئەم ڕەوشەدا دەبینن، کۆتای پێ‌دێت. بە دەربڕینێکی دیکە، هەمیشە لە پەیوەندیی لەگەڵ دۆخی ئاراییە کە شوێنگەی دوو لایەنی شەڕکەر و دژبەیەك دیاری دەکرێت و لەڕاستیدا لە پەیوەندیی لەگەڵ ڕەوشی ئارایی تەنیا هەڵبژاردنی گونجاو، لە کۆتاییدا یان پاراستنی دۆخی ئاراییە یان گۆڕانکاریی تێیدا.

٣ـ مارکس، ململانێ بە مۆتۆڕ یان هێزی بزوێنەری سەرەکیی مێژوو دەزانێ و بە بڕوای ناوبراو ململانێ بە ناچاری و بە توندی دەبێتە هۆی گۆڕانکاریی لە قۆناغی کەم‌وزۆر کورتدا و لەڕاستیدا لە دەرەنجامی ناکۆکیی نێوان گرووپە جیاوازە خاوەن بەرژوەندییەکانە کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی گۆڕانی بەسەردادێت.

٤ـ سەرەنجام مارکس بە شیکردنەوەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، شێوازێکی نوێی خستۆتەڕوو، بەم شێوەیە کە گۆڕانکارییەکان دەبێ لە پەیوەندیی بە دوو دەستە لە هۆکارەکان تاووتوێ بکرێن: یەکەم هێزە دەرەکییەکان کە لەدەرەوەی سیستەمن وەك کاریگەرییەکانی ژینگەی سروشتی، ئیقلیمی یان بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی تکنیك و زانیارییەکان و دووهەم، هێزەکانی ناوەوە کە لەلایەن سیستەمی کۆمەڵایەتی و لە ناوەوەی خودی سیستەم و لە ئەرکەکانی ئەوەوە سەر هەڵدەدەن و سەرچاوە دەگرن و ئەمە لەڕاستیدا یەکێك لە

تایبەتمەندییەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتییە کە لە ناوەوەی خۆیدا ئەو هێزانە بەدی بێنێ کە دەبنە هۆی گۆڕانکاری تێیدا.

" ڕاڵف دارندرۆف" کۆمەڵناسی ئەڵمانی ڕەخنە لە بیروڕاکانی مارکس دەگرێ و ئەو هەڵانە لە بابەتەکانی خوارەوەدا بۆ ئەو دەگەڕێنێتەوە:

### ١- ململانێ کۆمەڵایەتییەکان و ململانێ چینایەتییەکان

یەکەم ئەوەکە مارکس تەواوی ململانێ کۆمەڵایەتییەکان یان لانیکەم ئەو ململانێیانەی کە لە باری مێژووییەوە گرینگن، لە ڕیزی ململانێ چینایەتییەکان دادەنێت، لە حاڵێکدا کە بە پێی بیروبۆچوونی دارندرۆف، مارکس ئەم بابەتە بە سادەیی لەقەڵەم دەدات و دەڵێ: چین شتێکی جیا لە گرووپە خاوەن بەرژەوەندییەکان نییە کە تاکەکانی کۆمەڵگەیەك لە ناویاندا دژایەتی یەکتر دەکەن و خەباتی چینایەتی شتێکی جیا لە ململانێی ئەو بەرژەوەندییانە نییە کە کۆمەڵگە بەسەر چەند گرووپێکدا دابەش دەکات.

لەلایەکی دیکەوە، تەواوی ئەو ململانێیانەی کە دەبنە هۆی جووڵە و بزووتن لە کۆمەڵگەدا، بەناچار بە خەباتی چینایەتی کۆتاییان پێنایەت و مارکس لەڕاستیدا بە سەرنجدان بە جۆرێکی تایبەت لە ململانێ و لە بارودۆخێکی تایبەتدا، خەباتی چینایەتی گشتاندووە بە شێوەیەك کە پێی وایە ململانێ کۆمەڵایەتییەکان، بە خەباتی چینایەتی کۆتاییان دێت. دیارە بارودۆخ و هەلومەرجی سەرمایەداری لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لەوانەیە پاساودەری ئەم ئیددیعایە بێت بەڵام ئەمڕۆکە ئیتر ناتوانرێ وەها هەڵەیەك دووپات بکرێتەوە.

### ٢- ململانێ چینایەتییەکان و شۆڕش

دووهەم ئەوەکە، لە ڕوانگەی مارکس، ململانێی چینایەتی بەناچار بە پێی پێویستی و شێوەیەکی حەتمی بە شۆڕش کۆتایی دێت و بە بۆچوونی ئەو شۆڕش تەنیا ئاکام و بەرهەمی خەباتی چینایەتییە. لەحاڵێکدا کە لە مێژووی ململانێ چینایەتییەکان، سەرەنخوونبوونی سیستەمێك بە هۆی شۆڕشە توندوتیژەکان تەنیا بابەتگەلێکی دەگمەنن و ئەوەی کە زیاتر و زۆرجار بەرچاو دەکەوێت، چینی مامناوەنجییە کە ئایدیای نوێ وەردەگرێ و خۆی ئاڵوگۆڕ بە مەبەستی پووچەڵکردنەوە و لە کاریگەری خستنی هۆکارە

باش و بزوێنەرەکانی خاوەن توانایی شۆڕش ئەنجام دەدات. "دارندرۆف" مارکس بە ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی نەگۆڕ و وەستاو لە خەباتی چینایەتی تاوانبار دەکات چونکە بە بڕوای مارکس پێش هەر شۆڕشێك سیستەمێك لە چینە جۆراوجۆرەکان بوونی هەیە کە کاتێك کە ئەم سیستەمە بە ڕادەی کۆتایی کامڵبوون و درەوشانەوەی خۆیان گەیشتن، لێك هەڵدەوەشێ و بە لەناوچوونی خۆی، جێگەی خۆی دەداتە سیستەمێکی دیکە بەم پێیە شۆڕش لە لێکدانەوەی مارکسیستیدا، تەنیا کاتێکی بەڕاستی زیندوو لە مێژوویە، بەڵام ئەم جۆرە لێکدانەوە مێژووییە تەنیا لە هەندێك بابەتی تایبەتیدا ڕاستە، چونکە تەواوی ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەبێ شۆڕش هاتوونەتە کایەوە، نابینێ.

بە دەربڕینێکی دیکە ئەم جۆرە لێکدانەوە مێژووییە تەواوی ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکارییە پێکهاتەییەکان کە تەنانەت لە خەباتی چینایەتیش مایە وەربگرن، یەکسەر لەبیر دەکات. لەڕاستیدا خەباتی چینایەتی حەتمەن نابێتە هۆی دەرکەوتن و پەرەسەندنی سیستەمێکی ڕاوەستاو لەسەر ململانێی چینایەتی بەڵکوو خەباتی چینایەتی زیاتر دەبێتە هۆی گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی هەمیشەیی لە سیستەمی ئاراییدا و ئەم گۆڕانکارییانە هەروەها دەرەتانی "بوونێتی" بە سیستەم دەبەخشن و بەم پێیە بە هۆی ئەم گۆڕانکارییانەیە کە خەباتە چینایەتییەکان بە دەگمەن دەبنە هۆی شۆڕش.

### ٣- ململانێ چینایەتییەکان و خاوەندارێتی

سێهەمین ڕەخنە کە لە مارکس گیراوە، لە پەیوەندیی لەگەڵ سەرچاوەی چینە کۆمەڵایەتییەکان و ململانێ چینایەتییەکان لەسەر خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە. مارکس لە خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا بەدوای سەرچاوەی چینە کۆمەڵایەتییەکان و ململانێ چینایەتییەکاندا دەگەڕێت و بەبێ‌شك لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم دایە کە مارکس بڕوای بە پەیوەندیی لێك نەپچڕاوی خاوەندارێتی و کۆنترۆڵ و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان هێناوە، لەحاڵێکدا کە گۆڕانکارییەکانی دواتری سەرمایەداری دەریانخستووە کە ئەم دوو فاکتەرە شیاوی لێك هەڵوەشانن. لە دامەزراوە گەورەکانی سەرمایەداریی نوێ، خاوەندارێتی لەنێوان هەزاران پشکدار کە هیچ چەشنە کۆنترۆڵێك لەسەر کەرەسە و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان نییە، دابەش کراوە و بەرپرسایەتی کۆنترۆڵ و چاوەدێری بە کردەوە بەدەست ئەو تەکنۆکرات و بۆرۆکراتانەیە کە هیچ جۆرە مافی خاوەندارێتییان لە

دامــەزراوەی بەرهەمهێنانــدا نییــە و لەڕاســتیدا بــە جێگــەی خاوەنــداریێتی ئامرازەکــانی بەرهەمهێنان، کۆنترۆڵی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان وەك هۆکارێکی سەرەکی و زاڵــی ململانــێ چینایەتییەکان لەقەڵەم دەدرێت.

بە کورتی ئەوەکە "دارندرۆف" وێڕای ئەوەکە ڕەخنە لە هەڵەی مارکس لە بواری ململانێی کۆمەڵایەتی و چینایەتی کە خۆی لەژێر بارودۆخی تایبەتی ســەدەی نۆزدەهــەم هاتۆتەکایــەوە، دەگرێت و لێکدانەوەیەکی نوێ لە ململانێی کۆمەڵایەتی دەخاتەڕوو، خۆیشی لــە لێکدانــەوەی ئەو کۆمەڵگایانەی کە بە پەنابردنە بەر ئایدۆلۆژیای " هاوتایی بوون و یەکسانی " لە هەوڵی پاراستنی دۆخی ئارایی و ڕەتکردنەوەی شۆڕشە توندە کۆمەڵایەتییەکان دان، تووشی هەڵە یــان دەمــارگرژی بۆتــەوە. لەڕاســتیدا لێکدانــەوەی "دارنــدرۆف"یش کــە خــەباتی چــینایەتی بــە سەرچاوەی پێکهاتنی ئەو گۆڕانکارییانە دەزانێ کە لە هەمان کاتدا " دەرەتانی درێــژەدان بــە سیستەمی ئارایی ( مەوجوود) دەدات" دەتوانرێ بە لێکدانەوەیەکی نەگۆڕ بێتــە ئــەژمار کــە لەژێر کاریگەریی بارودۆخێکی تایبەت و بڕگە زەمەنییەکی دیاریکراو لە گۆڕانکاریی کۆمەڵگە سەرمایەدارییەکان دایە. (١١)

لەڕاستیدا ئەگەر بمانهەوێ بۆچوونەکانی مارکس لە چــەند ڕســتەیەکدا کــورت بکەینــەوە، دەتوانین بڵێین:

١ـ بوونی چینەکان تەنیا پەیوەندیی بە قۆناغگەلێکی تایبەتی مێــژوویی لــە گۆڕانکــاریی وەبەرهێنانەوە هەیە.

٢ـ ململانێی چینایەتی بەناچار بە دیکتاتۆریی پرۆلتاریا دەگات.

٣ـ دیکتاتۆری پرۆلتاریا تەنیا قۆناغێکی گواستنەوەیە بۆ لەناوچوونی تەواوی چــینەکان و گەیشتن بە کۆمەڵگەی بێچین.

مارکس سیستەمی کۆمەڵایــەتی پێکهــاتوو لــە دوو بــەش دەزانێــت: بەشــی یەکــەم بــە سەرخانی کۆمەڵایەتی ناو دەبات و بەشی دووهەم سیستەمی بەرهەمهێنانە کــە لــە ڕوانگــەی ئەوەوە فاکتەری سەرەکی و کۆڵەکە و سەرچاوەی گشت سیستەمەکە دێتە ئەژمار. بەشی دوایی خۆی بە دوو بەش دابەش دەبێت: یەکێکیان هێزە بەرهەمهێنەرەکان و ئــەوەی دیکــە شــێوازی بەرهەمهێنان، یان چۆنییەتی کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە سروشتییەکان و ئامرازەکان و زانستی مرۆیی. هێزەکانی بەرهەمهێنانیش خۆی دوو بەش لەخۆ دەگرێت:

١ـ کەرەسە و ئامراز یان شوێنگەی تکنیکی بەرهەمهێنان کـە سەرچـاوە سروشـتییەکان، کەرەسە و ئامرازە فەننییەکان و زانستەکان و ئەو تکنیکانەی کـە لـە بەرهەمهێنانـدا بـەکار دەهێنرێن، لەخۆ دەگرێت.

٢ــ هێـزی کـار کـە بـە کـەڵك وەرگـرتن لـە شـارەزایی و ئامرازەکـان خـەریکی کـاری بەرهەمهێنانە و مەسـەلەی دابەشـکردنی کـار و چـۆنییەتی کـەڵك وەرگـرتن لـە تاکـەکان و سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان.

سەرخانی کۆمەڵایەتی سیستەمی فکری و ئایدۆلۆژیی کۆمەڵگە، یاسا، هونەر، بەهاکان و نۆرمەکان و بە شێوەیەکی گشتی فاکتەرە مەعنەوییەکان لەخۆ دەگرێت.

مارکس پێی وایە کە سیسـتەمی کۆمەڵایـەتی لـە قۆناغگـەلی مێـژوویی دیـاریکراو لـە فاکتەرە دژبەیەکەکان پێك هـاتووە و چـینە باڵادەسـتەکان بـە پەنابردنەبـەر هێـز لـە هـەوڵی پاراستنی سیستەمی کۆمەڵایەتی مەوجود دان بەڵام سـەرەنجام ململانـێ ناوخۆییـەکان دەبنـە هۆی گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگەدا. بەم شێوەیە مارکس دەوڵەت بە دەوڵەتێکی چینایەتی دەزانێ و وەك ئامرازێك بۆ پیادەکردنی گوشار بۆ سەر زۆرینەی خەڵکی کۆمەڵگـە لـە دەسـت چـینی خاوەن ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا لەقەڵەمی دەدات و لە بەرامبەر چینی باڵادەسـت ( خـاوەن ئامرازەکـانی بەرهـەمهێنان) دا چـینێکی دیکـەی دادەنـێ کـە خاوەنـدارێتی ئامرازەکـانی بەرهەمهێنانیان لەبەردەستدا نەبووە و بەم هۆیەوە لە تەواوی قۆناغە مێژووییەکاندا ململانێـی چینایەتی لەنێوان ئەم دوو چینەدا بوونی هەبووە.

### د ـ توێژبەندیی کۆمەڵایەتی لە ڕوانگەی فۆنکۆسیۆنالیزم (فانکشێنالیزم)

فۆنکۆسیۆنالیزم (Fonctionalisme) یان ڕێبازی ڕەسەنایەتی کـردەوە ( کردەوەخـوازی) لەڕاستیدا ڕێبازێکە کـە لـە بەرامبـەر گەشـەخوازی (Evolutionisme) کـە لـە سـەدەی نۆزدەهەمدا برەوی هەبوو، هاتە ئاراوە. پەیڕەوانی ئەم ڕێبـازە، شـێواز و دەرەنجامگیرییـەکانی ڕێبازی گەشەخوازییان بە بێبایەخ دەزانی و هەوڵیان داوە بێ گرینگیـدان بـە مێـژوو، دیـاردە کۆمەڵایەتییەکان و ئەرکەکانیان لە برگەگەلێکی دیار و دەسنیشانکراو لە گۆڕانکـاریی ئـەوان تاووتوێ بکەن. لە کۆمەڵناسیدا زاراوەی فۆنکۆسـیۆن (fonction)ی فەرەنسـی و فانکشـێن (function)، بـە واتـای بەرهەمـە وەدەسـهاتووەکان و شـوێنەوارە بەرچـاوەکانی دیـاردە

کۆمەڵایەتییەکان بەکار دێت، بەم پێیە هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە تەواوی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا خاوەن کارکردێکە.

فۆنکۆسیۆنالیزم سەرەتا لەلایەن مرۆڤناسان بە شێوەی ڕێباز و شێوازێکی نوێ لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا ناسێنرا و ئەمە بەو هۆیەوە بوو کە کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی جێگەی توێژینەوەی مرۆڤناسان خاوەن مێژوویەکی دیار و ئاشکرا نەبوون و هەر ئەم بێموبالاتییە دەرحەق بە توێژینەوە لەسەر کۆمەڵگە لە ڕوانینی مێژووییەوە بوو بە هۆی ئەوەکە لە تەواوی ماوەی چەند دەیەیکە فۆنکۆسیۆنالیزم دەسەڵاتی پەیدا کردووە و بەسەر کۆمەڵناسی و مرۆڤناسیدا زاڵ بووە، نەریتی مێژووگەرێتی لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا نە گرینگییەکی لە توێژینەوە تیۆریکەکاندا هەبوو و نە لە توێژینەوە ئەزموونییەکاندا و، لەم نێوەدا سەرنجی کۆمەڵناسان تەنیا بۆ لای وەسفکردن و شیکردنەوەی پێکهاتە و ئەرك و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی چوبوو. مەبەست لە فۆنکۆسیۆن لە کۆمەڵناسیدا، ئەرك یان کارکردی هەریەك لە توخمە پێکهێنەرەکانی گشتێکی کۆمەڵایەتی لە تەواوێتی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییە دایە، بە شێوەیەك کە هەر فاکتەرێك بتوانێ پێداویستییەك لە سیستەمی کۆمەڵایەتی چارەسەر بکات و لە مانەوە و بەردەوامیی پێکهاتەی ئەو گشتەشدا بەشدارییەکی دیاری هەبێت.

زیاتر "برانیسلاو مالینۆفسکی" (B.Malinowski) و " ڕادکلیف براون" (R.Brown) مرۆڤناسانی بەریتانی، وەك دامەزرێنەرانی فۆنکۆسیۆنالیزم ناسراون. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر بمانهەوێ سەرچاوەی ئەم شێوە بیرکردنەوە و لێکدانەوەیە لە کۆمەڵگە و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وردتر دیراسە بکەین، تێدەگەین کە فۆنکۆسیۆنالیزم ڕیشەی لە ئۆرگانیسیزمی سەدەی نۆزدەهەم دایە و ئۆرگانیسیزم، خۆی، سەرچاوەی بۆ بیرکردنەوەی بیرمەندەکانی سەردەمی کۆن لە شارستانییەتەکانی وەك هیند، چین، ڕۆما، یۆنانی کۆن دەگەڕێتەوە.

لە کتێبە پیرۆزەکانی هیندی سەردەمی کۆندا هاتووە کە چوار کاستی سەرەکی لە دەم و بازوو و ڕان و پێیەکانی "بەرەهما" خولقێنراون، بۆیە جۆرێك هاوپێوەندیی ئۆرگانی (ئەندامی) لەنێوان کاستەکاندا بوونی هەیە و هەر کاستێکیش ئەرکێکی تایبەتی لەسەر شانە کە لە سەرەتای پەیدابوونییەوە بۆی دیاری کراوە. بۆ ئەوەی کە ڕێکوپێکیی ئۆرگانی بپارێزرێ ( هەروەك ئەندازەی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ ناگۆڕێن و هەریەکێکیان ئەرکێکی دیاریکراوی هەیە)، کاستەکانیش دەبێ بە هەمان شکڵی سەرەتای خۆیان بمێننەوە

و بچووکترین گۆڕانێکیان تێدا پێك نەیەت. بەهەر حاڵ، ئـەم فکـرە کـە دەوڵـەت هـەروەك بوونەوەرێکی گیاندار کار دەکا، و چینی حاکم و جەماوەی ژێردەست هەردوکیان بۆ مانەوە و بەردەوامیی ئەو بوونەوەرە، پێویستن، لە قۆناغە جیاوازەکاندا جێگـەی پەسـند و تەئییـدی ئاشکرا یان بە ئاماژەی بیرمەنـدە ئـایینی و نائایینییـەکان بـووە. ئـەفلاتوون، ئەرەسـتۆ و سیسرۆن چەن بیرمەنـدێکی کـۆنن کـە بـەراوردی نێـوان ئەندامـەکانی مـرۆڤ و سیسـتەمە کۆمەڵایەتییەکانیان کردووە و هەوڵیان داوە کە بەردەوام جـەخت لەسـەر ئـەم هاوشـێوەییە بکەنەوە. بۆ نموونە بە بـڕوای ئـەفلاتوون: " هـەروەك مرۆڤـ سـێ بـەش (توانـا)ی هەیـە، کۆمەڵیش لە سێ چین پێك دێت. چینی یەکەم حوکمڕانانن کە هێزی بیرکردنەوەن لە بەرامبەر هێزی ژیری لە لەشی مرۆڤدا کە سەنتەرەکەی لە سەر دایە. چینی دووهەم هێزی سەربازی و سوپاییەکانن کە پارێزەری هێزی تووڕەیی و دابینکەری ئارامین بۆ کۆمەڵگە و بە جێگەی دڵ یان سینگن لە لەشی مرۆڤـدا. سـێهەم چـین، چـینی بەرهەمهێنـەرانن کـە لـەجووتیاران و پیشەوەران و بازرگانان پێك دێت کە ئامرازی دابینکردنی پێداویستییە ماددییەکانن و لـە بری زگ لە جەستەی مرۆڤدان. هەموو ئەم چینانە دەبێ بۆ خەڵك و حەشیمەت کار بکـەن و لەژێر چاوەدێری و ئیرادەی دەوڵەت کە هێمای کۆمەڵە، دابن. (١٢)

لە دوو سەدەی دواییدا بـە ئیلـهام وەرگـرتن لـە فەیلەسـووفە کۆنـەکان، بیرمەنـدانی وەك ئۆگۆست کۆنت، سپێنسەر و دۆرکایم تیۆری ئۆرگانیسیزمیان لە شێوازێکی نوێ کە دواتر بـوو بە هۆی پەیدابوونی فۆنکۆسیۆنالیزم، خستەڕوو. مالینۆفسکی، مرۆڤناسی بەریتانی، کە جاری وایە وەك باوکی فۆنکۆسیۆنالیزمیش دەناسرێ، خسڵەت و داب‌ونەریتەکانی خەڵکی سـەرەتایی بە شێوەی توێژینەوەی مەیدانی دەست پێ‌کرد، پێشینیانی ناوبراو بۆ وێنە تایلۆر، سپێنسـەر و دۆرکایم، خەڵکی سەرەتاییان تەنیا لە ڕێگەی گێڕانەوەی گەڕیدە و دۆزەرەوەکـان دەناسـی و بەم هۆیەوە ناوبراو یەکەم توێژەرێکە کە لەم بابەتەدا دەستی بۆ توێژینەوەی مەیـدانی بـردووە. ئەو لە وتاری "کولتوور"دا کە زیاتر وەك مانیفێستی فۆنکۆسیۆنالیزم لەقەڵەم دەدرێت، ئـەوە دەردەخات کە بە چ شێوەیەك تەواوی شتە ماددییـەکان کـە لـە کۆمەڵگەیەکـدا کـەڵیان لـێ وەردەگـیردرێ، وەڵامـدەرەوەی پێداویسـتییە دەروونـی ـ کۆمەڵایـەتی، تکنیکـی، ئـابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی خەڵکن و ئەم شتانەش نە تەنیا شـتومەکە ماددییـەکان لـەخۆ دەگرن، بەڵکوو تەواوی ئەوە شتانەی کە کولتوور پێك دێنن ( وەك: داب‌ونەریت، یاسا و ڕێسا، پەروەردە و فێرکردن، ئایین و ...) دەگرێتەوە.

باسەکەی مالینۆفسکی لە کۆتاییدا بەوە تەواو دەبێت کە لێکدانەوەی کارکردیی کولتـوور، لە بنەمایەك سەرچاوە دەگرێت کە بە پێی ئەو لە تەواوی جۆرەکـانی شارسـتانییەتەکان، هـەر داب‌ونەریتێك، هەرشتێکی ماددی، هەر ئایدیا و بیرۆکەیـەك و هـەر بـیر و باوەڕێـك، خـاوەن ئەرکێکی حەیاتییە کە ناسێنەری بەشێکی دیاریکراو لە گشتێکی ئۆرگانیکە. ( ١٣)

گرینگترینی ئەو بنەمایانـەی کـە فۆنکۆسـیۆنالیزمی کلاسـیك پێیـان پشـت ئەسـتوورە، دەتوانرێ ئەم شێوەیە باس بکرێن:

١ـ بنەمای یەکێتیی کرداری، بەم واتایـە کـە کۆمەڵگـە پێکهـاتوو لـەو توخمانەیـە کـە یەکێتیان لەنێودا هەیە یان بە واتایەکی دیکە لە نێـوان بـەش و توخمەکانیـدا یەکگرتوویـەك بوونی هەیە.

٢ـــ بنـــەمای پێویســـتیی کـــرداری کـــە کەســـانێك بـــە دواکەوتووانـــەترین بنـــەمای فۆنکۆسیۆنالیزمی دەزانن. بە پێی ئەم بنەمایە هەر فاکتەرێکی کولتووری یان کۆمەڵایەتی بۆ کۆمەڵگە پیویستە. یان بە دەربڕینێکی دیکە تەواوی بەشەکانی سیسـتەمە کۆمەڵایەتییـەکان لە کۆمەڵگەی مرۆییدا بە هۆی پێداویستیی دیاریکراو بەدی هاتوون و بەم پێیە پێویستن.

٣ـ بنەمای گشتێتیی کرداری کە بە پێی ئەم بنەمایە هەر فاکتـەرێکی کۆمەڵایـەتی یـان کولتووری خاوەن ئەرك و کارکردێکە. بنەمای پێویستیی کرداری و گشتێتیی کرداری لە لایەن ڕۆبێرت مێرتۆن کۆمەڵناسی هاوچەرخی ئەمریکایی ڕەت کراونەتـەوە و لـە بەرامبـەردا چـوار بنەمای نوێی ناساندووە، بەم شێوەیە دەتوانرێ مێرتۆن بە فۆنکۆسیۆنالیستێك بناسرێ کە چەند سەنگ‌وسوکییەکی لەم ڕێبازەدا هێناوەتە کایەوە.

ئەو بنەمایانەی کە لە لایەن مێرتۆنەوە خراونەتەڕوو، دەکرێ بەم شێوەیە کورت بکرێنەوە:

**ئـا ـ** کارکردی شیاوبوون: هەرکات دەرەنجامەکانی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ گشت کۆمەڵگە بەسوود بن و یاریدەی بەردەوامیی و جێگیربوونی بدەن، ئاکامەکان بە گونجاو و شیاو دەناسرێن. مێرتۆن ئەم بنەمایەی بە جێگەی بنەمای پێویستیی کرداری لەقەڵەم داوە و لەم بوارەدا دەڵێت: " هەروەك فاکتەرێك بە تەنیایی دەتوانـێ چـەند ئـەرکێکی هەبێ، چەند فاکتەرێکی جیاوازیش دەتوانن ئەرکێکیان هەبێت. بەم پێیە بـە جێگـەی فاکتەرێکی کولتووری دەتوانرێ چەندین فاکتەری هاوتا دابنرێن یان بە دەستەواژەیەکی دیکە، فاکتەرێکی کولتووری دەتوانێ بە شـێوەیەکی کاریگـەرتر جێگـەی فاکتـەرێکی دیکە بگرێتەوە. بۆ نموونە هەندێك لە فۆنکۆسیۆنالیستەکان بەم شێوەیە ئاکام وەردەگرن

کە جادوو یان هەندێك لە ڕێوڕەسمەكان لەبەر ئەوەی كە لە ڕووحییە یان متمانەبەخۆكردنی باوەڕداراندا كاریگەرن، خاوەن ئەركی تایبەت بە خۆیانن بەڵام دەرەتانی ئەوەش هەیە كە ئەم جۆرە ڕێوڕەسمانە بتوانن جێگەی خۆیان بە ئەركی ئایینی شیاوتر و كاریگەرتر بدەن. (١٤)

**ب** ـ دووهەمین واتایەك كە مێرتۆن لە پێناو هەمواركردنی فۆنكۆسیۆنالیزمی كلاسیكدا خستییەڕوو، چەمكی كرداری نالەبار یان نەرێنییە. بەبۆچوونی ئەو كردارە نەرێنییەكان ئەو دەرەنجامانە لەخۆ دەگرن كە لەمپەر یان موزاحیمی پێكهاتن و ڕێكوپێكبوونی سیستەم دەبن و بە جۆرێك دەبنە هۆی لاوازیی و لەرزۆك بوونی سیستەمی كۆمەڵایەتی. بۆ نموونە ڕێز و حورمەتێك كە هەندێك لە تاقمەكان لە هیندا بۆ مانگای دادەنێن، كە لە كۆتاییدا زیانی ئابووریی بەدوای خۆیدا دێنێت.

**پ** ـ چەند چەمكێكی دیكە كە لە لایەن مێرتۆنەوە خرانەڕوو، كردارە ئاشكرا و كردارە شاراوەكانن. ناوبراو لەم بارەوە دەڵێت: " كردارە ئاشكراكان دەرەنجامە بەرچاوەكان دەگرنەخۆ كە لە ڕێكوپێكی یان هاوئاهەنگیی سیستەمدا ڕۆڵیان هەیە و لەلایەن ئەندامانی سیستەمەوە پەسند دەكرێن، بەڵام كردارە شاراوەكان ئەوانەن كە نە جێگەی داخوازیی ئەندامەكانن و نە بەشێوەی دیار بەرچاو دەكەون. (١٥)

بۆ نموونە هەركات دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی ( وەك میكانیزاسیۆنی وەرزێری یان ڕیفۆرمی زەووزار) هەر ئەو دەرەنجامە دیارانەی لێ هاتە كایەوە كە لەبەرچاو گیرابوون، كاریگەریی بەرهەمهاتووەكان بە دەرەنجامە ئاشكراكان دەناسرێن بەڵام هەر كات بەڕێوەبردنی زنجیرە ڕیفۆرمێك یان ئەنجامدانی چالاكییەكی كۆمەڵایەتی دەرەنجامێكی دیكەی بێجگە لەوەیكە لێی چاوەڕوان دەكرا، لێ بێتەدی، ئەوان دەرەنجامی شاراوە یان لاوەكی پێدەگوترێ. بۆ نموونە دەرەنجامە ئاشكراكانی دیاردەی سزادانی شۆفێرە سەرپێچیكارەكان، جێبەجێكردنی یاساكانی هاتوچۆیە. لە حاڵێكدا سزادانی سەرپێچیكاران بێجگە لەم ئەركە ئاشكرایە، كردارێكی شاراوە یان لاوەكی دیكەشی هەیە ئەویش پەیداكردنی داهات بۆ ڕێكخراوە بەرپرسەكانە. لە هەندێك لە ئەیالەتەكانی ئەمریكا بینراوە كە كاركردی لاوەكی واتە وەدەسهێنانی داهات لە سەرووی ئەركە سەرەكییەكەیە واتە پۆلیسەكانی هاتوچۆی ئەو ناوچانە لە هەوڵی ئەوەدان هەتا بكرێ ژمارەیەكی زیاتر لە شۆفێران جەریمە بكەن.(١٦)

بێجگە لە چەمکەکانی سەرەوە، مێرتۆن باسی زاراوەگەلێکی وەك کرداری نەگونجاوی ئاشکرا و کرداری گونجاوی شاراوەی کردووە. لەڕاستیدا دەتوانرێ یەکێك لە خزمەتەکانی مێرتۆن بە شیکردنەوە و شرۆڤەی گۆڕانکاریی کردووە و تا ڕادەیەك ئەم ڕێبازەی لە وەستان و نەجوولان ڕزگار کردووە.

بە سەرنجدان بەوەیکە گوترا، هەڵسووکەوتی کۆمەڵناسە کردەوەخوازەکان لەگەڵ بابەتی توێژبەندیی کۆمەڵایەتی و نایەکسانییە چینایەتییەکان بە تەواوەتی ڕوون و ئاشکرایە.

دیاردەی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕوانگەی فۆنکۆسیۆنالیستی کارێکی سروشتی، هەمووانی و خاوەن کردارە. لەسەر بنەمای ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە نایەکسانی و توێژبەندیی کۆمەڵایەتی ئامرازێکە هەتا لە کۆمەڵگەدا شیاوترین کەسەکان، باشترین شوێنگە کۆمەڵایەتییەکان بەدەستەوە بگرن و بەم شێوەیە هۆکارەکانی سازان و ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا بێنە کایەوە. بە دەربڕینێکی تر، ئەوەی کە فۆنکۆسیۆنالیزم بەدواوەیەتی، پێکهێنانی هاوسەنگی و پاراستنی دۆخی ئارامی و ڕێکوپێکی کۆمەڵایەتییە.

فۆنکۆسیۆنالیستەکان کە لەڕاستیدا پاساودەری سیستەمی سەرمایەداری ڕۆژئاوان، بڕوایان بە هەبوونی چینە کۆمەڵایەتییەکان بەو شێوەیەی کە مارکس و پەیڕەوانی باسیان لێ کردووە، نییە بەڵکوو کۆمەڵگە بە پێکهاتوو لەو توێژ و گرووپە جیاوازانە دەزانن کە دوابەدوای کارکردە جیاوازەکانی کە هەر یەکێکیان هەیەتی، جیاوازی زۆریش لە باری جیاوك (ئیمتیاز) و شوێنگە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی نێوانیان هەیە و ئەم نایەکسانییە کۆمەڵایەتی ئابوورییانە بۆ زیندوویی سیستەمی کۆمەڵایەتی و بەردەوامبوونی پێویستە.

لە لایەکی دیکەوە، بە سەرنجدان بەوەکە تاکەکانی کۆمەڵگەیەك خاوەن ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و بەهاگەلی جیاوازن، کە هەر یەکێکیان بە نۆرەی خۆی بەشداریی لە بەردەوامبوونی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا دەکات. بەم پێیە ڕۆڵە پڕبایەخ و بەنرخترەکان پاداشتی زیاتر لە کۆمەڵگە وەردەگرن و لە ئاکامدا سنووری جیاوازییە چینایەتی و نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان بە تەواوی سروشتی و پێویست خۆی دەنوێنێ. واتە لەڕاستیدا دابەشکردنی نادادپەروەرانەی پاداشت لەوەها سیستەمێکدا، دەبێتە هۆی جێگیربوون و هاوسەنگی کۆمەڵگە. بەم شێوەیە لە ڕوانگەی فۆنکۆسیۆنالیستەکان چینی کۆمەڵایەتی لە پەیوەندیی لەگەڵ بەرهەمهێناندا نییە و بابەتێکی تێپەڕیوی پەیوەندیدار بە بڕگەیەکی دیاریکراوی مێژوویی کۆمەڵگەکان نییە بەڵکوو توێژبەندیی کۆمەڵایەتی، داییمی و حەتمییە کە لەپێداویستییەکانی کۆمەڵگە سەرچاوە دەگرێ و لە کۆتاییدا لە بەرژەوەندیی تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگە دایە.

فۆنکۆسیۆنالیستەکان گرینگییەك بە ئالۆگۆڕە قووڵەکان و شۆڕشەکان نادەن لە توێژینەوەکانیاندا و تەنیا گۆڕانکارییە بچووکەکان کە پێکهاتەکە بە تەواوەتی ناگۆڕن بەڵکوو هاوسەنگییەکی نوێ لە جێگەی هاوسەنگیی پێشوو دادەنێن، لەبەرچاو دەگرن. لە فۆنکۆسیۆنالیستەکانی هاوچەرخ دەتوانین ئاماژە بە ناوی تالکۆت پارسۆنز (Talcott Parsons)، دەیویس (Davis)، موور (W-Moor) بکەین کە هەر یەکێکیان خاوەن تیۆری و بۆچوونی سەربەخۆن.

لە کۆتایی ئەم باسەدا، پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بکرێ کە بێجگە لەو تیۆرداڕێژانەی کە باسیان کرا، دەکرێ دەستەیەکی دیکەش لە کۆمەڵناسان بەوانەوە زیاد بکرێن کە لەوانەیە بتوانرێ لەژێر ناوی تیۆرداڕێژانی سەربەخۆ بناسرێن. ئەم گرووپە لە کۆمەڵناسان لە هەمان کاتدا کە مەیلی مارکسیستییان نییە، بەڵام شێوازی فۆنکۆسیۆنالیستیش ئەوان بە قەناعەت ناگەیەنێت. ماکس ڤیبەر (Max Weber) کۆمەڵناسی بەناوبانگی ئەڵمانی، مۆریس هالبواکس (Maurice Halbwachs) و لوید وارنێر (Loyd Warner) چەند کەسێك لەم کۆمەڵناسانەن کە لێرەدا ناگونجێ بە تێروتەسەلی باس لە بۆچوون و تیۆرییەکانی ئەم زانایانە بکرێت.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی سێزدەیەم


١ـ مالعه درباره طبقات اجتماعی نوشته ژرژ گورویچ ترجمه باقر پرهام ص١.

٢ـ همان کتاب ص.٣

٣ـ همان کتاب ص ٢٠٠

٤ـ همان کناب ص ٢٢٠

٥ـ جامعەشناسی طبقات اجتماعی، دکتر حسین ادیبی، ص ١٠٥

٦ـ همان کتاب ص١٧٩

٧ـ احمد اشرف، علل پیدایش نابرابریهای اجتماعی ص ٨ و ٩

٨ـ همان منبع، ص١١ به نقل از کتاب پیرسون تحت عنوان:

Karl pearson,the scope and Importance of the state in of national Eugenic.1909

٩ـ تاریخ فلسفه غرب، برتراند راسل، ترجمه نجف دریابندری، ص١١٨

١٠ـ برای بیشتر اطلاع از نظریات داروینیستهای اجتماعی رجوع کنید به: تاریخ اندیشه اجتماعی جلد ٢ نوشته بارنز و بکر ترجمه جواد یوسفیان، نشر همراه .١٣٧١

١١ـ رالف دارندروف، تضاد اجتماعی عامل دگرگونیها، دکتر منصور وثوقی، نامه پژوهشکده علوم ارطباتي و توسعه ایران سال چهارم شماره اول و دوم، بهار و تابستان ١٣٥٩، ص٢٥

١٢ـ محمد علی فروغی، سیر حکمت در اروپا، ص.٢٧

13- R.Merton. Elements de Theorie et de Methode Sociologique paris 1965.

14- Guy Rocher. Organisation Social.P.173.

١٥ـ همان مأ ص .١٧٤

١٦ـ دکتر حسین ادیبی ـ دکتر عبدالمعبود انصاری، نظریەهای جامعەشناسی، ص ٦٢ ـ ٦٠.

# بەشی چواردەیەم

## گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان

لە کاتی پەیدابوونی کۆمەڵناسییەوە هەتا ئێستا، زۆربەی کۆمەڵناسان دانیان بەم بابەتە گرینگە داناوە کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە نێو گشت دیاردە کۆمەڵایەتییەکان خاوەن گرینگی و بایەخێکی زۆرە. بەڵام تەنیا لە سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی سەدەی بیستەمدا کە باسکردن لەم بارەوە لە لایەن کۆمەڵناسانەوە گرینگییەکی جیددی پێدراوە. ئۆگست کۆنت بۆ یەکەم جار کۆمەڵناسی بۆ دوو بەشی گشتی واتە ستاتیک و دینامیك ( جێگیر و گۆڕاو) دابەش کردووە. بابەتی کۆمەڵناسی ستاتیك ڕێکوپێکی زاڵ بەسەر کۆمەڵگەیە واتە شێوازێك کە بە پێی ئەو شێوازە تاکەکانی کۆمەڵگەیەك لەنێو خۆیاندا جۆرە ڕێککەوتنێك پێك دێنن کە لەڕاستیدا بوون و بەردەوامیی ژیان و کارکردنی ئەو کۆمەڵگەیە دەستەبەر دەکات بەڵام بابەتی کۆمەڵناسی دینامیك پێشکەوتن و گەشەسەندنە واتە دیراسەی پەرەسەندنی کۆمەڵگەکان لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتی و لەڕاستیدا لەسەر بنەمای ئەم تیۆرییەیە کە ئۆگست کۆنت یاسای قۆناغە سێیانییەکان دەخاتەڕوو. لە ڕوانگەی ئەوەوە کۆمەڵناسی دینامیك زۆر گرینگتر و پڕبایەختر لە کۆمەڵناسی ستاتیکە و بەم هۆیەوە لە کتێبی خۆیدا گرینگیی زیاتری بەم لایەنە داوە.

لەنێو بیرمەندانی دیکەدا، مارکس و ئەنگێلز دەکرێ وەك خاوەن تیۆریی کۆمەڵناسیی گۆڕان لەقەڵەم بدرێن. بەڵام ئاشکرایە کە ئەم کۆمەڵناسییە دەبێ بە ڕوانین و پانتاییەکی زیاترەوە توێژینەوەی لەسەر بکرێت.

مارکس وئەنگێلز بە نیاز بوون کە ڕیشەی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگەی سەرمایەداری شرۆڤە و ڕوون بکەنەوە و پێیان وابوو کە چڕتربوونی خەباتی نێوان چینی خاوەن کەرەسە و ئامرازەکانی

بەرهەمهێنان و چینی کرێکار، دەبێتە هۆی لەناوچوون و هەڵوەشانەوەی سیستەمی سەرمایەداری و بوونی بە سیستەمێکی کۆمۆنیستی بێچین. بەرهەمە بەرچاوەکانی ژمارەیەك لە کۆمەڵناسانی بەناوبانگی جیهانیش لەسەر بنەمای ڕوانینی مێژوویی هاتوونەتە کایەوە.

لەم نێوەدا دەتوانرێ ئاماژە بە ناوی هێربێرت سپێنسەر ( خاوەنی کتێبی یاسای گۆڕانی گشتی)، دۆرکایم ( کتێبی دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتی)، زیمێل ( توێژینەوە لەبارەی دژایەتییەکان)، پاریتۆ ( گواستنەوە یان جێگۆڕکێی بژاردەکان)، ماکس ڤیبەر ( کاریگەرییەکانی بونیادی مێژوویی) بکەین.

لە سێ دەیەی دواییدا حەزێك لەلای کۆمەڵناسان لە بواری تاووتوێی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا بەرچاو دەکەوێت. ئەم حەزە دەتوانرێ بە سەرچاوەگرتوو لەم سێ فاکتەرەی خوارەوە بزانرێ:

ئا ـ ڕابوونی جیهانی سێهەم: هەوڵی وڵاتانی جیهانی سێهەم بۆ ڕزگاربوون لە دواکەوتوویی، گۆڕانکارییە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان پێك هاتووە کە لەم وڵاتانەدا سەرنجی زۆر لە کۆمەڵناسانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە.

ب ـ قەیران لە وڵاتانی پێشکەوتوو: لە دوای شەڕی جیهانیی دووەم، کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان لەگەڵ قەیرانگەلی سەرەکی و قووڵ ڕووبەڕوو بوونەوە و شێوازگەلی نوێ لە ئایدۆلۆژیا توندڕەوەکان سەریان هەڵداوە. گرووپگەلێك لە چەپ و ڕاست بۆ جێگیرکردنی نەزمێکی نوێ دەستیان بۆ توندوتیژی و توندڕەوی برد. لاوەکان وەك نارەزایەتی بەکۆمەڵگەی پیشەسازی ڕاوەستاو لەسەر دیوانسالاری و سەرمایەداری و بە لایەنگری لە کۆمەڵناسییەکی ڕاوەستاو لەسەر دادپەروەری دەستیان دایە شۆڕش. دژبەیەکیی توندی بەهاکان، پێداچوونەوە بە ئایدۆلۆژیاکانی حاکم و گۆڕانکاریی بونیادیش لە دیاردە سەرهەڵدراوەکانی دیکەی ئەم چاخە لەقەڵەم دەدرێن.

ج ـ کاریگەریی کۆمەڵناسیی مارکس: هەتا چەند دەیەی پێشوو ژمارەیەکی زۆر کەم لە کۆمەڵناسان بەشداری و نفووزی مارکسیان لە بیروڕاکانی مێژووی کۆمەڵناسیدا قبووڵ بوو. مارکسیان وەك فەیلەسووف یان ڕیفۆرمخوازێك دەناسی بەڵام نەك وەك کۆمەڵناسێك، لە حاڵێکدا ئەمڕۆکە کۆمەڵناسانی ئەمڕۆیی بە مارکسیست و غەیرە مارکسیستەوە هەوڵیان داوە کە شێوازی بیرکردنەوەی مارکس بناسن و شی بکەنەوە. بەم شێوەیە کۆمەڵناسیی مارکس، لە ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵناسان حەزێکی نوێی لە بواری تاووتوێی کێشە و بابەتە تیۆریك و ئەزموونییەکان لە پەیوەندیی لەگەڵ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانی وەك خەباتی چینایەتی، بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان و گۆڕانکاریی پێکهاتەیی کۆمەڵگە ... بەدی هێنا.

## گۆڕانی کۆمەڵایەتی

گۆڕانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە دیاردەگەلێکی شیاوی دیتن، تاوتوێکردن و هەڵسەنگاندن لە ماوەیەکی کورتی زەمەنیدا، بە شێوەیەك کە هەر تاکێکیش لە ماوەی ژیان خۆی یان لە ماوەیەکی کورتی ژیانیدا دەتوانێ وەشوێن گۆڕانێك بکەوێ، دەرەنجامە مسۆگەرەکەی ببینێ یان لە دەرەنجامە کاتییەکەی تێبگات. بێجگە لەمەش گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەتوانرێ لە چوارچێوەی ژینگەیەکی جوگرافی و کۆمەڵێکی دیاریکراودا بێتەدی. ( واتە گۆڕان لە پێکهاتە و بونیادی کۆمەڵگە یان ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی بچووك یان گەورەدا)

## چ دیاردەگەلێك بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دەدرێن

یەکەم ئەوەکە گۆڕانی کۆمەڵایەتی حەتمەن دیاردەیەکی گشتییە. بە دەستەواژەیەکی دیکە گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەبێ کۆمەڵگەیەك یان بەشێکی گرینگ لەو کۆمەڵگەیە بگرێتەوە. گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەبێ بارودۆخەکان، شێوازی ژیان یان بواری هزری و ڕوحی بەشێکی بەربلاو لە کۆمەڵگەیەك بگرێتەوە واتە گۆڕان بەسەر زۆر زیاتر لە چەند کەس دابێنێ و ئەمە بنەمایەکی گرینگە بۆ دەستنیشانکردنی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی.

دووهەم ئەوەکە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی دەبێ گۆڕانێکی پێکهاتەیی بێ واتە گۆڕانێك کە لە گشت ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی ( واتە سەرتاپای ڕێکخراوەکە) یان لەهەندێك لە بەشە پێکهێنەرەکانی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیدا بێتەدی. بۆ نموونە مانگرتنێك لەوانەیە ببێتە هۆی باشتربوونی ڕەوشی مافەکانی کرێکاران و چوونەسەری ئاستی بژیوی ئەوان کە ئەمە گۆڕانێکی پێکهاتەیی نییە. بەڵام ئەگەر بتوانرێ هەندێك لەو گۆڕانکارییانەی کە ئەم مانگرتنە لە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی کارخانە یان دامەزراوەیەکی پەیوەندیداردا بیهێنێتە کایەوە، بۆ نموونە گۆڕان لە دابەشکردنی دەسەڵات، گۆڕان لە تۆڕی پەیوەندیی و ... بەرچاو بکەوێ، ئەوکات دەتوانین بڵێین گۆڕانی کۆمەڵایەتی هاتۆتە کایەوە.

سێهەم ئەوەکە گۆڕانی پێکهاتەیی لە درێژایی زەمەن و تێپەڕینی کاتدا دەناسرێت. بە دەستەواژەیەکی دیکە دەبێ بتوانرێ لەنێوان دوو خاڵ یان چەند بڕگەیەکی زەمەنی، کۆمەڵێك گۆڕانکاریی یان دەرەنجامەکانیان ببینین. بۆ نموونە لە نێوان ( t1 و t2 و t3 ) و لەڕاستیدا

گۆڕانی کۆمەڵایەتی تەنیا بە بەراورد لەگەڵ خاڵی دەسپێك یان سەرچاوە لە ڕابردوودا دەتوانرێ تاوتوێ و هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێ و بە سەرنجدان بەم خاڵی دەسپێکەیە کە دەتوانرێ بگوترێ گۆڕانێك ڕووی داوە و پانتایی و چلۆنایەتی ئەم گۆڕانەش تاوتوێ بکرێ.

چوارەم ئەوەکە گۆڕانی کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەی کە بەڕاستی گۆڕانێکی پێکهاتەیی بێ، دەبێ بەردەوام و جێگیر بێ. بە دەربڕینێکی دیکە تەنیا ڕووکەش و کاتیی نەبێ.

سەرەنجام بە سەرنجدان بەو چوار تایبەتمەندییە، دەتوانین بە کورتی بڵێین کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی کاریگەریی لەسەر ڕەوتی مێژوویی کۆمەڵگەیەك دادەنێ. بە واتایەکی دیکە ئەگەر گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی تایبەت ڕووی نەدابایە، کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو ڕەوتێکی جیاوازی تێپەڕ دەرکرد و ئاراستەیەکی جیاوازی وەردەگرت.

## هۆکارەکان، بارودۆخەکان و جێبەجێکارانی گۆڕان

ـ هۆکاری گۆڕان لەڕاستیدا فاکتەرێکە کە دەبێتە هۆی گۆڕانێك، یان گۆڕانێك دێنێتە کایەوە. بۆ نموونە هاتنی تکنیکی نوێ بۆ کارگەیەك دەتوانێ چەند گۆڕانکارییەك لە شێوازی کار، لە ڕێکخستنی گرووپەکان، لە ئاستی بەڕێوەبەرایەتی و ... پێك بێنێ و هەر بەم پێودانگە دامەزرانی کارگەیەك لە ناوچەیەکی گوندنشین چەند گۆڕانکارییەك لە بازاڕی کار و بزاوتی کۆمەڵایەتیی حەشیمەت دێنێتەدی کە دەرەنجامەکەی گۆڕانکاریی لە داب و دەستوور و ئاکار و کولتوور و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی گوندەکەیە. هەروەها ئەنجامدانی ڕیفۆرمی زەویوزار لە کۆمەڵگەی گوندنشینی گۆڕانکاریی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی بەربڵاو بەدوای خۆیدا دێنێ. ئەم تکنیك و کارگە و ریفۆرمی زەویوزارە بە هۆکارەکانی گۆڕان لەقەڵەم دەدرێن.

ـ بارودۆخەکانی گۆڕان ئەو فاکتەرە گونجاو یان نەگونجاوانەن کە کاریگەری یان کاریگەرییەکانی هۆکار یان هۆکارەکانی گۆڕان، چالاکتر، لەسەرەخۆتر، توندتر یان لاوازتر دەکەن.

سەبارەت بە نموونەکەی پێشوو، ئەگەر شێوازی هەڵسوکەوتی سەندیکا لە بەرامبەر گۆڕان لەبەرچاو بگرین، ڕوانینێك کە سەندیکا سەبارەت بە گۆڕان هەیەتی و گواستنەوەی ئەم ڕوانین و بیرۆکەیە بۆ کرێکاران بەو بارودۆخانە دێنە ئەژمار کە لەوانەیە سەبارەت بەو گۆڕانانەی بە هۆی تکنیکە نوێیەکان دێنەدی، گونجاو یان نەگونجاو بن و هەر بەم پێودانگە لە ژینگەی گوندنشینی هەموو ئەو کردەوە و پەرچەکردارەکانی کە دەبێتە هۆی پێشوەچوون یان ڕاوەستان

لە ڕیفۆرمی زەوی و زاردا، بە بارودۆخی گونجاو یان نەگونجاو دێنە ئەژمار و لەڕاستیدا دەتوانرێ بەو ئاکامە بگەین کە هۆکارەکان و بارودۆخەکانی گۆڕان تەواوکەری یەکترن.

جێبەجێکارانی گۆڕان: ئەو کەس یان یان گرووپ یان ئەنجوومەنانە دەگرێتەوە کە گۆڕانەکە دێنن، پێشوازی لێ دەکەن یان دژایەتی دەکەن. جێبەجێکاران بە دوو دەستە دابەش دەبن:

ئا: مژدەدەرانی گۆڕان/ ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە فکر و هزری گۆڕانەکە دادێنن. ( ئایدیۆلۆگ و تیۆریسێنەکان)

ب: بانگەشەکاران یان برەوپێدەرانی گۆڕان/ ئەو کەس، گرووپ یان ئەنجوومەنانەن کە پەرە بە بیرۆکەیەك دەدەن یان بانگەشەی بۆ دەکەن.

## تیۆرییەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی

تیۆرییەکانی پەیوەندیدار بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەتوانرێ بە شێوەی جۆراوجۆر پۆلێنبەندی بکرێن کە بەناوبانگترینیان جیاکردنەوەی ئەم تیۆرییانە لەدوو دەستەی تیۆرییە هێڵی و تیۆرییە بازنەییەکانە.

مەبەست لە تیۆری هێڵی (گەشەسەندن) ڕوونکردنەوەی جووڵەی کۆمەڵگە لەسەر هێڵێکی ڕاستەوخۆ و تێپەڕین لە قۆناغگەلێکە کە لە کۆتاییدا بە خاڵێکی بەرزی پێش بینیکراو دەگات و تیۆریی بازنەیی ڕوونکردنەوەی جووڵەی کۆمەڵگە بە شێوەیەکە کە شارستانییەت لە قۆناغەکانی پەیدابوون، گەشە، کامڵبوون بە لەناوچوون دەگات و بە دەربڕینێکی دیکە دووپاتبوونەوەی مێژووی تێدا بەرچاو دەکەوێت.

لەنێو تیۆرییە هێڵییەکان، ئاماژە دەکەین بە تیۆرییەکانی ئۆگۆست کۆنت و مارکس کە بایەخێکی زیاتریان هەیە:

تیۆری هێڵیی ئۆگست کۆنت دەتوانین لە "یاسای قۆناغە سێیانەییەکان"ی ناوبراودا ببینین، کە ڕەوتی گەشەسەندنی بیرکردنەوەی مرۆڤ لە قۆناغی یەزدانی بۆ قۆناغی میتافیزیکی و لە کۆتاییدا بۆ قۆناغی پۆزێتیڤ تاوتوێ دەکات. لەڕاستیدا قانوونە سێ قۆناغییەکەی ئۆگست کۆنت لایەنێکی زەینگەرا و ئایدیالیستی هەیە و لەگەڵ ئەمەشدا ناوبراو هەریەك لە قۆناغەکانی گۆڕانی هزریی مرۆڤی بە جۆرێك ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتداریێتیی سیاسی تایبەتی ئەو قۆناغە بەستۆتەوە کە پێشتر لە مێژووی کۆمەڵناسیدا ئاماژەمان پێ‌کردن.

وادیاره ڕوانگەی ئۆگست کۆنت لە خستنەڕووی یاسای گەشەسەندندا پەیوەستە بەو گۆڕانکاریانەی کە لە ئەورووپادا هاتوونەتە کایەوە. چونکە هەر یەك لە قۆناغەکان لەگەڵ بڕگەیەکی زەمەنی تایبەت لە مێژووی ئەورووپا بەراورد دەکات. لە لایەکی دیکەوە، ئیددیعای ناوبراو لەسەر ئەو بنەمایە کە دۆزینەوەی یاساکانی گەشەی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی مرۆیی، گریمانەکەی سەبارەت بە کاریگەریی گەشەی هزری لەسەر بیروڕا ئەخلاقییەکان و هەروەها ئیددیعاکەی سەبارەت بە بەراوردکردنی خەملێنراوی مەعریفە لە هەر قۆناغێکدا لەگەڵ جۆی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بێ‌ئەوەی کە بەڵگەیەکی ورد وەها شتێك پشت ڕاست بکاتەوە، جێگەی شك و گومانی زۆرە. بە تایبەت ئەوەکە ئۆگست کۆنت لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا لەژێر کاریگەریی هەست و سۆزەکان، ڕێبازێکی بە ناوی ڕێبازی ئینسانییەت ( مرۆڤدۆستی) دامەزراند و ڕووی لە عیرفان کرد و لە بنەماکانی پۆزێتیڤیزمی خۆی دوور کەوتەوە، کە ئەم وەرسووڕانە هزرییە لەڕاستیدا لەگەڵ فەلسەفەی ئەزموونی یان پۆزێتیڤی ناوبراو تەباییەکی نییە.

تیۆری گۆڕانی کۆمەڵایەتی مارکسیش تیۆرییەکی هێڵییە کە دوو فاکتەری ژیانی کۆمەڵایەتی تێیدا جێگەیەکی تایبەتیان هەیە: گەشەسەندنی تەکنۆلۆژیا ( هێزەکانی بەرهەمهێنان) و پەیوەندییەکانی نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان. لەسەر بنەمای ئەم تیۆرییە، کۆمەڵگەی مرۆیی لە قۆناغەکانی کۆمەڵگەی ئیشتراکیی سەرەتایی، کۆیلەداری، فیۆدالی، سەرمایەداری ( بۆرژوازی) تێپەڕ دەبێت و دوای گەیشتن بە سۆسیالیزم لە کۆتاییدا بە کۆمەڵگەی بێ‌چین ( کۆمۆنیزم) دەگات. ڕەوتی گۆڕانی هێڵیی مارکس دوای چەند گۆڕانکارییەك لە چەند دەیەی دواییدا بە تایبەت دوای شۆڕشی چین تووشی خواری و نزمی و لە دەیەی ١٩٦٠ بەم لاوە بەدوای هاتنەئارای "ڕێبازی گەشەی غەیری سەرمایەداری" لەلایەن تیۆریسێنەکانی وەك ئاندریف و ئۆلیانۆفسکی و لە کۆتاییدا لێك هەڵوەشانی بلۆکی ڕۆژهەڵات، ئیعتیبار و بایەخی خۆی لەدەست دا.

لەنێو ئەو خاوەنڕایانەی کە خاوەنی تیۆری بازنەیی یان سووڕانەوەیین، دەتوانین ئاماژە بە ئیبن خەلدوون و پاریتۆ بکەین:

ئیبن خەلدوون لە کتێبی "مقدمە"ی خۆیدا پێی وایە کە شارستانییەتەکان دەسپێك و کۆتاییەکیان هەیە و گۆڕانکارییەکانیان بە شێوەی دەورانییە. ناوبراو " دەمارگیری" بە هۆکاری سەرەکی گۆڕانکارییەکان دەزانێ کە لەخەڵکی سەحرانشینندا زیاتر لە خەڵکی یەکجێ نشینە.

ئیبن خەلدوون پێی وایە کە کۆمەڵگەکان قۆناغەکانی هێرشکردن، بەرزترین پلە(گەیشتن بە لوتکە)، بەشکۆیی (گەورەیی)، ستەمکاری و لەناوچوون تێپەڕ دەکەن و پشت سەری یەك مێژوو دووپات دەبێتەوە.

"پـــاریتۆ" بیرمـەنـــدی ئیتـــاڵی ڕۆڵـــی ئیٚلیتـــەکان یـــان بـــژاردەکانی لـــە گۆڕانکارییـــە کۆمەڵایەتییەکان تاووتویٚ کردووە و گرینگترین بۆچوونەکانی ناوبراو لەم بوارەدا بەم شێوەیەیە:

ــ بەستراوەبوون بە چینی بژاردەکان حەتمەن میراتی نییە.

ــ مناڵەکان تەواوی تایبەتمەندییە جیاوازەکانی باوك و دایکی خۆیان نییە.

ــ بەردەوام جۆرێك جێگۆڕکێی بژاردە کۆنەکان لەلایەن بژاردە نوێیەکان ئەنجام دەدرێت کـە لە چینە نزمەکانی کۆمەڵگەن.

ــ لە حاڵەتێکدا کە ئەم سووڕانە بەبیٚ ڕاوەستانەی بژاردەکان بێتەدی، دەبێتە هۆی جۆرێك هاوسەنگی لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و لە بارودۆخێکدا کە ئـەم ڕەوتـە جووڵەیـەکی زۆر لـە بیروڕاکاندا بێنێتـەدی، هاوکـات دەبێتـە هـۆی گۆڕانکـاریی کۆمەڵایـەتی چـونکە سـووڕانی بژاردەکان بەدوای خۆیدا سووڕان یان گەڕانی ئایدیاکانیشی بەدواوە دەبێت. پاریتۆ لە کتێبی " زەیـن و کۆمەڵگـە" لـە چوارچـێوەی " سـووڕانەوەی بـژاردەکان" لێکدانەوەیـەك لـە مێـژوو دەخاتەڕوو کە پێی وایە هەر گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی لە خەباتی گرووپـەکان لەسـەر دەسـەڵاتی سیاسی بەرهەم دێت و بەم شێوەیە ئێمە بە بەردەوامیی شایەتی قۆناغگەلی زۆر دژواریـن کـە دەسەڵات لەلایەن گرووپێکی نوێی هەڵبژێردراو کە بە تازەیی سەرکەوتووە، پیـادە دەکرێـت و دواتر بە قۆناغگەلی ئارامتر و ئینسانیتر دەگەین کە پیادەکردنی دەسەڵات لە لایەن گرووپێکی هەڵبژێردراو لە قـوولایی کۆمەڵگـەوە جێبـەجیٚ دەبێـت... بـەم شـێوەیە پـاریتۆ لـە تیـۆری سووڕانەوەی بژاردەکان باڵادەستیی و حاکمییەتی بۆماوەیی خانەدان و نەجیبەکان دەخاتـە بـەر گومان و پێی وابوو کە باڵادەستیی یان حاکمییەت تەنیا بۆ کەسانێك دەگەڕێتەوە کە لە بـاری چۆنایەتی و هەم لە باری بابەتیبوونەوە باڵاترن و سووڕانەوەی بژاردەکان لە ڕوانگەی ئەوەوە لـە هەمان کاتدا هەم واقعییەتێکی بابەتییانە و هەم هۆکارێکە کە بە هۆیـەوە کۆمەڵگەیـەك بـە شێوەی سروشتی درێژە بە هەبوونی خۆی دەدا و بەرەوپێش دەچێت.

" ئارنۆڵد توین بی" و سوروکین و ئیشـپینگلێر"یش بـە چـەند کـەس لـەو بیرمەندانـە دەناسرێن کە خاوەن تیۆریگەلی بازنەیین.

## ڕۆڵی تەکنۆلۆژیا و ئایدۆلۆژیا لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا

### ئا ـ تەکنۆلۆژیا

شۆڕشی تەکنۆلۆژیا پڕۆسەیەکە کە لە دوو سەدە پێشەوە هەتا ئێستا زۆر گۆڕانگاریی قووڵی لە جیهاندا بەدی هێناوە. پرۆسەی بەپیشەسازیبوون، پەرەسەندنی شارنشینی، زیادبوونی بەرهەمیهێنان، گەشەسەندنی ئامرازەکانی پەیوەندیی و ... تەنیا بە سیما دەرەکییەکان یان دیاردە ڕواڵەتییەکانی شۆڕشی پیشەسازی لەقەڵەم دەدرێن. ژیانی خێزانی، ژیانی ئایینی، ئەدەبیات، هونەر، ئاراستە سیاسییەکان و ... هەموویان بە قووڵی و بە خێرایی لە ماوەیەکی زەمەنی زۆر کورتدا گۆڕانکارییان بەسەردا هات و هەنووکەش شۆڕشی تەکنۆلۆژێك هەر درێژەی هەیە: گۆڕان بەسەر کۆمەڵگەی گوندنشینیدا دێنێت، کولتووری نەریتی کۆن لێك هەڵدەوەشێنێ و ڕێگەی گەشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی بۆ وڵاتان ئاوەڵا دەکاتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئامرازەکانی پەیوەندیی گشتی بەسەر ژیانی تایبەتی و کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ئێمەدا سەیتەرەی پەیدا کردووە و ئێستا سیستەمێکی بەهێز لە ماهوارەکان گۆی زەوییان داگرتووە  کە لە شێوازێکی بەربڵاو لە پەیوەندیی ڕێگەی دوور نە تەنیا دەرەتانی پەیوەندیی خێرا و دەسبەجێ لەگەڵ هەموو ناوچەکانی جیهان دەدات، بەڵکوو دەتوانێ زانیاریگەلی جۆراوجۆر بخاتە بەردەستی ئێمە. بەم پێیە شۆڕشی تەکنۆلۆژیك بەم زووانە کۆتایی پێنایەت و درێژەکێشانی شتێکی حەتمییە.

"هێنری ژان" کۆمەڵناسی بەلجیکی، پێشکەوتنە تکنیکییەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی لە پێنج قۆناغدا تاوتوێ کردووە و بۆ هەر یەك لە قۆناغەکان هەندێك تایبەتمەندیی لەبەرچاو گرتووە کە لە خوارەوە هەر یەکێکیان شرۆڤە دەکەین:

#### ١ـ قۆناغی بەرد ئامرازی

ئەم سەردەمە بە ئامرازە زۆر قەدیمییەکان و کەڵك وەرگرتن لە ماددە سەرەتاییەکانی وەك دار، ئێسك، بەردی ئاگرکەرەوە و... دەناسرێتەوە. بەم پێیە ئابووری لەم قۆناغەدا بەناچار ئابوورییەکی ناوچەییە، ئاڵوگۆڕ سنووردارە و ڕاندومانی وەبەرهێنان (بەهرەی کار) زۆر نزمە، بە واتایەکی دیکە ئابووری گوزەران باڵادەستە، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی زاڵ خێزان و کلان (clan)ـە. ڕیکخراوی سیاسی کەم تا زۆر گەشەسەندوویە و لەدەست ڕیش سپییەکان دایە.

بیرکردنەوەی مرۆڤ زیاتر لەژێر کاریگەریی هۆکارە بان سروشتییەکان دایە و بە دەستەواژەیەکی دیکە بیرکردنەوەی جادوویی بەسەر کۆمەڵگەدا زاڵە. لەڕاستیدا کۆمەڵگە لەم سەردەمەدا، کۆمەڵگەیەکی کەونارایە کە خاوەن ژینگەیەکی سروشتی دەست لێنەدراوە و خاوەن جۆرێك یەکدەستی و هاوشێوەیی و وێکچوونێکی تەواوە.

**٢ـ قۆناغی مرۆڤ ئامرازی**

لەم سەردەمەدا، سەرەکیترین داهێنانە تکنیکییەکان لەلایەك پەیوەندیی بە کەڵك وەرگرتن لە ئاسنەواڵەکان بۆ سازکردنی ئامراز و کەرەسەکان هەیە و لەلایەکی دیکەشەوە پەنابردن بۆ شێوازی کۆیلەداری لە پانتاییەکی بەرفراواندا جێبەجێ دەبێت. کۆیلە لەم سەردەمەدا هەم وەك هێزی کار دێتە ئەژمار و هەم وەك شتێك لە ڕیزی ئامرازەکاندا جێدەگرێت. لەڕاستیدا ئەم گەشەسەندنە دولایەنە تکنیکییە ( واتە کەڵك وەرگرتن لە ئاسنەواڵە و کۆیلە) دەرەنجامی زۆر گرینگ و بەرچاوی بەدواوە بوو. یەکەم ئەوەکە بە هۆی بەکارهێنانی ئامرازە نوێیەکانی وەرزێری و کەڵك وەرگرتن لە هێزی کاری هەرزان و زۆر، وەرزێری پێشکەوتنی زۆری بەخۆیەوە دیت و ڕاندمانی بەرهەمهێنان زیادی کرد. دووەم ئەوەکە بە هۆی چوونەسەری بەرهەمی کاری وەرزێری و پەرەسەندنی کەرەسەکانی گواستنەوە  کە خۆی دەرەنجامی داهێنانی عەرەبانە و گەمیەی بادەوانییە، بازرگانی برەوی سەند. سێهەم ئەوەکە لە قەراخ چۆمەکان و لێواری دەریاکان، شارەکان دروست بوون. چوارەم ئەوەکە ڕێکخراوە سیاسییەکان پێك هاتن و دەوڵەتشارەکان و سەرەنجام ئێمپڕاتۆرییەکان دروست بوون. پێنجەم ئەوەکە، بیرکردنەوەی عەقڵانی، بە تایبەت لە شکڵی فەلسەفیدا دەرکەوتن بەڵام بیرکردنەوەی گشتی بە توندی بە هەمان شێوازی جادوویی و بان سروشتی مایەوە و سەرەنجام شەشەم ئەوەکە ژیان و گوزەرانی گوندنشینی، شێوازی زاڵی ژیان و گوزەران پێك دێنێ بەڵام ناوەندەکانی شاریش ڕۆڵی سیاسی و ئابووری بەرچاویان دەگێڕا.

**٣ـ قۆناغی پێش پیشەسازی**

ئەم قۆناغە لە سەدەی دەیەمی زایینییەوە دەستی پێکردووە و هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەیەم درێژەی هەبووە. بە درێژایی ئەم قۆناغە ئامادەکارییەکانی شۆڕشی پیشەسازی بەرەبەرە و بە هێواشی دابین دەبن. دەتوانرێ ئەم قۆناغە بە داهێنانە تەکنۆلۆژیکییەکانی خوارەوە دیاری بکرێت:

١ـ کەڵك وەرگرتن لە ئاو و لە با، بە تایبەت لە ئاش (ئاسیاو) و لە کەشتی و بەلەمدا

٢ـ کەڵك وەرگرتن لە ئاژەڵگەلێکی وەك ئەسپ، مانگا، وشتر، فیل بە جێگەی کۆیلە.

٣ـ داهێنانی چاپ و ساعەت ( کاتژمێر) کە هەردوو ئامرازەکە، کاریگـەریی زۆریـان لـە ژیانی کۆمەڵایەتیـدا هـەبووە. لـەم چـاخەدا ئـابووری لەسـەر بنـەمای وەرزێرییـە و جۆرێـك سەرمایەداریی بازرگانی دەردەکەوێ و گەشە دەستێنێ کە چوارچێوەکەی بۆ دەرەوەی سـنوور و بازاڕە بازرگانییەکانی ئەو سەردەم دەکێشرێ. لە شارەکان، پەرەسەندنی پیشەسـازیی دەسـتی، پێکهێنانی گرووپەکان و یەکەمین یەکێتییە کرێکارییەکان و سەرهەڵدانی یەکـەمین جۆرەکـانی چینی کرێکاری شاری دێتە کایەوە. سیستەمی سیاسی لە جۆری فیۆداڵییە و کە بە سیستەمی پاشایەتی ڕەها پشت ئەستوورە.

## ٤ـ قۆناغی گەشەسەندنی پیشەسازی

ئەم قۆناغە لە شۆڕشی پیشەسازییەوە دەست پێدەکات و هەتا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم درێژە دەکێشێ. لە باری پێشکەوتنی تکنیکی ئەم سەردەمە بە زیادبوونی خەڵووزەبەردینـە و ئاسن دەناسرێتەوە. سەرچاوەی نوێی وزە خەڵووزەبەردینە و هەڵمە کە لە ئامرازەکاندا شۆڕشێك دێنێتە کایەوە و دەبێتە هۆی داهێنانی ماشێنە پیشەسازییەکان و هەر لەم قۆناغەشدا، ئاسـن لە ئامرازەکان و کەرەسەکانی گواستنەوەدا جێگەی دار دەگرێتەوە.

دەتوانرێ تایبەتمەندییەکانی تری ئەم قۆناغە بەم شێوەیە کورت بکرێنەوە:

ـــ کاپیتالیزمی پیشەسازی و ڕاوەستاو لەسەر کێبەرکێ، جێگەی کاپیتـالیزمی بازرگـانی دەگرێتەوە.

ـــ دەسەڵاتی سیاسی، بەهاوکاری دیمۆکراسیی پەرلەمانی لە سیستەمی ڕاوەسـتاو لەسـەر ئاریستۆکراسیی کۆن، بۆ بورژوازی دەگوازرێتەوە.

ـــ ئایدۆلۆژییـە بـەرزە کۆمەڵایەتییـەکانی وەك لیبرالیـزم، سۆسـیالیزم، کۆمـۆنیزم سـەر هەڵدەدەن.

## ٥ـ قۆناغی تکنیکیی نوێ (نوێ تکنیکی)

قۆناغی نوێ تکنیکی سەردەمێکە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەسـت پێدەکـات. دەکرێ بەم شێوەیە باس لە هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم قۆناغە بکەین:

ـــ سەرچاوە نوێیەکانی وزە وەك کارەبا، نەوت، گاز، ئـەتۆم کـەڵکیان لێـوەردەگیرێ. ئـەم سەرچاوانە بوونە هۆی زیادبوون، فرەچەشنی و ئوتوماتیك بوونی ماشێنەکان.

ـــ کیمیا بە داهێنـانی ماددەگـەلی ناسـاکار و ئـاڵۆز، کـودە کیمیاییـەکان، جلوبـەرگ، چیمەنتۆ، پلاستیك و ... شۆڕشێکی لە ماددە سەرەتاییەکاندا پێك هێنا.

ـــ کاپیتالیزمی پیشەیی بەدوای خۆیدا کاپیتالیزمی دارایی هێنایە کایەوە و کۆمەڵگە گەورە پاوانخوازەکان جێگەی کاپیتالیزمی کێبەرکێیان گرتەوە.
ـــ دوو جۆر پێکهاتەی سیاسی باڵادەست دەبن:
١ـ دیمۆکراسی ڕۆژئاوایی یان دیمۆکراسی پەرلەمانی
٢ـ سیستەمی کومۆنیستی یەك حیزبی.
لەم سەردەمەدا لەڕاستیدا دەتوانرێ بگوترێ کە کۆمەڵگەی وەبەرهێنان جێگەی خۆی بە کۆمەڵگەی بەکارهێنەر دەدات.

## ب ـ ئایدۆلۆژیا

لەوانەیە کورتترین پێناسەیەك کە بتوانرێ بۆ ئایدۆلۆژیا بخرێتەڕوو، ئەوە بێ: ئایدۆلۆژیا جۆرێك هۆشیاری و خودئاگاییە.
پێناسەیەکی دیکە ئەوەیە کە ئایدۆلۆژیا بە سیستەمێك لە ئایدیا ( بیرۆکە) و دادوەرییە ڕوون و ئاشکراکان و بە گشتی ڕێکخراو بزانین کە شوێنگەی گرووپێك یان کۆمەڵگەیەك ئاراستە و شرۆڤە دەکات.
ئەم سیستەمە بە ئیلهام وەرگرتن لە بەهاکان، ڕێڕەوێکی ڕوون و دیاریکراو بۆ کردە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو گرووپ یان کۆمەڵگەیە پێشنیار دەکات و دەخاتەڕوو. بەم پێیە لەسەر بنەمای پێناسەی سەرەوە، ئایدۆلۆژیا لە ناوەوەی کولتوورێکدا وەك گشتێکی تەواو پێکەوە بەستراو، هاوئاهەنگ و ڕێکخراو لە تێگەیشتنەکان و پێشکەشکردنی بیروڕاکان لەقەڵەم دەدرێت و بەم هۆیەوە دەتوانرێ وەك سیستەمێك ناو بنرێت و لە لایەکی دیکەشەوە بە لەبەرچاوگرتنی سروشت و جەوهەری ئەوەکە درخەر و نیشاندەری بیر و بۆچوونەکانە، ئایدۆلۆژیا وەك ئامرازی کردەی مێژوییش دێتە ئەژمار. بە دەستەواژەیەکی دیکە، ئایدۆلۆژی لە لایەن مژدەدەران و کەسانێك کە هەوڵ دەدەن لەسەر ڕەوتی مێژوویی کۆمەڵگەی خۆیان شوێندانەر بن، دەخرێتەڕوو و پەرەی پێدەدرێت و بەم شێوەیە دەبێتە هۆی هاتنەئارای گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگەدا.
ئایدۆلۆژیا ئەم دەرفەتە بە تاکەکانی کۆمەڵگەیەك دەبەخشێ کە شوێنگەی خۆیان باشتر پێناسە بکەن و باشتر لە مانا و واتاکەی تێبگەن. ئایدۆلۆژیا پێیان دەڵێت کە بۆچی و لە لایەن

چ کەسانێکەوە دەچەوسێنرێنەوە، بۆ دواکەوتوون؟ بۆچی سپییەکان خۆیان پێ باشترە، بۆ دەبێ بۆ باشترکردنی بارودۆخی خەڵك و کۆمەڵگە هەندێك گۆڕانکاریی بێتە ئاراوە و ...

دەتوانرێ تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئایدۆلۆژیا بەم شێوەیە کورت بکرێنەوە:

ـــ بە سەرنجدان بەم بابەتە کە ئایدۆلۆژیا سیستەمێك لە ئایدیا و دادوەرییەکانە، پەیوەندیی لەگەڵ بەرژەوەندییە تاکەکەسی و گشتییەکان هەیە واتە بەرژەوەندیی کەسانێك کە دەیانهەوێ پێگە و شوێنگەی خۆیان بپارێزن یان کەسانێك کە دەیانهەوێ شوێنگەی خۆیان باشتر بکەن و بەم شێوەیە ئایدۆلۆژیا بە پێی ئەو قازانجەی کە بۆ تاکەکانی هەیە، دۆخە ئاراییەکان پشتڕاست دەکاتەوە یان ڕەخنەیان لێدەگرێت.

ـــ ئایدۆلۆژیا بەدیهێنەری دیاردەیەکی گشتی بە نێوی "ئێمە" یە. بەم شێوەیە کە خەڵك بۆ گردبوونەوە لە کۆڕێکدا بانگهێشت دەکات، واتە شوێنێك کە تاکەکان دەتوانن یەکتر بناسن و ڕووحیە و هەستێکی بەهێز وەدەست بێنن. لێرەدا " ئێمە" دەتوانێ چینێکی کۆمەڵایەتی، حیزبێکی سیاسی، نەتەوەیەك یان بزاڤێکی کۆمەڵایەتی یان دیاردەیەکی تری لەم شێوەیە بێت. "ئێمە" لە ئایدۆلۆژیادا زۆربەی کاتەکان وەها سادە و دیاریکراوە کە تاکەکان دەتوانن لەگەڵ ئەو و ئەوەی کە دەیخەنەڕوو، یەك بگرن و حاڵەتەکانی پەشۆکان یان هێرشکارانەی ناوخۆیی تەحەممووڵ بکەن.

ـــ ئایدۆلۆلۆژیا دەبێتە شوێنی پەیدابوونی بەها نوێیەکان. بەم شێوەیە ئەم بەها نوێیانە کە زیاتر بلاوبۆوە بەڵام لەڕەوشێکی شاراوە و نوستوودا بەسەر دەبەن، سەرەنجام لە فۆڕمی پلانێکی شیاوی ئاراستەکردن دەردەکەون. جاری وایە ئەوەی کە لەژێر ناوی بەها تازەدەرکەوتوو یان نوێیەکان ناویان دەبەین، لەڕاستیدا هەمان بەها کۆن یان بەهاکانی ئێستان کە ئایدۆلۆژیا لە شکڵێکی نوێدا پێناسەیان دەکاتەوە و یان ئەوەی کە واتایەکی تایبەت بەم بەهایانە دەبەخشێ کە پێشتریش بە شێوەی ئاماژەگەرانە بوونی هەبووە.

## پۆلێن بەندیی ئایدۆلۆژیا

بە پێی چوار پێوەر دەتوانرێ چەند جۆرێك لە ئایدۆلۆژیا دیاری بکرێن. ئەم چوار پێوەرە بریتین لە:

١ـ گرووپێك کە ئایدۆلۆژیاکە سەر بەو گرووپەیە ( گرووپی هەڵگری ئایدۆلۆژیا )

٢ـ پەیوەندیی نێوان ئایدۆلۆژیا و دەسەڵات.

٣ـ شێوازی کاری ئایدۆلۆژییەکان.

٤ـ ناوەرۆکی ئایدۆلۆژییەکان.

**١ـ ئایدۆلۆژیا لەوانەیە پەیوەندیی بە چینێکی کۆمەڵایەتی، گرووپێکی کۆمەڵایەتی، پیشەیەك ( ئایدۆلۆژیای سەندیکایی، کرێکاری و ...) هەبێ.**

ــــ ئایدۆلۆژیا لەوانەیە هەست و حەزەکانی کۆمەڵگەیەکی گشتی دەربڕێت وەك ناسیۆنالیزم.

ــ ئایدۆلۆژیا لەوانەیە پەیوەندیی بە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی یان بان نەتەوەیی هەبێ وەك کۆمۆنیزم یان سۆسیالیزم.

**٢ـ لە پەیوەندیی لەگەڵ دەسەڵات، دەتوانرێ ئایدۆلۆژیا بۆ سێ دەستە دابەش بکرێت:**

ــ ئایدۆلۆژیای چینی باڵادەست.

ــ ئایدۆلۆژیای گرووپێك کە دژبەری دەسەڵاتی باڵادەستە و بەنیازە خۆی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت. ( حیزبی سیاسی کەمینە یان حیزبی سیاسی دژبەر)

ــ ئایدۆلۆژیای گرووپەکانی گوشار کە هەوڵ دەدەن کاریگەری لەسەر دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دابنێن، بەبێ ئەوەی کە زەوتی بکەن.

**٣ـ بە پێی شێوازی کار، دەتوانرێ ئایدۆلۆژیا بۆ دوو جۆری خوارەوە دابەش بکرێت:**

ــ ڕیفۆرمخواز کە بە پەنابردن بۆ کردەوە و بەرنامەی ئارام و لەسەرەخۆ دۆخی ئارایی بگۆڕێت.

ــ شۆڕشگێڕ کە بە پەنابردن بۆ کردەوەی توندوتیژ وەك ڕاپەڕین، شۆڕش و لەنێوبردنی پێکهاتەی کۆن، ڕەوشی مەوجوود بگۆڕێت.

**٤ـ لە باری ناوەڕۆکەوە دەکرێ ئایدۆلۆژیا بەم جۆرانەی خوارەوە دابەش بکرێت:**

ــ بە کۆنەپەرست ناو دەبرێ ئەگەر ئەو ڕێگەچارانەی پێشنیاریان دەکات، گەڕانەوە بەرەو دواوەیان تێدا بەرچاو بکەوێت، بە دەربڕینێکی دیکە ئەگەر پێویستیی ڕەوتێکی ڕوو لە دابەزین و گەڕاوە بەرەو دواوەی تێدا ببینرێت.

ــ ئایدۆلۆژیا ئەگەر تەنیا هەوڵ بۆ پاراستنی دۆخی ئارایی بدات، بە کۆنەپارێز دەناسرێت.

ــ پێشکەوتنخواز یان لیبراڵی پێدەگوترێ ئەگەر لە بەرژەوەندی گۆڕانکارییە پێویستەکان هەندێك لە نەریتەکان وەلا بنێت.

ــ بە ڕادیکاڵ دەناسرێت ئەگەر ئامانجی پچڕاندنی پەیوەندیی لەگەڵ دۆخی ئارایی بێت.

ــ ئایدۆلۆژیای چەپ ( چەپگەرا) کە زیاتر مەیلی مارکسیستی، سۆسیالیستی یان جاری وایە تەنیا دێموکراتیك لەخۆ دەگرێ.
ــ ئایدۆلۆژیای ڕاست ( ڕاستگەرا) کە حەزی نەریتخوازیی توند، کۆنەپارێزی یان کۆنەپەرستانەی توند لەخۆ دەگرێت.
دوو زاراوەی چەت و ڕاست لەگەڵ ئەوەی کە زۆر گرینگن، دابەشکاریی دیکەشیان لە هەناوی خۆیاندا جێکردۆتەوە وەك چەپی توندڕەۆ، چەپی میانەڕەۆ، میانەی دەستەڕاستی و ...کە هەتا ڕاستی توندڕەۆ درێژە دەکێشێت.

## گۆڕانکاریی لە وڵاتانی لەحاڵی گواستنەوەدا ( لە کۆمەڵگەی نەریتی سادە بۆ کۆمەڵگەی ئاڵۆز)

ئاهەنگی نوێکردنەوە و گەشە لە هەموو وڵاتاندا بە شێوەیەك و وەك یەك نییە. کۆمەڵگەکانی لە حاڵی گەشە کە دەتوانرێ بە کۆمەڵگەی لەحاڵی گواستنەوەدا ناو بنرێن، ئەو کۆمەڵگەیانەن کە زیاتر لەژێر کاریگەریی پرۆسەی بەپیشەسازیبوون و پێکدادانە قەومی و کولتوورییەکان کە بەرەبەرە لە ناوەوەیاندا لەرێگەدان، تووشی بێسەرەوبەرەیی و گۆرانکاریی دەبن و لە هەندێك لە بوارەکاندا لەگەل ڕەوشی نوێ دەگونجێن و خۆراگری لە بەرامبەر نوێسازیشدا جیاوازە. لە خوارەوە گۆڕانکارییەکان کە زیاتر لە سێ بەشی کۆمەڵگەکانی لە حاڵی گەشەدا جێبەجێ دەبێت و گۆڕانکارییە ئابووری، کۆمەلایەتی و کولتووری و دەروونی لەخۆ دەگرێت، بە کورتی تاوتوێ دەکەین:

### ئا ـ گۆڕانکارییە ئابوورییەکان

١ـ لە بنەڕەتدا گەشەسەندن لەسەر بنەمای ئەم کارە ڕاوەستاوە کە ئابووری گوزەران کە لەسەر بنەمای ڕاندمان ( دەرەنجامی کار)ی لاواز کە تەنیا وەلامدەری پێداویستییە سەرەتایی وسەرەکییەکانی ژیانە، ببێتە ئابوورییەکی زیندوو لەسەر بنەمای بەرهەمهێنانی پیشەسازی و بەم پێیە گەشەسەندن لە هەنگاوی یەکەمدا پرۆسەی بەپیشەسازیبونە.
٢ـ بەپیشەسازیبون پێویستیی بە جێگۆڕکێی سەرمایەوە هەیە. بەم شێوەیە کە سەرمایە کۆکراوەکان لە بەشی خاوەندارێتیی زەوی یان بەشە کانی تری غەیری وەبەرهێنان ( وەك ئەو خەرجییە زۆرانەی بۆ جەژنەکان، بۆنە قەومییەکان و ... دەکرێت) دەبێ بەرەبەرە لە بواری

کەلوپەلـەکانی تـەکنۆلۆژیای پێویسـت، بەرهـەمهێنانی پیشـەیی، گواسـتنەوە، پەیوەندییـە گشتییەکان، بازرگانی و خزمەتگوزاریدا بخرێتە گەڕ.

٣ـ بەهۆی کـەمبوونی سـەرمایە لەزۆربـەی بابەتـەکان، گەشەسـەندن لـەو وڵاتانـەی کـە پێویستی بە هاتنەناوەوەی سەرمایەی دەرەکی بێت، ڕێگە بۆ جێگیربوونی جـۆرە جیاوازەکـانی داگیرکاری ( ئابووری، سیاسی و کولتووری) خۆش دەکات.

٤ـ بەپیشەسازیبوون پێویستیی بە جێگۆڕینی هێزی کارە. لە وڵاتـانی غـەیرە پیشەسـازی لەبـەر ئەوەی بەشێکی بەرچاو لە هێـزی کـاری ( لـە سـەدا ٧٠ یـان ٨٠) لـە بەشـی وەرزێـری و چـالاکییە سەرەتاییەکانی دیکە بەکار دەهێنرێت، بەم پێیـە دەبـێ بەشـێکی زۆر لـەم هێـزی کـارە جێگـۆڕکێی پێبکرێت و لە بەشەکانی تایبەت بـە چـالاکییەکانی بەشـی دووەم ( پیشەسـازی) و بەشـی سـێهەم ( بازرگانی و خزمەتگوزاری و پەیوەندییەکان) بەکار بهێنرێت و لـەم پێناوەشـدا یـەکێك لـە کێشـەکانی پیشەسازیبوونی وەها وڵاتانێك فێرکردن و ئامادەکردنی هێزی کاری پسپۆرە.

٥ـ لە وڵاتانی لەحاڵی گەشەدا بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەکە بە خێرایی بەشی پیشەسازی لە کۆچبەرە دێهاتییەکان پڕ دەبێت و بەشی خزمەتگوزارییە پسپۆرییەکانیش پێویستی بە هێزی کاری ناپسپۆر نییە، بە ناچار حەشیمەتێکی زۆر لەم هێزی کارە بـەرەو بەشـی خزمەتگوزارییـە ناپسـپۆرییەکان دەچـێت و دیاردەی بێکاری کە ئەمڕۆکە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانەیە، دێتە کایەوە.

## ب ـ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان

١ـ پەرەسەندنی شارنشینی یەکێك لە دەرەنجامە خێراکانی بەپیشەسازی بوونە. بێجگە لـە گەشەسەندنی ئەو شارانەی کە هەن، شاری نوێش لە دەوروبەری کانگاکان و لە قەراخ ڕێگەکانی پەیوەندی دروست دەکرێن و بێجگە لەمانەش ناوچەی هەژارنشین یان کەوێڵ نشین ( زاخەنشین) لە قەراغ شارەکان پەرە دەستێنن.

٢ـ بزاوتی جوگرافیایی و پاڵنەرەکانی: ئەو پاڵنەرانەی کە بەهۆیانـەوە، حەشـیمەتی گونـدەکان ڕوو لە شارەکان دەکەن و لەوێ نیشتەجێ دەبـن، فرەچەشـنن و بـە شـێوەیەکی گشـتی دەتـوانرێ بـە دوو دەستەی ئەرێنی ( هێزی ڕاکێشان ) و نەرێنی ( هۆکارەکانی پاڵنان ) پۆلێن بەندی بکرێن.

لەنێو پاڵنەرە ئەرێنییەکاندا دەتوانین ئاماژە بە هیواداربوون بە دەوڵەمەندبوون، دۆزینەوەی پیشەیەکی باشتر، چوونەسەری کۆمەڵایـەتیی منـاڵان و ئەندامـەکانی خێـزان بکـەین. لـەنێو هۆکارە پاڵ پێوەنەرەکانیش دەتوانرێ هۆکارگەلێکی وەك ڕاکردن لە سنووردارێتیی کۆمەڵگـەی

نەریتی و کێشەکانی، تێکەڵپێکەڵی ئابووریی نەریتی دوابەدوای بەپیشەسازیبوونی کۆمەڵگە و لەناوچوونی هەندێك لە پیشە دەستییەکان، هەژاریی لەڕادەبەدەری لە گوندەکان و هەڵوەشانەوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای ڕێوشوێنەکانی ئاغا و ڕەعیەتی یان فیۆداڵی باسیان بکرێ. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێ بگوترێ کە شارنشینی بە هۆکارگەلی جۆراوجۆر ڕەوتێکی بەهێز لە جووڵەی جوگرافیایی لە شار بۆ گوند پێك دێنێت.

٣ـ گۆڕانکاری لە خێزاندا: لە کۆمەڵگەی نەریتیدا جۆری خێزانی باڵادەست زیاتر خێزانی فراوان بووە کە لانیکەم سێ وەچە لەخۆ دەگرێت. گەشە و پەرەسەندنی شارنشینی دەبێتە هۆی لێك هەڵوەشانی خێزانی فراوان و گۆڕانی بۆ خێزانی ناوکی ( پێکهاتوو لە دایك و باوك و ئەو منداڵانەی هاوسەرگیرییان نەکردووە). کۆچکردن لە گوندەکان لە هۆکارە گرینگەکانی گۆڕان لە پێکهاتەی خێزانی بەربڵاو دێتە ئەژمار. "بزاوتی کۆمەڵایەتی"یش بۆتە هۆی دوورکەوتنەوە یان لەناوچوونی پەیوەندیی نێوان خوشك و براکان و پەروەردەش لەناو ئەندامانی خێزانە فراوانەکاندا ناکۆکی دروست کردووە و لە ئاکامدا بەرەبەرە بواری لێك هەڵوەشانی ئەوانی خۆش کردووە.

٤ـ گۆڕانکاری لە توێژبەندیی کۆمەڵایەتی: ژینگەی شار و پێکهاتە نوێیەکانی پیشەکان لە کۆمەڵگەی پیشەسازی بۆتە هۆی دەرکەوتنی توێژە نوێیەکان لەناو کۆمەڵگەدا و بە دەربڕینێکی دیکە بە دابەشکاری و جیاوازییەکانی کۆمەڵگەی نەریتی لەسەر بنەمای سیستەمی عەشیرەتی، خزمایەتی و ناوچەیی، دابەشکاریی و جیاوازییەکانی لەسەر بنەمای چینە کۆمەڵایەتییەکان، گرووپە کۆمەڵایەتییەکان، هیرارکییەتی کۆمەڵایەتی و هەروەها پرستیژی پیشەیی و یان پێگەی ئیداری زیاد بکرێ. لە ژینگەی شاری، لە پەیوەندیی لەگەڵ داهات، ئاستی خوێندەواری و باڵادەستیی شێوازی ئاڵۆز لە توێژبەندیی کۆمەڵایەتی دێنە ئاراوە کە هەم فاکتەرگەلێك لە کۆمەڵگەی نەریتی دەگرێتەخۆ و هەم فاکتەرگەلێك لە کۆمەڵگەی پیشەسازی لە حاڵی گووران و بەم شێوەیە پێگەی نوێ بە دەرکەوتنی پیشە و کاری ئەوتۆ کە تا ئێستا نەناسراوبوون، پێك دێن.

٥ـ دەرکەوتنی بژاردە و ئێلیتە نوێیەکان. بژاردە نوێیەکان دوابەدوای گەشەسەندنی پەروەردە و خوێندنی باڵا، لە دامەزراوەکان، ئەنجوومەنە دڵخوازەکان وەك سەندیکاکانی حیزبە سیاسییەکان و هەروەها لە دەوڵەت یان پیشەسازیدا وەك بەڕێوەبەران، تەکنۆکراتەکان و پیاوانی دەوڵەت دەردەکەون و بەم شێوەیە لەنێوان ئەم بژاردانە و بژاردە نەریتییە کۆنەکان پەیوەندیی ئاڵۆز و زۆربەی کاتەکان پڕ لە کێشە دێتە ئاراوە چونکە لەڕاستیدا بژاردە نوێیەکان، پلان و نموونەی نوێ لە ژیان، ئایدۆلۆژیا و بەهاکان دەخەڕوو و پێشانیان دەدەن کە لە ڕوانگەی بژاردە نەریتییەکانەوە بۆ کۆمەڵگە مەترسیدارن

بەڵام جاری وایە لەوانەیە بژاردە کۆن و نوێیەکان بە شێوەی کاتی بە دژی دوژمنی هاوبەش و خەبات بە دژی بێگانەکان و داگیرکەران یەك بگرن.

٦ـ گۆڕانکاریی لە شێوەی بۆچوون و بیرکردنەوە. پیشەسازیبوون و بەدوای ئەویشدا گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بەبێ دەرکەوتنی جیهانبینی نوێ کە گۆڕانێکی قووڵ لە شێوازی بیرکردنەوە و ڕووحییەی تاکەکاندا پێك بێنێ، مەیسەر نابێت و ئەم گۆڕانکارییە بە یارمەتی فێرکردن دێتەدی. فێرکردن لەم کۆمەڵگەیانەدا دەبێتە هۆی پێکهاتنی شێوازی نوێ لە بیرکردنەوە و بەربڵاوتربوونی ڕوانگەکان و تێگەیشتنی مرۆڤ لە جیهان. بە دەربڕینێکی دیکە بەرەبەرە بیرکردنەوەی عەقڵانی لە جێگەی بیرکردنەوەی ئوستوورەیی دادەنێت.

# ژێدەر و سەرچاوەکانی بەشی چواردەیەم

١ـ تی بی باتومور، جامعەشناسی، ترجمە سید حسن منصور، سید حسن کلجاهی، انتشارات جیبی، ١٣٥٥.

٢ـ حمید حمید، علم تحولات جامعە، انتشارات سیمرغ، .١٣٥٢

٣ـ لیوئیس کوزر، زندگی و اندیشە بزرگان جامعەشناسی، ترجمە محسن پلاپی، انتشارات علمی،.١٣٦٨

٤ـ محمد علی فروغی، سیر حکمت در اروپا.

٥ـ گی روشە، تغییرات اجتماعی، ترجمە منصور وپوقی، انتشارات نی، .١٣٦٦

٦ـ ریمون أرون، مراحل اساسی سیر اندیشە در جامعەشناسی، جلد اول، ترجمە باقر پرهام، انتشارات جیبی ١٣٥٢.

٧ـ ساموئل کنیك، جامعەشناسی، ترجمە مشفق همدانی.

٨ـ عبدالرحمن ابن خلدون، "مقدمە" ترجمە محمد پروین گنابادی.

(clan): جۆرە خزمایەتییەکە کە لەسەر بنەمای هاوخوێنی نییە و تاکەکانی گرووپ، خۆیان بە منالآنی هاوبەش دەزانن. هێمای کلان زۆربەی کاتەکان ئاژەڵ، هەندێکجار گیا و بە دەگمەنیش شتێکە کە تۆتەم (totem)ی پێدەڵێن.

## INTRODUCTION SOCIOLOGY

## MANSOOR- VOSOOGHI
## ALIAKBAR.NIK- KHOLGH

## T: SIRWAN MOHAMAD HAJI